**پارتیزانەکانی دوای ئەنفال**

---

* **بابەت : سەروەری**

* **نووسەر : ابووبکرمحمدحاجی(مەلاشاخی)**

* **بەرگی یەکەم**

* **چاپی یەکەم** 2020

* **تایپ** şaxî

* **دیزاین** şaxî

* **تیراژ** ( 1000 ) **دانە**

* **چاپخانە : چوارچرا**

* **مافی چاپکردنەوەی پارێزراوە بۆ نووسەر وخانەوادەی**

* **ئیدارەی گشتی ( ی.ن.ک ) یارمەتی چاپکردنی داوە**

**لەبەریوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان**

**ژمارەی سپاردنی ( 1800 ) ی ساڵی 2020ی پێدراوە.**

---

**نرخی هەردوو بەرگ 15 000 دینار**

**پێشکەشە بە :**

- شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان
- پارتیزانەکانی دوای ئەنفال
- کەس و کار و خانەوادەی شەهیدان
- پێشمەرگە و گەریلا و شەڕڤان
- تێکۆشەران ودڵسۆزانی کوردایەتی
- هاوکارانی پارتیزانەکان.



**وێنەی نووسەر**

**لەسەردەمی پارتیزانی**

# دەسپێك

جەنگی پارتیزانی جۆرێکە لە شەڕ لەنێوان هێزێکی پۆشتەو نزامی وچەند گروپ و دەستەی چەکداری خاوەن بیر و باوەڕ و دیسپلین، یەکەم دەستەی چەکداری لەو شێوەیە لەسەردەمی نابلیۆن، لەلایەن ئەسپانەکان پێکهاتووە،کەواتە ئەم شێوازە جیاوازە لەگەڵ شەڕی ئەهلی وبەرگری میللی وراپەڕین وهەڵگەڕانەوە ویاخی بوون.

ئەگەر بەرلەپرۆسەکانی ئەنفال، لەزۆربەی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کوردستاندا شەڕ لەنێوان هێزی سوپا و بەکرێگیراوەکانی ڕژێم لەلایەك و هێزی پێشمەرگە و هێزی پشتگیری و بەرگری میللی ڕووی دەدا،ئەوشێوازە کلاسیکی یە جۆرێکی باوبوو لەشێوازی شەڕی ئەوسەردەمە،بەڵام بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی وکاولکردنی هەموناوچەئازادکراوەکان،بارودۆخەکە شێوازێکی تری سەپاند،کە قۆناغی شەڕی پارتیزانی بوو،لە شەڕی پارتیزانی دا،شۆڕش ناچاربوو پشت ببەستێ بەئەزموونی پێشمەرگە وخەباتی گەلان، وانە لەئەزموونی (گیڤارا) و(ماوتسیتۆنگ..)وەربگرێ، هەربۆیە ئەوحزب و لایەنەی شۆڕشی نوێ، کەباگراوندی رابردوویان لەوبارەیەوە لەئاستی پێویستدا نەبوو،نەیانتوانی وەك هاوڕێیانی ڕێکخستنەکانی(کۆمەڵە)و شۆڕشگێڕانی(یەکێتی نیشتمانی کوردستان)و هاوڕێیانی (حزبی شیوعی عێراق) ئەرکی ئەو قۆناغە بگرنە ئەستۆ، ئەگەر وەك نموونە شەڕی پارتیزانی چینییەکان و سۆڤیەتییەکان ویابان وجەزائیرییەکان و ڤێتنامییەکان وچەندشوێنی تر.وەربگرین.

شێوازی بەرگری ئەوان و بارودۆخەی کوردستانی باشووری دوای ئەنفال،لە هیچ ڕوویەکەوە هاوشێوە نین،هەربۆیە سەردەمی نوێش پێویستیی بەئامادەسازی و پرەنسیپ و شیوازێکی نوێ هەبوو،هەقە، لەبەهاری 1988 تا بەهاری 1991 پارتیزانەکانی کوردستان جۆرێکی نوێ وجیاواز لە خەبات و بەرگرییان پێرەوکرد.

گەر هێزی پێشمەرگە پێشتر لەشێوازی خەباتدا ستراتیژ و تاکتیکی خۆی هەبوو،

بەلام بۆشەڕی پارتیزانی پێویستی بە بەرنامەیەکی تۆکمەتر هەبوو،بارەگاکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە(قاسمەڕەش) و(زەڵێ)و (راژان). بەرنامەو ژووری ئۆپراسیۆنی تایبەت وبنکەی مەشق وراهێنانیان پێکهێنابوو.ئەو جۆرە کەسانەیان بۆپارتیزانی هەڵدەبژارد،کە نمونەی ئازایەتی وگیانبەخشین بوون.چونکە دەیانزانی جەنگی پارتیزانی،شەڕی چەند دەستەیەکی بچووک بچووك نییە، بەڵکو جەنگی پارتیزانی شەڕێکە گەورەترین چەك بۆبەرەنگاری کە هەیەتی پشتیوانی خەڵکە، گەرچی رژێم کوردستانی وێران کردبوو،خەڵکە شۆڕشگێڕەکەی بۆئۆردوگاکان راگواست بوو.بەلام هێشتا پارتیزانەکان هەر پێشمەرگەی کۆمەلانی خەڵك بوون، ئەنجامیش هەر ئەو راستییەی سەلماندەوە هەر رەتڵێکی پارتیزانی، چەند بەجوولە وچالاك و شارەزای بێشە و چەم و لێرەوار و دەشت و شاخەکانی کوردستان بوایە. نەیدەتوانی بەبێ هاوکاری رێکخستن وخەڵك،بەرانبەر بەهێزێکی دڕندەی گەورە و پۆشتە وپەرداخ و پڕچەك بە تەکنەلۆژیای سەربازی نوێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ. هەرچەند پارتبزانەکان پێویستیان بە کۆمەلانی خەڵك بووبێت، مانای ئەوە نییە کە پێویستییان بە خۆڕاگری و دسپلین و بەرنامە ڕێژی وردو وریایی نەبووبێت، پارتیزانەکان لەکاتی کێومالْ وگەڕانی هێزەکانی دوژمندا، تەنیاوتەنیا هەرخەمی گیانی تاك بەتاکی دەستەکەی خۆیان نەبووە، بەڵکوئامانجیان بەردەوامی خەبات و کۆڵنەدان بووە. پارتیزانەکان پێیان وابووە بچووکترین هەڵەی پارتیزانێك،دەشێ ببێتەهۆی ئاشکرابوون وخۆی و هاوڕێکانی بخاتە مەترسییەوە،هەربۆیە هەمیشە فەرماندە وبەرپرسی یەکەمیان رێنمایی جۆنیەتی هەڵسوورانیانی دەکرد.. سەردەمی پێشمەرگایەتی پێشتریش پێویستی بەدسپلین ونهێنی پارێزی هەبووە، ئەوساش دەبوو پێشمەرگە گوێڕایەڵی فەرماندەکانی بوایە،بەلام لەسەردەمی پارتیزانیدا دەبوو توندو تۆلْ تربکرێت.خۆپارستن وهوشیاری وجێگۆڕکێی ژیرانە

لەسەروەرییەکانی پارتیزانەکان بوو،ئەوان باش ئەوراستییەیان دەزانی کەپارتیزان دەبێت پێشمەرگەیەکی خۆراگر و هۆشیار و تەندروست و چاپووک بێت.بەرۆژەوە لەحەشارگەو بنکەکانیاندا بە گیانی بەرخۆدان و پشوو درێژی پەروەردە بکەن، بەشەوانیش ئەگەر پێویستی بکردایە دەبوو بەپێی شارەزایی لە رێگاو بان وجێ و رێی دوژمنان،بۆ گەیاندنی پەیامی شۆڕشگێرانەی خۆیان دزەیان بکردایە بەرەو شوێنە دیاریکراوەکانی نێوان خۆیان وهاوکارەکانیان. دیارە مرۆڤ لە هەلومەرجی ئاوادا نابێت بێ بەرنامە بێت.پارتیزانەکانی کوردستانیش وەك پارتیزانەکانی گەلانی جیهان تاکتیکی خۆیان هەبوو، وەك (لێدەودەربازبە.) ئامانجیان لەشەڕی پارتیزانی شکستی یەکجاری هێزەکانی بەرانەرنەبوو،بەڵکوتاکتیکی لێدەوڕاکەبوو. (ماوتسیتۆنگ) بەپارتیزانە چینیەکانی دەگوت:(پارتیزانی کارامەئەوەیە شارەزای باشی لە هەلاتن هەبێت) هەربۆیە پارتیزانەکان جاری وا هەبوو، دوای چالاکییەك سەدان کیلۆمەتر دوور دەکەوتنەوە، پێم وایە ئەوتاکتیکانەی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال پێڕەویان کردووە ئەگەر هەمووی بەجوانی بنووسرێنەوە، بۆداهاتووی بەشەکانی تری وڵات سوودی باشیان دەبێت.کەواتە تاکتیکی پارتیزانەکان لەپێناو چەندین ئامانجی رووندا بووە .هەلومەرجی ئەوێ رۆژێ هەندێك گۆڕانکاری بەسەر ستراتیژەکانداهێنابوو،کەئەم خالانەی لای خوارەوە بۆپارتیزانەکان پێویست بوون:

1 . رێکخستنێکی خاوەن بیروباوەڕی بتەویان هەبێت.

2 . خۆیان لەرووبەڕووبوونەوەی سەربازی بپارێزن.

3 . درێژە بەخەباتی سیاسی بدەن.

4 . بۆخەڵکی بسەلمێنن کە ئاشبەتاڵ ناکەن.

5 . پاڵپشتی جەماوەر لەدەست نەدەن.

6 . هەوڵی بەدەستهێنانەوەی پشتیوانی نێودەوڵەتی بدەن ..

دیارەپارتیزانەکانی کوردستانیش راچاوی هەمووتاکتیك وئامانجەکانیان دەکرد، بۆنموونە شەوان چالاکییان ئەنجام دەداو بەرە بەیان دەگەڕانەوە حەشارگەکانیان. هەندێ جاریش پاشەکشەیان دەکرد..مەرج نەبوو بڕۆن بۆ ناوچەیەکی دوور لە شوێنی چالاکییەکەیان،بەڵکو نێزیك ترین شوێنی بێ شکیان لەپاڵ سەربازگەو مۆڵگەکانی سوپای دوژمن دیاری دەکرد و بۆماوەیەکی کورت بە نهێنی دەمانەوە. لەولاشەوە دوژمن ناوچەگومناویەکانی کێومالْ دەکرد،و بەنائومێدی دەگەڕایەوە. هۆی سەرەکی سەرکەوتنی پارتیزانەکانی دوای ئەنفال جگە لە قارەمانییەتی. شارەزایی باشیان بوو لەبست بەبستی ناوچەکاندا، سەرچاوەی ئاو و کەلاوەی گوندەوێرانکراوەکان و رەزوباخی دێرینی جوتیارەکان و پرۆژەی پەلەوەر وشوێنی سەلامەتی پەرینەوەی رێگا سەرکییەکان تاد...هۆی ئەوەبوون کە دوژمن نەتوانێت تووشی نائومێدییان بکات، ئەگەر پارتیزانەکان خاوەندی پرەنسیپ وڕێکخستنی پۆلایەن نەبوونایە.؟ خاوەن سەدان تێکۆشەری گیانفیدا وخۆنەویست نەبوونایە.؟ ئەوهەلومەرجە دژوار و پرئەستەمە هەرگیز ناگەیی بەئامانج...ئەگەرچی هێزەکانی سوپا و فەوجەسووکەکان ودەستە تایبەتەکانی سەربەڕژێم، رێکخراو وپڕچەك و پۆشتە بوون و هەمووشتێکیان بۆ فەراهەم کرابوو، لەبەرانبەردا پارتیزانەکان تەنیاو تەنیا رێبازی حزبی شەهیدان و ئومێد بە پاشەرۆژیان شك دەبرد..

کەچی هەمیشەلە ژێرسایەی رێنمایی سەرکردایەتی خۆیان پرەنسیپی دووەمیان جێبەجێ دەکرد وخۆیان لە شەڕی بەرەیی نابەرانبەر ودرێژخایەن بەدوور دەگرت. خۆ بەدوور گرتن لە شەڕی بەرەیی و شەڕی ناوشار و ناودێ،کەپێشتر سێ جۆری شەڕی پێشمەرگانەبوون ،هەنگاوی بەرجەستە بوون بۆ گەیشتن بەپرەنسیپی سێیەم کەبریتی بوو لە خەباتی درێژخایەن بۆ بەدیهێنانی سەررخستنی خەباتی سیاسی. لەدوای هەرهەشت قۆناغەکەی ئەنفالەوە لەبازنەی هەرپرۆسەیەکدا دوای رووبەروو

بوونەوە وبەرگری وفیداکاری لەهەر سنوورە و چەند دەستەیەك توانییان دوای کشانەوەی هێزە سەرەکییەکانی شۆرش..جوامێرانەبەشێوەی پارتیزانی بمێننەوە. هەندێکیان بۆ چەند رۆژێك و هەندێك بۆ چەند مانگ و هەندێك بۆچەندسالٚ تا راپەرینی 1991 خۆیان راگرت. دەستەی وا هەبووە بەهۆی خیانەتی کەسێکەوە زیانی بەرکەوتووە، دەستەیش هەبووە،بەتەواوەتی کۆلیان داوەوەو چەکەکانی خۆیان حەشارداوە و بەسوود وەرگرتن لە بڕیارەکانی(لیٚ بووردنی گشتی)تەسلیم بوونەتەوە،بەلاٚم هیچ زیانێکیان بەپارتیزانەکانی تر نەگەیاندووە،دەستەش هەبووە بۆ ماوەیەك گەڕاونەتەوە سەرسنوور و دەستەیەکی تر شوێنەکەیانی گرتۆتەوە.. کۆمەلێك مەرج هەبوون بۆئەنجامدانی چالاکی و پەیوەندیکردنی پێشمەرگەی پارتیزان،لەوانە:وریایی وشارەزایی لەوناوچانەی چالاکییەکانی پارتیزانی تیادا ئەنجام دەدران، پێویست بوو سوود لەوشوێن و ناوچانە وەربگیرێت کەژیان و جوولەی مرۆیی کەم تیاداهەبوو.هەندیٚ جاریش پێویست بووپارتیزان بۆماوەیەك خۆی گۆشەگیر بکات و لەڕووی پەیوەندیکردن..یان کەم خواردن و نەبوونی هۆیەکانی هاتوچۆ وە خۆی رابێنیٚ.. ژمارەی ئەندامانی مەفرەزەی پێشمەرگەی پارتیزان دەبووایە کەم بووبایە. بۆ پاراستنی شوێنەکانیان. پەیوەندیکردن لای پارتیزانەشاراوەکان بەپێی هەلومەرج وباروذۆخ دەگۆڕا،لەکاتی ئاساییدا پرۆسەی پەیوەندیکرن کێشەیەکی وای دروست نەدەکرد،بەلاٚم لەکاتی شەڕو خۆشاردنەوەدا پێویست بوو پەیوەندییەکان شەوانەبێت،جێگای خۆشاردنەوەی پارتیزان شوێنێك بێت و خالٚی پەیوەندیکرنەکە شوێنێکیتر،هەروەها جێگای خۆ ئامادە کردنیش جیاوازبوو،مەرجەکانی پەیوەندیکردن زیاتر شێوازی ئاماژەیی و رەمزی بوون، پێویست بوولەلایەن پێشمەرگەی پارتیزانەوە رەچاو بکرابوونایە، بۆ نمونە دوای ئاگرکردنەوە پێویست بوو شوێنەوارەکەی نەمێنێت و دووکەلٚ بەرچاو نەکەوێت.

پەیوەندیکرن بەبەکارهێنانی ئامێری بێتەل زۆر بەکەمی ئەنجام دەدرا،چونکە دەکەوتە ژێرچاودێری دەزگاکانی رژێم بەهۆی ئامێری (رازێت) بۆیە لەکاتی زۆر درەنگانی شەو یان پەیوەندییەکە زۆر لە شوێنی خۆ حەشاردانە کەیانەوە دووربوو، بۆ گواستنەوە وهاتووچۆ هەندێك جار ولاغ بەکاردەهات. گرینگ ئەوەبوو پارتیزانەکانی کوردستان بەباشی ئەو خالانەیان پێرەو دەکرد،بۆیە توانییان قۆناغی بەرگری بگۆڕن بۆ قۆناغی راپەڕین.

ئەوەی لە سێ سالی سەختدا پارتیزانەکانی کوردستان ئەنجامیان دا..لەشێوەی هیچ خەباتێکی تری پارتیزانی گەلاندا نەبوو.هەربۆیە پشتیوانی رێکخستنی شارو جەماوەریان لەدەست نەدا،تۆماری بیرەوەری ویاداشتی پارتیزانەکان باشترین گەواهی لەسەرئەوە دەدەن کە(هاوکار)ی پارتیزانەکان لە گەرمیان وپیرەمەگرون و شارباژێرو بتوێن وکۆیە وشوان وشێخ بزێنی وهەولێر وبالەکایەتی و سۆران و بادینان.. پالپشت بوون بۆ بەخەبات و ئاشبەتال نەکردن..

لەماوەی نێوان شوباتی 1988 تا ئازاری 1991ئەو پارتیزانانەی مابوونەوە، بەلگەی مانەوەی شۆڕشی نوێ و نەبەزین و کۆلنەدان و بازنەی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی ورێکخستنە نهێنی یەکانی ناوشارەکان وجەماوەربوون،پشتیوانی مەعنەوی راپەڕینی جەماوەر و سەرکەوتنی بوون.

مەلاشاخی

2020



# گیڤارا

## چۆن پێناسەی پارتیزانی کردووە..؟

پارتیزان بەرزترین نمونەی هەڵسوراوێکی ئازادیخواز، هەلبژێردراو،شۆرشگێر و پێشرەوی خەلکە لە خەباتەکەیاندا بۆ رزگاری. شەری پارتیزانی، بەپێچەوانەی ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی وێنای بۆ دەکرێ شەر لە ئاستێکی سنوردار، واتە شەڕی کەمینەیەك بەدژی سوپایەکی بەهێز نیە.

نا..! شەری پارتیزانی، شەرێکە کە لەلایەن هەموو جەماوەرەوە بە دژی زوڵم و زۆری حاکمان دەکرێ. بزوتنەوەی پارتیزانی باڵی چەکداری خەڵکە. سوپای پارتیزانی هەموو خەلك لە ناوچەیەك یان وڵاتێك لەخۆ دەگرێ، وە ئەوە هۆکاری سەرکەوتنی کۆتایەتی لە بەرامبەر بە هەر هێزێك کە بیەوێ لەناوی بەرێ...

واتە ڕەگ و سەرچاوەی بزوتنەوەی پارتیزانی، جەماوەرە.

پێوابوونی ئەوەی کە گروپێکی چەکداری بچوك، هەرچەند چالاك و شارەزای ناوچەکە بێ، بە بێ یارمەتی جەماوەر دەتوانێ لەبەرامبەر بە جەولەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراوی سوپایەکی بەهێز دا خۆراگربێ، هەڵەیە. سەلماندەکەش ئەوەیە،تەواوی

چەتە و دزەکانی سەر کێوەکان لە کۆتاییدا بە دەوڵەتی ناوەندی دەدۆرێنن، وە دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ کە ئەو دزانە لە لای خەڵکی ناوچەیەك بە شیوەیەکی گشتی لە کۆمەلێك دز و چەتە سەرترن، کردەوەی ئەوان وەك بزوتنەوەیەکی رزگاری خواز چاولێدەکرێ، لەگەڵ ئەوەی کە ئەم لێك چونە تەنها رواڵەتیە. هەرکامە لە ئەندامانی هێزێکی پارتیزانی،واتە ئەندامانی سوپای برومەندی جەماوەر، دەبێ هەموو باشیەکانی باشترین سەربازەکانیان هەبێ،سوپای جەماوەر دەبێ دیسیپلینێکی زۆر بەهێز پەیرەو بکا.

ئەوەی کە یاساگەلی ژیانی چەکداری سونەتی هیچ شێوە لێکچوونێکیان لەگەڵ ژیانی پارتیزانی دا نیە، وە ئەوەی کە"پشووبە و وریابە" و رێزدانانی سەربازی و خۆگەوزاندن لە خۆلدا لەبەرمابەر بە فەرماندەکان دا بەهیچ شێوەیەك بوونی نیە، ئەوە بەو مانایە نیە کە دیسیپلینیش بوونی نیە. دیسیپلینی پارتیزان لە دەرونی تاکی ئەودا، لە باوەری دا و لە کاتی پێویست دا لە سەروی خۆیەوەیە (مافوق)، وە ئەوە تەنها بۆ ئەوە نیە کە کاریگەری هێزە چەکداریەکە کە بۆخۆشی بەشێکە لەو وەك خۆی بمێنێتەوە، بەڵکو بۆ پاراستنی گیانی خۆشیەتی.لە سوپایەکی ئاسایی دا، بچوکترین هەڵەی سەرباز، لەلایەن نزیکترین هاوکاریەوە لەژێر چاوەدێری دایە، لەشەڕی پارتیزانی دا،کە تێیدا هەر سەربازێك،خۆی هێزێکی رەزمەندەیە، رووداني هەر هەڵەیەك چارەنوس دیاری دەکا،هیچ کەسێك ناتوانێ کەمتەر خەم بێ، هیچ کەسێك ناتوانی بچوکترین هەڵە بکا،چون ژیانی خۆی وهاورێکانی لەمەترسی دایە. ئەم دیسیپلینە راستەقینەیە بەگشتی بەرچاو ناکەوێ.لە ڕوانگەی کەسێکەوە کە بێئاگا بێ، سەربازێکی سادە، بە بوونی تەواوی یاساگەلی رێزدانانی سەربازی بۆ سەروتر لە خۆی، لە پارتیزانێك کە فەرمانەکان لە فەرماندەکەیەوە بە سادەی ورێزی وشیارانەوە جێ بەجێ دەکا،بە دیسیپلینترە. وەهەروەها سوپای ڕزگاریدەر،

هێزێکی گولْ بژێرکراوە کە لەوێدا جیْ بۆ بچوکترین کەموکوڕی ئینسانی نیە. وەها سوپایەك، هیچ جۆرە ئامرازێکی فەلاقەیان سیخوری نیە کە ببێتە بەربەستی قوربانی بوونی تاکەکان لەبەرمابەر بە هەوا و هەوەسیان. بۆچوونی (وشیارانە)ی خۆمانە،وشیاری قولْ بەرامبەر بەئەرك ودیسیپلین، هێزی بەریوەبەری "پارتیزان"ە. پارتیزانێك لەگەلْ ئەوەی سەربازێکی بەدیسیپلینە، دەبیْ لە رووی مێشك و جەستەشەوە چالاك بیْ. شەری پارتیزانی سست ناتوانیْ بوونی هەبیْ. شەو، کاتی جەولە و کارزارە. پارتیزان بەهۆی ئەوەی کە شارەزای ناوچەکەیە، بەشەو دەجولیْ، سەنگەر دیاری دەکا،زەبر لەدوژمن دەوەشێنیْ و پاشەکشە دەکا.ئەوە بەومانایە نیە کەدەبیْ لەو ناوچەیەی کە جەولەکەی تێدادەکا زۆر دوور پکشێتەوە،تەنها مەبەست ئەوەیە کە پاشەکشەکە خێرا بکریْ. دوژمن زۆر زوو هەموو هێزە داپلۆسێنەرەکانی لە ناوچەی زەبر لێدراو بلاّو دەکاتەوە، دوژمن بۆمبارانی هەوای دەست پێدەکا، دوژمن هێزە تایبەتیەکانی خۆی دەخاتە کار بۆ ئەوەی ناوچەکە گەمارۆ بدا و بۆفریودان هەندێك سەنگەر دیاری دەکا و سەربازی بۆ دەنێریْ.پارتیزانەکان دەبیْ تەنیا لەسەنگەرێك دا بەرامبەربەدوژمن بووەستن. بە پاشەکشە بۆ مەودایەکی نزیك، بەدانانی کەمین بۆ دوژمن،بە هێرش کردن و پاشەکشەی سنوردار، پارتیزانەکان بە مەبەستی خۆیان ،ماندوو کردنی دوژمن لەچەند سەعاتدا، یان چەند رۆژ دا دەگەن. سەربازانی خەلکی بەشمەینەت لە حەشارگەکەی خۆیانەوە و لەکاتێکی باش دا هێرشەکانیان دەست پێدەکەنەوە. لە شەری پارتیزانی دا یاسایەکی بنەرەتی تریش بوونی هەیە. ناسینی ناوچەی شەر لە پێویستیەکانە. پارتیزان دەبیْ شارەزای ئەو شوێنە بیْ کە بریارە هێرشی بکەنە سەر. ئەو دەبیْ شارەزایی تەواوی لەسەر رێگاکانی پاشەکشە. چ ئەوانەی ئەکریْ کەلکی لێوەربگیریْ و چ ئەوانەی کەلکی لێوەرناگیریْ، مالی دۆست و دوژمن، پارێزراوترین شوێنەکان، ئەو شوێنەی

کە دەکرێ تیایدا پارێزگاری لە هاورێیەکی بریندار بکرێ، ئەو شوێنەی کە دەکرێ بۆ ماوەیەك تیایدا بمێننەوە، بناسن. بە واتایەکی تر دەبێ هەموو ئەو ناوچەیە وەك لپی دەست شارەزا بێ و بیناسێ ئەمەش دەکرێ و مەیسەرە. لەبەر ئەوەی خەڵك، واتە ناوەرۆکی ڕاستەقینەی هێزی پارتیزانی، لە پشت هەر جەولەو جولەیەکی پارتیزانەکانەوە هەن و وەستاون. خەلکی ناوچەکە خۆراك گەیەنەرن، نامە بەر و پەرەستیارن، سەرچاوەی هێزی تازەن و بە واتایەکی تر، یارمەتیدەری زۆر گرنگی هێزە پێشرەوە چەکدارەکەی خۆیانن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، وە لەگەڵ پێویستی هەزارجارەی تاکتیکی پارتیزانەکان، ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە، "بۆچی دەبێ شەر بکەین؟" و وڵامێك کە رەنگدەداتەوە ئەوەیە کە "پارتیزان رێکخەری کۆمەلایەتیە. پارتیزان بۆ بەیانی هاواری نارەزایەتی پر لە ئازاری خەلکی زەحمەتکێش دەستی بۆ چەك بردوە. پارتیزان بۆ ڕوخان و گۆرینی سیستەمێك تێدەکۆشێ کە هاوزینجیرە بێ چەکەکانی گیرۆدەی فەقیری و چوێرەوەری کردووە. ئەو بە دژی هەلومەرجی تایبەتی "سیستەمی" حاکمان شەر دەکا. ئەو سوورە لەسەر ئەوەی کە بە کەلك وەرگرتن لە تەواوی ئەو هەلومەرجەی کە پێش دێ "سیستەمی" زولم و زۆر ورد بکا و لەناو بەرێ."

دیسامبری 1967

---

سەرچاوە : ناوندی توێژینەوەی ئێرنێستۆ چێ گوارا



# بەشی یەکەم

## بۆ رژێمی عێراق..

## هەمیشە رقی لەگەرمیان بوو؟

لەبەرئەوەی ناوچەی گەرمیان یاروونتر بڵێین ئەوئەوبەشەی گەرمیان کەبریتی بوو لە دەوروبەرو رۆژهەڵاتی کەرکوك و سنووری دەربەندیخان و کەلار وکفری وسەنگاو و قادرکەرەم و باشووری چەمچەماڵ ....

لەسەردەمی کەریم خانی زەندەوە تاسەر وەختی شێخی نەمرولەشەڕی داگیرکەرانی ئینگلیزەوە تا شەڕی پاڵ بەردەقارەمان ودواتر شەڕی دەستپێکی شۆڕشی ئەیلول لەدەربەندی بازیان ئەوسنوورە چقڵی چاوی داگیرکەرانی کوردستان بووە..

لەدوای هەڵگیرسانی بڵێسەی شۆڕشی نوێ و چالاکییەکانی هاوڕیانی کاك ئارام و خالیدگەرمیانی ومامەریشە ئەوناوچەیە بوو بوو بەلانەی رۆڵەئازاکانی کوردستان و بەئاسانی بۆی کۆنترۆڵ نەدەکرا...

لەبەر ئەوەی لە ڕووی سیاسی و ئابووری و جوگرافی و کۆمەلایەتیشەوە رژێم هەمیشە حیسابێکی تایبەتی بۆگەرمیان و باکور ورۆژهەڵاتی کەرکوك دەکرد، هەردەم بەسەنگەری بەرگری وئازایەتی پێشمەرگەو بەرخودانی جەماوەری دەزانی، هەر بۆیە دوا بەدوای جێبەجێ کردنی پرۆسەکانی ئەنفال لەسنووری بارەگاکانی (ی.ن.ك) لە دۆڵی (جافایەتی) ودواتر لەناوچەی (قەرەداغ) بەپێی نەخشەیەکی داڕێژراوی سەربازی لەرۆژی 1988/3/27کەوتە کۆکردنەوە و مۆڵدانی هێزەکانی سوپا و جاش لە دووز و کفری وکەلاروچەمچەماڵ وبانی مەقان و قەرەحەسەن و لەیلان و دەربەندیخان و قەرەداغ...هتد

بەمەبەستی داگیرکردن وسو تماکی خاکەکەی وکۆمەڵکوژی هاووڵاتیان و تەعرەب و بەتاڵان بردنی سەروەت و سامانی سەرزەوی و ژێرزەوی ...



## گەرمیان و بەرگری شاڵاوەکانی ئەنفال

ڕۆژی 1988/3/31 هێزێکی گەورەی سوپاوجاش لە (سەنگاو)و (سەرقەلا)وە بەرێ دەکەون بەرەوبەرزایی شاخی(ئاشداخ)بەمەبەستی سەرکەوتنە سەر شاخەکەو دابینکردنی شوێنێك وەك (مرصد) بەلأم پێش نیوەڕۆ لەبناری شاخەکە ڕووبەڕووی گڕی بڵێسەی جەکی تۆڵەسێنی پێشمەرگە ئازاکانی گەرمیان دەبنەوە، کەبریتی دەبن لەم هەڤاڵانە :

حاکم قادرحمە صالح،اکرم شێخ کریم،حمەاسداللە،تەیب، پۆلا،جمال تیماری، ڕۆوف رحیم، علی خاویەیی) و(تایەرەسوور)و(دەستەیەك لەپێشمەرگەکانی پارتی) شەڕ تا ئێوارەی ئەوڕۆژە لەژێر ئاگری تۆپخانەی ڕژێم دا بەردەوام دەبێت، دوژمن چەندین کوژراو وبریندراری دەبێت، لەو نەبەردەیە دلێرانەیەدا پێشمەرگەی ئازاو قارەمان وکادیری کۆمەلایەتی تیپی 51 ی گەرمیان (حاکم قادرحەمەصالح ڕەباتی) شەهیددەبێت،سەرلەئێوارە هێزەکەی ڕژێم دەگەڕیتەوە مۆڵگاکانی پێشووی خۆی.

## شەڕی ئاشداخ

- دوای ئەوەی لە1988/3/31هێزەکانی ڕژێم هێرش دەکەنە سەرشاخی(ئاشداخ).
- لەڕۆژی 1988/4/2کاك عمرفتاح لەگەڵ کاك محمودسەنگاوی وچەندهەڤاڵێکی تر لە گوندی (مەسۆیی) دەچنەلای هەڤاڵانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) و داوایان لێدەکەن کە بەشداری لە شەڕی بەرگری ئەنفالی سێ دا بکەن...
- ڕۆژی 1988/4/7 دوژمن لە هەموو قۆڵەکانەوە پەلاماری(ئەنفالی سێ) بۆ گەرمیان بەچڕ و پڕی دەستپێدەکات،ئەگەرچی حەوت ڕۆژی تەواوهێزی پێشمەرگەوهێزی پشتگیری،بەرگری زۆر قارەمانانە دەنوێنن، چەندین ڕۆڵەی ئازا شەهیددەبن،بەڵام نابەرامبەری هێزەکان وەزعەکە بەرەوکارەسات دەبات،لەزۆربەی بەرەکانی شەڕدا دوژمن پاش زیانی زۆر پێشڕەوی دەکات، هەمووگوندەکان کاول و وێران دەکات، خەڵکەکەشی ڕاپێچی ئەوکامپانەدەکات کە لە (سەرقەڵا) و(چەمچەماڵ) و (لەیلان)و (تۆبزاوا) و(ئالیاوە)و(قەرەتاموور) بۆی ئامادە کردبوون.

هێزی زۆری سوپا بەپاڵپشتی فەوجە سوکەکانی جاش و بەفەرماندەیی تاوانباری گۆڕبەگۆڕ(بارق عبدللەحاج حنتە) وبەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی (علی کیمیاوی) ڕۆژبەڕۆژ گەمارۆی سەرخەڵکەکە توندتر دەکەنەوە، هێزی فڕۆکەوانی لەئاسمانەوە بەفڕۆکەی جۆری (Pilatus) و(هەلیکۆپتەر) هێزی زەمینیش لەخوارەوە بەتۆپی دوورهاوێژ و ڕۆکێت وکاتیوشا شاخ وگوند ودەشت و دەر ئاگرباران دەکەن.

ئەگەرچی (یوسف دزەیی) لەکتێبی (ئەنفال.کارەسات وئەنجام ورەهەندەکانی..)دا نووسیویەتی:

"سوپای عێراق لەکاتی هێرشکردنە سەر ناوچەکانی گەرمیان بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بە پێویست نەزانی" بەڵام شایەدحاڵەکانی ئەنفال و گەرمیانیەکان باس

لەوەدەکەن لە دوای حەوت ڕۆژ بەرگری وفیداکاری پێشمەرگە و هێزی پشتگیر .. لەدێی (تازەشار)ڕژێم چەکی کیمیاوی بەکارهێناوە ..

ڕۆژی 1988/4/14 ئەوڕۆژە بەڕۆژی(ئەنفال)دیاریکراوە،لەکۆبوونەکەی(مەسۆیی) بڕیاردەدرێت هێزەکان بکرێن بە دوو بەشەوە ،بەشێك بەپارتیزانی بمینێتەوە... بەشەکەی تری لەگەڵ پیرەپەککەوتەونەخۆش وژن ومناڵدا بکشێنەوە بۆ دەرەوەی پەلامارەکە،بەتایبەت بۆناوچەکانی شوان وشێخ بزێنی وقەلاسێوکەودەشتی کۆیە. لەوکۆبوونەوەیەدا بڕیار درابوو ئەوپێشمەرگانەی دەکشێنەوە بۆسنووری تیپەکانی (21)و(25)لەوێشەوەبەرەو(چەمی ڕێزان)و(خۆشناوەتی)وبارەگاکانی سەرسنوور، بەسیێ (ڕەتڵ) ىرۆن..

کاك (محمودسەنگاوی) وکاك (حەمەڕەش) بیان پەڕێننەوە بەرەو(خاڵخالان)و دوایی خۆیان بگەڕێنەوە...هەرئەوڕۆژە هەڤاڵ(عوسمان حاجی محمود) لەوبارەوە لەگەڵ (مام جلال امین کاکە)وچەند پێشمەرگەیەك گفتوگۆدەکات..

دەربارەی مانەوە وبەرگری بەشێوەی پارتیزانی،ئەوانیش بەڵێنی هاوکاری و بڕیاری مانەوە دەدەن، ئەو هەڤاڵانەش بریتی دەبن لە:.

1. عوسمان حاجی محمود
2- مام جلال امین کاکە
3. محمد حسین سلیمان(حەمە ئاخە)
4 - عوسمان علی سەمین
5. شکور محمد امین
6- صباح عمر وەلی
7 . رفیق احمد رشید
8. شکور دوانزەئیمامی
9. برهان دوانزەئیمامی
10. کریم حسین
11. جمال مدحت(جمالە سوور)
12. ابراهیم لفتە

لەم لیستەدا ئەم هەڤالانە شەهید بوون (حەمەئاخە، جمالە سوور، ابراهیم لفتە، برهان دوانزەئیمامی و شکور دوانزەئیمامی..) لەپاش دوو ڕۆژ مانەوە لەناو توونی

ئەنفال دا هەڤاڵ (مجید دووزی) دەگاتەلایان وبڕیاری مانەوەدەدات...

لەبناری گل وزەنگنەیش(شێخ کریم چاوڕەش) و(سید جەوهەر) وچەندهەڤاڵێکی تر بڕیاری مانەوە دەدەن ئەوانیش بریتی دەبن لە:.

1.شێخ کریم چاوڕەش
2.محمد چەوری
3.کاك نازم کەرکوکی
4.شەهید فازڵ
5.جمال وارانی
6.جعفر سید لەتیف
7.شەهید یاسین بچکۆل
8.شەهید نادر مجید
9.شەهید سەید جەوهەر
10.محسسن لەکی .
11.عبدالله قەیتۆلی
12. شەهید سید بابا
13. عوسمان
14. عادل پیرمەوەنی

*لەنێوان 1988/4/14تا 1988/9/6 کە لێبووردنە ساختەکەی ڕژێم ڕاگەیەندرا، بەدەیان دەستە وگروپی جیا جیای(بەرەی کوردستانی)و(هێزەکانی بەدر*)و (هێزی پشتگیری)لەشاخەکانی پشت ودەوروبەری قەرداغ دەمێننەوە،لەهەموو شوێنەکاندا ڕووبەڕووی شاڵاوەکانی ئەنفال دەبنەوە . هێزەکانی (بەدر) لەکۆتایی نیسان دا لەکاتی کشانەوەیان لە 1988/5/3دا بۆ سنووری دەشتی کۆیە لەشاخی (سی تەغار) بە دەیان یان لێ شەهید دەبێت.

*بڕوانە کتێبی (ئەنفالی خاڵخاڵآن) لەبڵاوکراوەکانی نووسەر

## شەڕی ئاوایی (نەورۆز) و (داربەسەرە)

لە رۆژی3 4 1988 هێزێکی گەورەی دوژمن کەبریتی دەبێ لە جەیش وجاش، بەپاڵشتی تانك وزریپۆش ولەژێرئاگربارانی تۆپخانەدا پەلامارگوندەکانی (نەورۆز)و (داربەسەرە)دەدەن،پێشمەرگە قارەمان وئازاکانی(تیپی59ی حەمرین)بەفەرماندەیی (کاك عەسکەر) لەگەڵ هێزی پشتگیری لێیان دێنە دەست و تێکیان دەشکێنن، بۆ سەر لەئێوارەهێزەکەی دوژمن دەکشێتەوە، زیاترلە10سەرباز وجاشی لێ دەکوژرێ. دەسکەوتی پێشمەرگەکانیش پێنج کلاشینکۆف دەبێت .

لەرۆژی4 4 1988هێزەکانی رژێم دووبارە دێنەوە بۆسەر ئەودووگوندە خۆڕاگرە، بەمەبەستی بردنەوەی کوژراوەکانیان،ئەورۆژەیش هەتا ئێوارە شەڕدرێژەی دەبێت، هێزەکەی دوژمن تێك دەشکێتەوە وپێشمەرگەکان تانزیك(زەمبوور)دەکەونە دوایان. لەئەنجامدا پێشمەرگە یەك شەهید دەبێت.

## شەڕی دێی (چراغەڕووتە)

سەر لە بەیانی ڕۆژی1988/4/7لەکاتێکدا کە ڕژێم لە زۆربەی قۆڵەکانەوە هێرشی ئەنفالی سێ بۆسەر گەرمیان چڕتردەکاتەوە رۆلەئازاکانی(کەرتی3ی هەمەوەند) لە سەعات (8 دا بۆسەیەك لەسەر ڕێگای گشتی(چەمچەماڵ . سەنگاو)لەئاست گوندی (چراغەڕووتە) بۆکاروانێکی سەربازی دەنێنەوە،شەڕ تاسەعات(10)ی پێش نیوەڕۆ بەردەوامەدەبێت،لەئەنجامدا ئیڤایەك تێکدەشکێت و(3) سەربازیش دەکوژرێن. پێشمەرگەکان بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ بارەگاکانی خۆیان.

***

## شەڕی گوندەکانی (تالاو) و (ژاڵەی دەربەند)

- بەیانی1988/4/7پەلاماری ئەنفال دەگاتە ئاواییەکانی(بنارگل) و (زەنگەنە) بەهەموو چەکێك ئاگربارانی ناوچەکە دەکەن. پاشان بەرەو ناو گوندی (تالاو) پێشڕەوی دەکەن،پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) و(حزبی شیوعی)و(هێزی پشتگیری) خۆیان لە بۆسەدەنێن .شەڕ لەبەیانی تاسەعات 4ی پاش نیوەڕۆ بەردەوام دەبێت، لەئەنجام دا دوژمن دەکشێتەوە و پێشمەرگەیەکی تیپی51ی گەرمیان شەهید و (هاوڕێ حەمەسۆفی)پێشمەرگەی حزبی شیوعی زامداردەبێت، دوژمن لەو شەڕدا کوژراو وبریندارى زۆری دەبێت...

لاشەی چەند کوژراوێکی دوژمن لە مەیدانی شەڕەکە جێدەمینێت .

- لە ڕۆژی 1988/4/8 شەڕێکی تری (کەرتی 3ی هەمەوەند)لە(ژاڵەی دەربەند)بە فەرماندەیی هەڤاڵ (سیروان دیرەشە)کەتازە لەکەمینەکەی چراغەڕووتە دەگەڕێنەوە، ئەو شەوە لە گوندی ( ژاڵەی دەربەند) دەمێننەوە، لە کاتژمێر8ی سەر لە بەیانی هێزێکی گەورەی سوپا وجاش پەلامار دەهێننە سەریان ..

شەڕ تا 12ی نیوەڕۆ بەردەوام دەبێ، لەوشەڕەشدا زیانی دوژمن بریتی دەبێت لە:

1. کوژرانی 4 سەرباز 2. برینداربوونی سێ سەرباز

زیانی پێشمەرگەکان بریندار بوونی هەڤاڵ(مەریوان عمرعلی)دەبێت ..

پاش نیوەڕۆ پێشمەرگەکان بەرەو بنار سەگرمە دەکشێنەوە.

### شەڕ لەچەند گوندێکی تری گەرمیان

سەرلە بەیانی 1988/4/8هێزەکانی ڕژێم لە هەمووقوڵەکانەوە هێرش دەبەنە سەر گوندەکانی(ساڵەیی)و (چەوری)و(باشتەپە)و(لفتی ئاغا) و (وارانی) پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك)و(حشع) بەربەو شالاوە دەگرن، ئەوڕۆژە تا ئێوارە شەڕ درێژەی دەبێت.

لەئەنجامدا پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) و(حشع) 30 سەرباز دەکوژن و لاشەکانان لەبەردەستی پێشمەرگەکاندا دەمێنێتەوە.

- دەسکەوت 20 کلاشینکۆف ودووسەیارەی (لاندکرۆزەر) و(شەفرلێت)یك دەبێت.

لە(لفتی ئاغا)دەسکەوتی پێشمەرگەشیوعییەکان (لاندکرۆز)و(شوفەڵ) یك دەبێت.

15 سەربازیش تریش دەکوژرێن ..

**زیانەکانی پێشمەرگەکان :-**

1. شەهید بوونی تارق محمدعلی (پ.م) ی.ن.ك

2. شەهید بوونی خلیل ابراهیم (پ.م) ی.ن.ك

3 . خەلیل حەسەن ئەمین (خەلیل پارەپارەیی)بریندار دەبێ.

<u>بەپێی ئەو زانیارەی لە هەڤاڵ(فخرالدین)ی برای شەهید(مامەریشە) وەرمگرتووە:</u>

- لە <u>1988/4/9</u> دانیشتوانی گوندی (تاڵەبان) لەوە دڵنیا دەبن کە هێزەکانی ڕژێم بەنیازن بازنەی گەمارۆیان توند تر بکەن بۆ کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکە ...

هەربۆیە خەڵکی ڕوودەکەنە هەردە و چەمەکان، لەئاودرەکاندا بنکە دروست دەکەن بۆ خۆپاراستن لەفڕۆکە وحەشاردانی ماڵ ومناڵەکانیان، شەوی 8/ 9ی نیسان ، کەرتی تیپی 57ی سەگرمە لەگەڵ کەرتی5ی باسەرەی تیپی59ی حەمرین دەچنە گوندەکە دوای کۆبوونەوەیەکی دووقۆڵی بڕیار دەدەن کە بۆ بەیانی لەنێو گوندەکە بمێننێنەوە بۆبەرگری لە شاڵاوەکانی ئەنفال، شەڕی مان ونەمان بکەن .

لەڕۆژی 4/9 1988سەعات 9ی سەرلەبەیانی دوای تۆپبارانکردنێکی زۆر، دوژمن پێشڕەوەی دەکات، شەڕ لەنێوان هەردوولا دەست پێدەکات،چەندجارێك دوژمن دەشکێ،سەرلەنێوارەهێزی دوژمن بەناچاری دەکشێتەوە..

زیانی دوژمن(25) کوژرا وپێشمەرگەکانیش هەڤاڵ(جمال بارۆیی) شەهید دەبێت.

- ڕۆژی 10 1988/4ڕژێم کۆنترۆڵی ناوچەکە دەکات،زیاتر لە(100)هاوڵاتی

دەڤەرەکە راپێچی (دووبن) و(نوگرەسەلمان) دەکات،(هەیبەت احمد خدر)ی دایکی شەهید(مامەڕیشە)یش لەنێوان ئەنفالکراوەکان دا دەبێت..

پاش شەش مانگ پیروپەککەوتەکان بەر لێبووردن دەکەون و دەگەڕێنەوە.

## نەبەردێك لەشاخی پشتی (خوێلێن)

لەڕۆژی1988/4/9هێزێکی زۆری ڕژێم پێشڕەویی دەکات بەرەوشاخی پشتی (مەملەحە)و (خوێلێن) لەدەورویشتی گوندی(گەڕاو) هێزی پشتگیری ڕووبەڕوویان دەبنەوە، کەلەلایەن هەڤاڵان(کریم حاجی محمددێرەشە)و(احمدتوفیق هەشەزینی) و (حەمە تاڵ)ەوە سەرپەرشتی دەکرێن.پاش شەڕێکی قارەمانانە دەتوانن زیانی زۆر لە هێزەکەی دوژمن بدەن. لە بەربەرفراوانی پەلامارەکەی دوژمن لەچەند قۆڵەوە پێشمەرگەکان خۆیان لەزانیاری زیانەکانی دوژمن دەپارێزن،دواترپێشمەرگەکان بەرێك وپێکی خۆیان لەبازنەی پەلاماری دوژمن دەربازدەکەن..

## شەڕێك لە گوندی (قەیتول)و(گەڕاوی)

*خولێخۆشبووهەڤاڵ(مەلائەحمەدی ون)ڕێکخەری(کەرتی2ی تیپی(59ی حەمرین) کەخۆی بەشداری ئەو شەڕەی کردبوو، بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات دەربارەی ئەوشەڕە بۆی گێڕامەوە: (سەر لەبەیانی ڕۆژی1988/4/9هێزێکی زۆری جەیش و جاش بەپاڵپشتی(45)تانگ پەلاماری گوندی (قەیتول)یان دا، کەرتەکەمان وهێزی پشتگیری گوندەکە بە فەرماندەیی هەڤاڵ (جلال مەسۆیی) ڕووبەڕوویان بووینەوە، لەبەرگرییەکی قارەمانانەدا دوژمن سەرلەئێوارە کشایەوە،لەوشەڕەدا زیانی دوژمن نەزانرا،بەڵام ئەم پێشمەرگانەی (ی.ن.ك) کەناویان هاتووە شەهید بوون:

1. عبدالواحدمجید (مامۆستا وریا) 2. نجم الدین باغەگردەڵەیی

3. سامان مجید 4. مامۆستاکاوە سعدالله/کەرکوك )

سەعات 9 ی بەیانی هەمان رۆژ هێزێکی تر پەلاماری(گەڕاوی . قادرکەرەم)دەدەن. دەستەیەك لە پێشمەرگەئازاکانی (کەرتی 3ی تیپی 59ی حەمرین) و قارەمانەکانی هێزی پشتگیری گەرمیان دەچنە سەنگەری بەرەنگارییەوە، لەشەڕێکی کەم وێنەدا کە بەراستی شەری مان ونەمان دەبێت،رووبەرووی ئەنفالچیەکان دەبنەوە، رژێم بە تانك وفرۆکەوهەلیکۆپتەر هێرش دەکات، دوژمن زیانیَ زۆری لیَ کەوێت..

لەوشەرەدا کە (8) سەعات دەخایەنێت ئەم پێشمەرگانە شەهید دەبن:

1. کریم حمیدئاغا(مەلا کەریمی باج)کادر
2. حسین مارف . بکرباجەلان
3. علی سعید خەڵکی گوندی بکرباجەلان
4. جلال / پشتگیری
5. محمد دەولەت (حمەباوایی)سەردەستە
6. احمد نازە
7. ئاسۆ حەبیب / برایم غلامی
8. ئیکرام هەرمۆڵەیی
9. جلیل خەڵکی گوندی بکرباجەلاَن .
10. رەمەزان کەرەم /مامشە

- لە 4/9 1988هێزێکی تری ڕژێم لە(سەرقەڵا)وەپەلاماری گوندی (هۆمەرمل) دەدەن،پێشمەرگە ئازاکانی (ی.ن.ك) لێیان دێنەدەست وزیانی دوژمن نازانراێ، پێشمەرگەکانیش بێزیان دەبن.

- لە رۆژی 1988/4/9پێشمەرگەکانی مەڵبەندی (1)ی (یەکێتی) پەلامار دەبەنە سەر هێزەکانی ڕژێم و تا(چوارملان) ڕاویان دەنێن...

لەوچالاکیەدا دوژمن زیاتر لە(100) سەربازی دەکوژرێ وتانکێك تێکدەشکێت .

<u>**دەسکەوتی پێشمەرگەکان :-**</u>

1. شەش کلاشینکۆف
2. یەك R.B.K
3. یەك دەمانچە
4. یەك سەیارە
5. جیهازێکی راکاڵ دەبێت.



# داستانی تازەشار

رۆژی 1988/4/9دوای ئەوەی هێزەکانی ڕژێم لەهەردوو شەڕی 7و8ی نیسانی (تالاو) و (چەوری) و(لفتی ئاغا) شکست دەخۆن،جارێکیتر بەنەخشەو بەرنامەیەکی نوێ ترەوە خۆیان بۆپەلامارێکی گەورە سازدەدەنەوە، پێشمەرگە قارەمانەکانی کەرتی1ی تیپی51ی گەرمیانی(ی.ن.ك)و هاوڕێ دلێرەکانی کوردوعەرەبی(حشع)و (هێزی پشتگیری) گەرمیان بڕیاردەدەن کە سەنگەربگرن ولە گوندی(تازەشار) دا لەگەڵ هێزێکی گەورە وخاوەن تەکنەلۆژیای پێشکەوتووی سەربازیدا بچنە شەڕێکی نا بەرامبەرەوە، تارێك ڕوونی بەیانی ئەنفالچییەکان دەکەونە پێشرەوی، سەعات 8 ی سەرلەبەیانی فرۆکە پیلاتۆس و هەلیکۆپتەرەکان دەگەنە ئاسمانی ناوچەکە،دەست دەکەن بەڕۆکێت بارانکردنی گوندەکە....

لەزەویشەوە هێزێکی گەورە،کەبریتی دەبن لەدەیان تانك وزرێپۆش ،لەڕێگای (دووز)و (قادرکەرەم)ەوە ئابلۆقەی گوندەکە دەدەن ،ئیتر شەڕێکی زۆر گەورە دەست پێ دەکات، ئەوگوندەو دەوروبەری دەبنە یەك پارچە لە گڕ وبڵێسەی ئاگر .. هەرچەندە دوژمن لەپاش نیوەڕۆدا بەشێکی گوندەکە داگیردەکات، بەڵام چەند

هاوڕێیەکی حیزبی شیوعی دەتوانن خۆیان لەنێو بازنەی گەمارۆکەدا بدزنەوەو دوای دەربازبوون خۆیان بگەیەنن بەگوندی(شێخ حمید).باقی پێشمەرگەکانی تر بڕیاردەدەن کەشەڕی مان ونەمان بکەن ،هەڤاڵان (نازم بچکۆڵ) و(پێشمەرگەیەکی عەرەب) سوێنددەخۆن تاخوێنیان تێکەڵاو دەبێت،بەرگری لەهێرشی ئەنفال بکەن، شەڕتا سەعات 5ی ئێوارە درێژەی دەبێ، ئەگەرچی چەند جارێك هێزەکانی دوژمن تارومارد‌ەکەن. بەداخەوەشەڕەکە بەکاول بوونی تەواوی گوندەکە وشەهیدبوونی 13 (پ.م)ی (ی.ن.ك)و 8 (پ.م)ی (حشع)کۆتایی دێت.

## شەهیدەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان:

| | | |
|---|---|---|
| 1 نازم رشید احمد (نازم بچکۆڵ) | 1957 | کفری |
| 2 . فاروق رشید احمد | 1971 | کفری |
| 3 . غالب عبدالله امین | 1963 | خورماتوو |
| 4. احسان محمود صالح | 1964 | کانی قادر |
| 5 . حمید محمد صالح | 1971 | یەنگیجە |
| 6 . یاسین سعدون سعید | 1965 | کەرکوك |
| 7 . نیزام احمد رەمەزان | 1962 | خورماتوو |
| 8 . جبار عبدالکریم محمدعلی | 1962 | کانی قادر |
| 9 شێرزاد حسن علی | 1972 | خورماتوو |
| 10 . احمد امین رۆستەم(احمد مەسۆیی) | 1966 | مەسۆیی |
| 11 . نەجات فەتحوڵا ئەمین | 1966 | هەفت تەغار |
| 12 . عادل مجید خورشید(پشتگیری) | 1965 | تازەشار |
| 13 . احمد قادرکریم | | نەزانراوە |

## ناوی شەهیدەکانی حیزبی شیوعی عێراق:

| | |
|---|---|
| 1 . نازم علی عباس(ملازم سامی) | 1956 بابل |
| 2 . بها الدین علی محمد ماجد) | 1960 خورماتوو |
| 3 . عبدالرحیم علی محمد(ئاشتی) | 1956 کەرکوك |
| 4 . تالب یوسف (علی عەرەب) | 1958دیالی |
| 5 . فوزی عبدالجبار (عامر) | 1957 بابل* |
| 6. تارق محمد امین | 1965 کانی قادر |
| 7. عدنان رشید غیدان | 1969 کانی قادر |
| 8 . عبدالله وەلی حیدر | 1969 هەیەڕە سوور* |

* لەدوای ڕوخانی ڕژێمی دیکتاتۆری وجینۆساید چەوسانەوەو گۆڕەبەکۆمەڵەکان،خاتوو (ئان کلود) نێردەی تایبەتی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بۆمافەکانی مرۆڤ سەردانی کوردستان وخواروی عێراقی کرد.

**لەڕۆژی2003/6/4دا لەشاری(خورماتوو) بەشداریکردلەهەڵدانەوەی گۆڕی بەکۆمەڵی (22)پێشمەرگە. کەپێکهاتبوون لەپێشمەرگەکانی(ی.ن.ك)و(حزبی شیوعی عێراق)ئەو پارتیزانە قارەمانانەی لەنەبەردەکانی بەرگری ئەنفال لەشەڕی گوندی(تازەشار)دا چەند کەسێکیان بە برینداری کەوتبوونە دەست هێزەکانی ڕژێم لەسەربازگەی قاتعی دوزخورماتوو خرابوونەوە ژێر گڵەوە....

لە ڕۆژی 2003/6/5 لەڕێوڕەسمێکی شایستەدا بەئامادەبوونی لێپرسراوانی حزبی و حکومی بەتا یبەت (عوسمان حاجی محمود) و(محمودسەنگاوی) و(عدنانی حەمەی مینا) و (مەلاحسن) لەحزبی شیوعی کوردستان ونوێنەری دەزگای شەهیدانی شۆڕشی گەلی کوردستان وپتر لە(10هەزار )کەس لەخەمخۆران تەرمی هەر(22) شەهیدەکە لەگۆڕستانی تایبەت بە شەهیدان لەگەڵ خوێندنەوەی چەندین پارچە لە شیعر وپەخشان بەخاك سپێردرانەوە.

## شەری گوندی خالۆبازیانی

شەوی 9/8 ی نیسانی1988چەندکەرتێك لە پێشمەرگە ماندوو و هیلاکەکانی هەردوو تیپی (31ی سلیمانی)و(51ی گەرمیان) دوای گەرانەوەیان لەشەرەکانی بەرگری بی ٔهودە لە پەلامارەکانی ئەنفالی یەك بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی ، لەرێگای( قاسمەرەش ،قەندیل. خۆشناوەتی،شێخ بزێنی وشوان)ەوە ئەگەنەوە گوندی (چیمەن)دوای ئەوەی لەرێگای گشتی کەرکوك ـ سلیمانی دەپەرنەوە بەرەو گەرمیان، بەرەبەیانی لەگوندی (خالۆ بازیانی)لادەدەن .

دوو رۆژ پێشتر چەند شوێنێکی وەك قەرەهەنجیر وقەرەحەسەن وقادرکەرەم و سەنگاوبەر پەلاماری ئەنفال کەوتبوون،هەرلەوێوە بەهۆی جیهازی راکالْ پەیوەندی بەهەڤالْ(قادری حاجی علی)وکاك(شێخ جەعفەر) ەوە دەکەن، ئاگاداریان دەکەنەوە کەگەیشتوونەتەوە گەرمیان وبریاریان داوە بە زیاتر لە (100) پێشمەرگەودەیان کەس لەهێزی پشتگیری گوندەکە بەرگری لەگوندی خالۆبازیانی بکەن.

پێشتر خەلْکی گوندەکە سەنگەری چاکیان لە چواردەوری ئاوایی ولەنێو رەز و باخەکاندا ئامادە بێت..

سەرلەبەیانی رۆژی 1988/4/10پێشمەرگەکانی هەردووتیپ وهێزی پشتگیری گوندەکە دابەشی سەر سەنگەرەکان دەبن ...

دوای ئەوەی هێزەکانی رژێم بەتۆپی دورهاوێژ وکاتیوشا وهاوەن لەزەوییەوە، بەهەلیکۆپتەرو پیلاتۆزلە ئاسمانەوە سەنگەری پێشمەرگەکان وگوندەکە بۆماوەی دوو سەعات ئاگر باران دەکەن . لە سەعات 12ی نیوەرۆ پەلاماری گونەکەدەدەن...

پاش(8)سەعات شەروبەرگری هێزەکەی دوژمن زیانی زۆری بەردەکەوێت، وبەرەو گوندەکانی (شێخ جیری) و(باش بلاخ) دەکشێنەوە .

**زیانی پێشمەرگەکان:**

1. شەهیدبونی(ئازادحمیدسیامەنسووری)پێشمەرگەی تیپی (51) ی گەرمیان.
2. شەهیدبوونی پێشمەرگەی هێزی پشتگیری (مجیدمحمد عبدالرحمن).
3. برینداربوونی (محمد شفیق بەشارەت)و(ئازەر عبدالله عزین)
4. برینداربوونی پێشمەرگەیەکی تیپی 31 ی سلێمانی بەناوی محمود(خولە)

بۆنیوە شەوەکەی زیاتر لە (300)کەس لەپێشمەرگە وهێزی پشتگیری وخەڵکی تێکۆشەرودڵسۆزی گوندەکە ،بە دوو شەهید ودووبریندارەوە لە سەرووی ناحیەی (قەرەهەنجیر)ەوە ،بەنێوان دەیان ڕەبیە وکەمینی هێزەکانی دوژمندا دەپەڕنەوە بەری (شوان) و پاش پشوودانێکی کەم لەگوندی (هەیبە)هەر ئەو شەوە بەسەیارەو تراکتۆر دەکەونەڕێ بەرەو ناوچەی(شێخ بزێنی) و سەر زێی بچوک، هەتا لەبازنەی گەمارۆی ئەنفال ڕزگار بن.*

## شەڕی گوندەکانی(توکن)و(عزیزقادر)

سەرلەبەیانی10/4/ 1988ڕژێم بەهێزێکیگەورەوە پەلامار دەباتە سەر گوندەکانی (توکن) و (عزیز قادر)دوای شەڕێکی قارەمانانە دوژمن دەیان کوژراوو برینداری دەبێت زیانی پێشمەرگەکان شەهید بوونی هەڤاڵ (فوادحبیب ) دەبێت

## شەڕی گووندەکانی (هەرێنە) و(گولباخ)

لە سەعات (8)ی بەیانی 1988/4/10 دوای هێرشی ڕژێم شەڕدەست پێدەکات، هەتا سەعات(4)ی پاش نیوەڕۆ بەردەوام دەبێت..دوژمن 2 سەربازی لێ دەکوژرێ، پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) بێ‌زیان دەبن..

---

* سەرچاوە : کوردستانی نوێ / ژ/2726 / 2002/4/10

# هێرشێکی بەرفراوان

بەیانی1988/4/12 ڕژێم لە (14) قۆڵەوە پەلامار دەباتە سەرگوندی(سۆفی کریم) لەوشەڕەدا زیانی دوژمن زۆر دەبێت. ئەفسەرێکی(ئامر فەوج) دەکوژرێت...

# شەڕێك لە گوندی (کوڵەبان)

هاوکات لەگەڵ شەڕی گوندی خالۆبازیانی ڕۆژی1988/4/10 ژمارەی (30پ.م) لەکەرتی4ی جەباری بەفەرماندەیی کاك ڕزگارحاجی کایل) کە(40)هەڤاڵیان هێشتا لەشەڕەکانی ئەنفالی یەك بوون و نەگەڕابوونەوە،سەرلەبەیانی لەدەوروبەری گوندی (کوڵەبان) سەنگەر دەگرن.. هێزێکی گەوروی ڕژێم پێکهاتوو لەسوپاو جاش لەلای باخەکەی (شێخ محمد شێخ عبدالکریم) ەوە پێشڕەوی دەکەن بەرەو (جەباری) و ناوچەی قادر کەرەم .سەرەتا لەسەر کەلی قەرەویس مۆڵ دەخۆن،پێشمەرگەکانی (کەرتی4ی جەباری)ولقێکی(حزبی شیوعی عیراق) بەسەرپەرشتی(هاوڕێ سیدعلی) وکەرتێك لەپێشمەرگەکانی (سۆسیالیست) بەفەرماندەیی کاك (قادر جەباری) بەربە شالاۆی ئەنفال دەگرن،ئەوڕۆژەبەهۆی لەدەستدەرچونی موشەکێکی(R.B.G)یەوە هاوڕێیەکی(حشع)زامدار دەبێ.

پاش 12 سەعات کاتیوشا وتۆپ بارانکردنی گوندەکانی کوڵەبان وتەکیەوجانی ، دوژمن ناتوانێ پێشرەوەی بکات. بۆئێوارە دوژمن بە ناچاری دەکشێتەوە .

# خۆپیشاندانی جەماوەری چەمچەماڵ

1988/4/11دوای ئەوەی ئەنفالچییەکان لەماوەی(5) ڕۆژدا باری زیاتر لە(200) ئوتۆمۆبیل و پاسی گەورە، ژن ومناڵ وپیر ولاوی گەرمیان باردەکەن،بەنیازی ئەوەی بەناوشاری چەمچەماڵ دا بەرەو چارەنوسی نادیاریان بەرن...خەڵکی تێکۆشەری

چەمچەماڵ لێیان ڕادەپەڕن ولەخۆپیشاندانێکی جەماوەریدا،هەڵمەت دەبەنەسەر پاسەکان وچەندین شوشە ودەرگای سەیارە دەشکێنن،بەوهیوایە ئەنفالکراوەکان دەربازبکەن،بەوهۆیەوە دەیان کەس هەلیان بۆ هەڵدەکەوێت وخۆیان ڕزگاردەکەن، هەر ئەو ڕۆژە چەندین هەلیکۆپتەر دەچنە ئاسمانی شارەکە و ئاگر بارانی دەکەن.. بە بڵندگۆ بانگەواز دەکەن: هەرکەسێك،هەرماڵێك ئەنفالکراوەکان داڵدە وپەنا بدات، ئەوا بە توندی سزا دەدرێت،پاشان هێزێکی سەربازی هەڵدەکوتنە ناوشارو بەشی هەرەزۆری ئەوخەڵکە ئەنفالکراوانە دەگرنەوە و بەرەو تۆبزاوە ڕاپێچیان دەکەن.

## شەڕێك لەگوندەکانی (چەوری)و (وارانی)

لە ڕۆژانی 9 و 10 ی نیسان دا لەهەردوو گوندی (چەوری) و (وارانی) شەڕ لەنێوان (هـ.پ.ك)بە فەرماندەیی کاك عادل شکور وکاك عوسمان وشەهید سید جەوهەر و شەهیدحەمەئاخە ودەستەیەك لە پێشمەرگەکانی(حزبی شیوعی عیراق) *لەبەیانی تا ئێوارەی 1988/4/10بەردەوام دەبێ،زیانی دوژمن زیاتر لە(50)کوژراودەبێت. لەو بەرگرییەدا (30) تەرم لەبەردەستی پێشمەرگەدا بەجێ دەمێنێ.

- زیانی پێشمەرگەکان: لەگوندی (چەوری) (تاریق محمدعلی) شەهید دەبێت.
- لەڕۆژی 1988/4/12دا لەشەڕی گوندی(باوەکر)بەسەرپەرشتی سەیدجوهەر،
- زیانی دوژمن زۆر و سێ پێشمەرگەیش شەهید دەبن بەم ناوانە:.

1. علی امین (علی( BKC)
2. حسین علی مستەفا
3. اسکندر ابراهیم بابان

. هەڤاڵ مەلا سعید لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر بریندارەدەبن.

* بۆزانیاری زیاتر لەسەر بەرگری جوامێرانەی شیوعی یەکان بڕوانە کتێبی :
جوامێری پارتیزانەکانی حزبی شیوعی/ مەلاشاخی / 2019

## 14ی نیسانی 1988

## فیداکارییەك لە تیپی 25ی خاڵخاڵان

لەدوای ئەوەی دوژمن بازنەی گەمارۆی لەسەرخەڵکی گەرمیان وپێشمەرگە توندکرد لە شەوی ١٤/٤/١٩٨٨ مفرەزە یەك لە کەرتی قەڵاسێوکەی (تیپی 25 ی خاڵخاڵان). بۆکەمکردنەوەی فشاری دوژمن دەچنە سەر ڕبیەی (بانی قەلان)ی نێوان گوندەکانی قشلاخ وکانی سپیلکە،هەرچەند پێشتربەمەبەستی ڕێگەخۆشکردن بۆ گرتنی ئەو ڕەبییەیە لەنزیکەوەچاویان لێکردبوو,هیچ گومانیان لە کۆنترۆل کردنی نابێت،بەڵام بەداخەوە پێش چەندشەوێك هەرچواردەوری ڕەبییەکە بۆمبڕێژ دەکرێت, لەکاتی نزیك بوونەوەیان لە ئامانجی چالاکییەکە دوژمن ئاگادار دەبێتەوە و مینەکانیان پێدا دەتەقێننەوە, لەئەنجامدا شەش کەسیان شەهید و بریندارەدەبەن و لەنێو سیم وتەلی دڕکاویدا گیردەبن ..

### ناوی شەهیدەکان :

1 ـ عەلی ڕەزاحەسەن (عەلی باوەفەتی)

2 ـ عوسمان محمدفەرەج (عوسما ن بچکۆڵ)

3 ـ عادل ملامحمد کاکل (شەماڵ گوپتەپەیی)

4 ـ مستەفا محمد عبداللە کەلەباشی

5 ـ دڵشاد کریم (دڵشادە سوور) تەپە / کەرکوك

6 ـ محمد رسول عبدالرحمن (هێرش) جەلەمۆردی

**برینداره‌كان:**

**1 ـ ئاسۆ خه‌ڵكی سلێمانی          2 ـ فوئادخالید ده‌روێش / شوان /كه‌ركوك .**

**له‌كاتی ته‌قینه‌وه‌ی مینه‌كاندا(علی باوه‌فه‌تی)پێیه‌كی ده‌په‌ڕێت وچه‌كه‌كه‌ی دوور ده‌كه‌ویته‌وه، كه‌ده‌زانن توانای كشانه‌وه‌یان نه‌ماوه و به‌دیلی ده‌كه‌ونه به‌رده‌ستی دوژمن علی باوه‌فه‌تی داوا له‌هاوڕێكانی ده‌كات : وه‌رن با باوش به‌یه‌كتردا بكه‌ین, بۆئه‌وه‌ی دوژمن بزانێت كه‌ئێمه‌چۆنین له‌گه‌ڵ یكتردا..ئیترجاشه‌كان ده‌گه‌نه سه‌ریان, كاك علی زۆرجنێو به‌جماعت ڕبایه‌كه ده‌دات بۆئه‌وه‌ی تۆڕه‌یان بكات وبیان كوژن, پێیان ده‌ڵێ:بێشه‌رفینه بۆوه‌ستاون..؟بمكوژن.!ئه‌وانیش له‌وه‌لآمدا ده‌ڵێن:**

**ناتكوژین چونكه زمانتان زۆر درێژه,بابه ڕه‌زیلی بمرن..**

**دڵشاد دووانزه‌جگه‌ره ده‌كێشێت،پاشان گیان ده‌سپێرێت،هه‌رسێ هاوڕێكه‌ی تریان كه‌بریتی ده‌بن له‌(سیروان گۆكجه‌یی وهیواره‌ش و سه‌ركه‌وت باوه‌فه‌تی) كه له‌به‌رزاییه‌كه‌وه پێشتر مۆلگه‌كه‌یان ئاگرباران كردبوو،وا‌ده‌زانن كه‌هاوڕیكانیان به‌سه‌لامه‌تی كشاونه‌ته‌وه، ده‌كشێنه‌وه بۆشوێنی دیاری كراو.. به‌ره‌به‌یان یه‌كێك له‌بریندارە‌كان به‌ناوی(فوئاد ئۆمه‌ربه‌گی) ده‌گاته‌وه شوێنی دیاری كراو و ڕووداوه‌كه‌یان بۆباس ده‌كات،به‌په‌له بۆ به‌هاناوه‌چوونی هاوڕێكانیان ده‌گه‌ڕێنه‌وه، له‌نزیك ره‌بیكه به (ئاسۆ) ده‌گه‌ن و دووری ده‌خه‌نه‌وه، به‌لآم ڕۆژ هه‌ڵدێت و فریای زیاتر ناكه‌وه‌ن، به نائومێدی پاشه‌كشه‌ده‌كه‌ن.**

**دواتر(علی باوه‌فه‌تی)یش برینه‌كانی پیسی ده‌كات ته‌داوی ناكه‌ن وشه‌هید ده‌بێت. به‌داخه‌وه شه‌هیدكان هه‌موویان شوێن بزركران و وه‌ك ئه‌نفالكراوه‌كان گۆڕگومكران.**

* سه‌رچاوه  یره‌وه‌رییه‌كی پێشمه‌رگه‌ی دێرین هه‌ڤال (حه‌مه‌مێمن)



# شەری قەڵای نارامسین

# شەری پارتیزانی دوای ئەنفال

**رزگار مستەفا پارتیزانی دوای ئەنفال،یەکێکە لەوهەڤاڵانەی یەکێتی لە تۆرەکۆمەڵایەتییەکاندا زۆر چالاکانە بیرەوەرییەکانی خۆی یاداشت کردووە دەربارەی شەرێکی پارتیزانی لە قەراغ و گەرمیان بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە :**

لە رۆژی ١٩٨٨.٤.١٦ توشی شەرێکی چاوەڕواننەکراو بوین، چونکە ئێمە هێزێکی تیکشکاو بووین و زۆربەمان لە مانگێك زیاتر لە شەرەکانی ئەنفالی ٢و٣ دا بەشدار بوین و دەمانویست بگەینە سنورەکانی٢١ کەرکوك و ٢٥ی خاڵخاڵان،بەڵام توشی ئەم شەرە بوین و پێشمانیشر گیرا بوو، زۆریش ماندوو ببوین. رۆژی ١٧ ی مانگ لە پشتی مالەکانی(قانزاقایە) ماینەوە، چەند پێشمەرگەیەك (سامی جافەرانی، شەهید تۆفیقی ئەحەی شەماڵ، لەتیف،ملازم بەختیار، شەهید شێخ کەریمی باخی سەرو) چوون رێگای دێلێژە کەشف بکەن ،ئەگەر جاش و سەربازی لێنەبێت لەوێوە برۆین، بەڵام بەداخەوە پڕبوو لە سەربازو جاش و هەردوو پ م (ملازم بەختیارو لەتیف ) بەدیل گیران و پێشمەرگەکانیش جاشێکی برای مستەشاریکیان گرت، جاشەکان لەتیفیان دیل بە دیل بەردا هەرچەند پ،م جاشەکەیان کوشت ...

پاش ماوەیەکی زۆر کاك ملازم بەختیاریش ئازاد کرا.

بۆنێوارە چوونە ناو دێکەوە، کە خەڵکەکەی چۆلیان کردبوو رژێم بە قۆناغ تەختی دەکردن، هەندێك لە برادەران نانیان حازر کردبوو بۆ هێزەکەو کە هاتینە ناو دێ، کاك (عومەر فەتاح) وەستا بوو من لە پێشەوە دەرۆیشتم ،ووتی کاك رزگار وەرە لام بۆستە و هەندێکی جیاکردینەوە نەمانزانی بۆچی بوو،بردینیە لای حەوشەیەك و گووتی هاورێیان من زۆر بروام بە ئێوەیە و کوڕی ئازان ،ئێمە لە نزیك داریکەلیەوە دەپەرینەوە بۆ ئەوبەرەوە ، ئێوەش ئەم ٢ برینداره‌مان لەگەڵ کاك بەهادین نوریدا بەرنەوە بۆ قۆپی قەرەداخ وچەند مەفرەزەیەکی تری لێیە، یەك بگرنەوە..کەی ئەوان چاك بونەوە ئێوەش وەرنەوە، بەراستی من و کاك رەزاق زۆرمان پێخۆش بوو، کە بمێنینەوە و ئەم دەڤەری قەراخە چۆل نەکەین وپێشمەرگایەتی دروست بکەینەوەو دەست بکەینەوە بە چالاکی،بریندارەکان پێیان ناخۆش بوو بەلام ناهەقیان ناگرم..

نانێکی باشمان خواردوپاشان دکتۆر فایەق گوڵپی ( بەراستی قارەمان و دڵسۆزو جوامێر بوو) هەندێك دەرمانی داینی و رێنمای کردین....

پاشان برادەرانی رێکخراوی ٤ ی کۆمەڵە ریز بوون و زۆر بێتاقەت بوون بۆ ئێمە و یەکە یەکە ئەملاو لایان ماچ کردین و قورگیان پڕببو لە گریان، پێیان ناخۆش بوو جیا ببینەوە دەبانویست لەگەڵیاندا بین، ئاخر کەس شەهید یوسف گەرمیانی ٨ جار ئەملاو ئەولای ماچ کردم ،وتی وەرە لەگەڵماندا بەخوا تۆو رەزاق سەرەڕۆن شەهید دەبن. دەترسم نەتان بینمەوە،باوەشی پیادا کردم،سەد مەخابن ئەوە دواین بینینمان بوو، دوو هەفتە دوای ئەو رۆژە لەدەشتی کۆیە لە ئەنفالی ٤ لەگەڵ وەستا تۆفیق دا شەهید بوو،. دەستەکەمان لەم پێشمەرگانەپێکهاتبوو:

١. عومەر غەریب ( لێپرسراوی دارایی مەلبەندی ١)

٢. حەمە رەوف   برای کاك عومەر غەریب . دارایی مەڵبەند) بریندار بوو

٣ . خالید ماوەتی (رێکخراوی ٤ی کۆمەڵە) بریندار بوو.

٤ . رزگار مستەفا (ڕێکخراوی ٤ی کۆمەڵە)

٥ . ڕەزاق حاجی ئەحمەد قەساب (ڕێکخراوی ٤ی کۆمەڵە)

٦. حمد مەهدی (ڕێکخراوی ٤ی کۆمەڵە) لە کۆی ١٤ سەر خێزان بەس خۆی ماوە و ٣ هەفتە لەوەو پێش هەموویان بە کیمیاویەکەی سێوسێنان شەهید بوون.

٧. فەرهاد گۆشانی تیپی ٥٥ قەرەداخ پاش دوو هەفتە شەهید بوو

٨. ستار چەمی سمۆری تیپی ٥٥ قەرەداخ و پاش ٢ هەفتە شەهید بوو

٩. بەهادین نوری سکرتێری حیزبێك بوو

١٠. عەلادین نوری برای ( بەهادین نوری)

١١. مەحمود هاووڵاتی تەکیە

١٢. شێخ عەلی هاووڵاتی تەکیە

دووهێستر ئامادە کرابوون بۆ بریندارەکان( خالید و حەمە رەوف) مەفرەزەکەمان بە پێچەوانەی هێزەکەوە کە بەرەو بازیان دەچوون ،ئێمە گەڕاینەوە بۆ هۆمەرامان کە ڕۆژی١٥ی مانگ سوتابوو،من هێسترەکەی خالیدم رادەکیشاولەپێشەوە دەڕۆیشتم، نیوەی شەو گەیشتینە خانوەیەکی بچووك لە بەردەم قۆپی سەرکۆ کە پڕ بوو لە فەردە گەنم لەسەر فەردەکان خەوتین و سەعات ٤ی شەو هەڵساین و بە ڕێگەی سەختی قۆپی سەرکۆدا بەسەرکەوتین، کە زۆرناخۆش بوومشکیلە هێسترەکان کۆپانەکانیان دادەماڵرا،کە دوو بریندارەکەیان لەسر پشت بوو ،ئەم ڕێگایە هەمان ڕێگا بوو کە ٢ شەو لەوەو پێش پیادا هاتینە خوارەوە ، بەسەدان مەخزەن و گولە ئاربیجی و تفەنگمان کۆکردەوە، کە هێزەکە فڕێی دابوو،بۆ بەیانی سەعات ٧،٢٠ گەیشتینە ناو قۆپی سەرکۆو بریندارەکانمان هەڵگرت و من و کاك ڕەزاق دەستمان کرد بە گەڕان لەناو دەوەن و بن بەردەکاندا،من ژمارەیەکی زۆر ئەلبوم و دەفتەری یادەوەریم دۆزیەوە کە هی فیرارێکی جافەران بوو، هەندێك وێنەم ناسیەوە کە ٢

برادەری خۆم بوون لە گەرەکی خەبات،تا مانگ ئاوابوون لەوێ بووین(ئەمرۆدوو شەمەی ١٩٨٨.٤.١٨بوو) بەناو قۆپیەکاندا بەرێکەوتین و بۆ شەو درەنگ گەیشتینە ناو قۆپی ئەستێل و زۆر ماندوو برسی بووین، لەسەر رێگا سەرەکییەکە لامان داو ئاگرێکی گەورەمان کردەوە(چومەناو کیسەخەوەکەمەوە)لێی خەوتین زۆر سەیربوو ئەوشەوە لەولای ئێمەوە دەستەیەك پێشمەرگە(شەهید مەلا ئەحمەد گەرمیانی، سوهاد خانەقینی،ماجید فەیلی) ودەستەیەکی تر مابوونەوە،بەڵام خۆیان کەشف نەکرد لامان. بەیانی زوو هەڵساین،رۆیشتین بۆ ئەولاترو لە بەرزی نێوان قۆپی ئەستێل و قۆپی(نارام سین)لە پشتی رێگاکەوە هەردوو هێسترەکەمان بەستەوە.

رۆژی سێشەمە ١٩٨٨.٤.١٩رۆژێکی ساردو ناخۆش بوو باران دەباری وخۆر نەبوو، زۆرمان برسی بوو، هەندیك خێمەی شوعیەکان لەوێ مابوون ،گەراین بۆ خواردن و هەندێك برنجمان دۆزیەوە،لێماننناو،بریندارەکانمان خستبووە ژێر نایلۆنیکەوە تا تەر نەبن،دووپێشمەرگەی تری بریندارمان دۆزیەوەئەوانیش(رزگاری عەبە هەورامی و شەهید شێخ عەلی چەقڵاوەیی بوون، کە لە ٥٥ ی قەرەاخ بوون و بەداخەوە پاش ٣ هەفتە کاك شیخ عەلی لەتانجەرۆ ئەنفالکرا)بەبینینان زۆر دڵخۆش بوون..

دوو قارەمانی کەم وێنەبوون کە لەشەرەکانی (شێخ تەویل)دا بریندار بوو بوون.

ئەوەی سەیر بوو هێزێکی زۆری(حیزبی دەعوە)لە قۆپی نزیك دەروار هەبوون، چاوەروانی ئەوە بوون کە ئێران بە هەلیکۆپتەر رزگاریان بکات.

برنجەکەمان خستبوە سەر ئاگر وابزانم هەر بە ئاو لێماننا بوو، بەبێ رۆن وخوێ. بارانیش نم نم دەباری،ئەوەندەمانزانی حەرەسەکانمان وتیان هێزێکی گەورەی دوژمن لە هەموو قۆپیەکانەوە بەرەو رووومان دێن.. ئێمەش بە پەلە تۆزێك برنجمان بە گەرمی خوارد . من خالیدم دا بە کۆڵمدا و هەردوو چەکەکەشم هەڵگرت و لەگەڵ ٢ بەتانیدا بەرەو شاخەکەی قەڵای نارام سین، کاك عمر غەریبش حەمە رەئوف برای

هەڵگرت و برادەران هێزەکەیان دابەش کرد،رزگاری عەبە هەورامی و شیخ عەلی کە بریندار بوون بەڵام دەیانتوانی برۆن. رەزاق و شەهید ستار و شەخ عەلی تەکیە و محەمەدی تەکیە بەرەو خوار رێگا.لەدامێنی شاخەکانی خوارەوە،من بە زوویی خالیدم بردو جارێکی تر گەرامەوە خوارەوە،وسامەکەی کاك سوهادو هەندێك دەرمان ویەك کۆمەل مەخزەن وئەلسووم وکۆمەڵێك کتێب و بەتانیم بردە سەرەوە،زۆر ماندوو بووم،خەریك بوو بێمەوە کۆمەڵێك شتی تر بەرمەوە سەرەوە.. بەڵام دەورم دەنگە دەنگی لێوە دەهات و بە راکردن چومەوە بۆلای خالید،محەمەدیش کۆمەڵێك تفەنگ و کەل و پەلی هێنابوو..ئێمە بریندارەکانمان بردە بن (قەڵای نارام سین) مامۆستا بەهادین نوری بەلای ئێمەدا سەرکەوتە سەرشاخەکە..کەزۆر بەرز بوو، لەگەڵ خۆیداشەهید فەرهادگۆشانی بردو پاش کەمێك شەهید ستارو کاك رەزاقیش سەرکەوتن. کاتێ ئێمەش ویستمان بریندارەکان سەربخەین بۆمان سەرنەکەوتن، بریارماندا لە شوێنی خۆمان بمێنینەوە کە من و کاك عومەرو محەمەد بوین ،خالید دەستی گرتم وتی کاکە مەهێلن بگیرێین ،خۆتان بمانکوژن..منیش ووتم دەبێت لای ئێوە بکوژرێین،مامۆستا عەلادینیش بەتەنها لەودیو ئێمەوە بوو،دوژمن بە رێگاکەدا دەرۆیشتن و بۆ ئەوەی پشتی هیزەکانی بەدر(دەعوە)بگرن،دوو جاش پێش هیزەکە کەوتبوون،یەکێکیان جلی رەشی لەبەردا بوو، ناوی شێخ رەسولی بەرزنجە بوو، چونکە جاشەکەی تر بەو شێوەیە بانگی دەکرد، کە تەواو دور کەوتبوەوە، لە پرێکدا هێسترێکیان پرمەی کرد و هیزەکە خۆیان دا بەزەویدا و پاشان بۆلای هێسترەکان هاتن و شتەکانی ئێمەیان بینی، سەریان سورما..

ئەوەی سەرنج بوو بەهارەکەی زۆر سەوز و گیا زۆر هەڵسابوو، دار تازە جرۆکانی دەبون بە گوڵی بچوك،ئێمە کە چەند جار بەویدا هاتوچۆمان کردبوو شوێن پێی ئێمایان هەڵگرت و بە شوین پێکەماندا هاتن،چونکە گیاکە شکابوو تەواو هاتنە

نزیکمان و بەعەرەبی قسەیان دەکرد، ئێمەش هەرسێکمان کە چەکمان پێبوو لەگەڵ ٢ بریندارەکە خۆمان خستبووە سەر ئەو کەندەو چوبوینە بن شاخە کەو زۆر چاومان لەپێشەوەمان نەبوو،بەلام ئەورێچکەیەی کەلیوەی هاتبوین (من ومحەمەد) کۆنترۆلمان کردبوو،کاك عومەریش دیوی ئەودیوی، لەلای ئەوەوە کەس نەیدەتوانی سەرکەوێت کەندەکەی ژێرمان بەرزیەکەی ٧ مەتر دەبوو..

دەنگەکە زۆر زۆر نزیك بوو، بەهێواشی خۆم بردە پێشەوەو سەیرم کرد تەنها ١٠مەتریك لێمانەوە دورن،هاتمە دواوە..

وتم کاك عومەر وا گیراین من تەقە دەکەم ،پاشان لەگەل محەمەدا چوینە سەر پێشەوەی رکەکەو سەیرمان گرت، زۆر ماندوو بوون و سەیری شەخەکەی پشت ئێمەیان دەکرد،نەیان دەزانی ئێمە لەوێداین،زۆربەیان چەکی دیکتارۆفیان پێبوو، من رەشاشێکی RBK ی مزەلیم پێبوو،برادەرانیش کلاشینکۆف وBKC ییەکەش لە خوارەوە لای برادەرانی تر بوو،سەعات ١٢،٥٥ دەقە بوو، من و محەمەد هەریەکەو نیشانی خۆمان دیاری کرد... ئا لەم ساتەدا هەموو تراژیدیای کیمباران و روخانی گوندو ئەنفالەکان ببوون بە پیرۆزترین رق و لەیەکەم دەستریژدا کەوتن بە زەویدا..

هەستاینە سەرپێ و بە ئارەزووی خۆمان تەقەمان لێکردن، ئەوەی شانسی ئێمە بوو دارەکان کەم بوون و بەردیش لەوێدا نەبوو تەنها گابەردێك نەبێت کە دوور بوو خۆیان لەپالدا حەشاردابووە، بۆماوەی (٣) چارەکە سەعات تەقەمان کرد،ئەوان بە هیچ شێوەیەك تەنها تەقەیەکیشیان نەکرد، بەلام پاش ماوەیەك لە ژێر تاوێرەکەی بەردەم ئێمەدا بەجیهاز و بەعەرەبی قسەیان دەکرد،دەیانگوت:

ئێمە ٣٢ شەهیدمان هەیە،ملازم(سعد خیون)شەهیدبووە..جاشەکانیش رایانکرد.. برادەرانی سەرەوەش کەوتنە تەقە. مامۆستا عەلادینیش هەر خۆی لەودیو تەقەی دەکردو پاشان کە دوژمن شکا کەوتن بەسەر ٤ پێشمەرگەکەی خورەوەو ئەوانیش

بە(BKC)و کلاشینکۆف لێیان دان.. جارێکی تر هێرشیان کردەوە، لەدورەوە کەوتنە تەقەو رێگامان دەدان تا نزیك ببنەوە بەلام کە قاچی جوندیە کوژراوەکانیان رادەکێشا و ئینجا لێمان دەدان و رایان دەکردەوە، پاشان کاك محەمەد و کاك عومەر ٧ رومانەیان فریدایە ژێر کەنەکەی خوارئێمەوە،کە ٣٧ قوەخاسەی تیا گیر خواردبوو،هاواری زۆریان لێهەلسا.. پاشان ٢ هەلیکۆپتەر هاتن بەرەو روومان بەلام لەبەر ئەوەی ئێمەو سەربازەکان تەنها ٧ مەترمان بەین بوو بۆیە تەقەیان نەکردو گەڕانەوە،پاشان نزیکەی(40) گوللە تۆپی نا بەشاخەکانی پسشت ئێمەوە و تاوێری زۆریان رووخان،بەلام لەئێمەوە زۆر نزیك نەبوو، پاشان سەربازەکانی ژێرشاخەکە زانیان کەس نیە رزگاریان بکات و خۆیان یەکەیەکە سەلیەیەکیان بەلای سەری ئێمەدا دەکردو رایان دەکرد بەلام ماوەکە نزیکەی ١٠٠ مەتر زیاتر دەبوو تا رای بکردایە ئێمەش بە ئاسانی دەمان پێکان.. لە ئاخیر کەسدا کەقەلەوێکی سمێل گەورەی رەشتالە بوو، جیهازە راکالە گەورەکەی لە پشت بوو، من بە فیشەکێکی گردار لێمدا، گڕی گرت و سوتا .ئەوە ئاخر کەسیان بوو...

ئیتر تارادەیەك تاریك بوو بوو. کە سەعات پێنج وچارەك بوو ،من سەرم سورما بوو، کە برادەران (ئەوانی سەرەوەش) بریندارەکانیان بە دیوی کانی گوێزەکەدا کشانەوەو من و کاك رەزاقیش پاشان دابەزین و فیشەکیکیان تەقاندو بەرەو رویان چوین وهەموو سەلامەت بووین،تەنها مامۆستاعەلادین دیارنەبوو،کە دوای ٢هەفتە دۆزیمانەوە......ئێمەش بەدەربەندی گەوڕدا(دەربەندی هەیکەلەکەی نارام سین)دا چوینەخوارەوە،بارانێکی زۆرلێیداین.من وکاك رەزاق کۆپانی هێسترێکمان دۆزیەوە و چوینە ژێریەوە و کاك عومەر دەیوت ئەوە هی خۆمە،دوایماوەیەکی کەم ئەو و مامۆستا بەهادین نوری چونە کونە گەچەکەی نزیك تەکیەو ومن و کاك رەزاقیش ئەو شەوە تا بەیانی لە ژێر ئەو کۆپانەدا بوین ،هەرچەن هیچ نەخەوتین،بۆ بەیانی

تەواو شەکەت بوو بووین، بەلاّم بەراستی ویژدانمان ئاسوودە بوو،سەلماندمان کە ژیانی کورد نەمرە لەکوردستاندا،بە تایبەتی دوای ئەنفالەکانیش...

دواتر ئێمە چەند رۆژێك لە نزیك معسکری سەر شیربانی تەکیە ماینەوە کە تەنها ٤٠٠مەتر لەوانەوە دووربوین،پاشان ماوەیەکی زۆر لە شاخەسافەکەی(لوتکەی نێلّ) لەپشتی تەکیە ماینەوە، زۆربەی کات نانمان دەست نەدەکەوت وهەموو رۆژێك لەسەعات ٥ تا ٧ی ئێوارە خۆمان دەشاردەوە، بەشەو دەردەکەوتین چونکە ناوچەکە هەمووی پڕبوو لە جاش و سوپای عێراق..

ئەمە یەکەم شەڕی پارتیزانی بوو کەنزیکەی ٦٠ بۆ ٧٠ قوات خاصەی تێدا کوژرا .. بەداخەوە پاش ماوەیەکی کەم ٣ لەو هاوڕێیانەمان شەهید بوون.

* سەرچاوە : نوسینێکی رزگار مستەفا



# بەرگری لە ئەنفالی سێ دا..

1988/4/ 11

**لە تۆمار ویاداشتکردنی رووداوەکانی قۆناغەکانی ئەنفال و تۆمارکردنی مێژووی پرسەروەری گەلەکەماندا هەرهاوولاتی وهەرپێشمەرگەیەك،هەرپارتیزانێك بدوێنی، هەگبە ورۆژمێری یادەوەرییەکانی پڕاو پڕە لە کەرەستەی مێژوویەك لە بەرگری و ئازایەتی وجوامێری ..**

**پارتیزانی دوای ئەنفال هەڤاڵ رشیدعلی(حەمەرشیدکوڵکنی)خاوەن گەنجینەیەکە:**

**. پێشتر بڕیار وابوو لە گوندی توکن سە نگەری خۆمان بگرین بو بە رگری کردن..**

**بەلأم کاك عوسمانی حاجی محمود کە فەرماندەی کە رتی ئێمە بوو ووتی گوندی توکن لە رووی هەڵکەوتەی جوغرافییەوە هە ر چوارلای بەرزییە و گوندەکە کەوتۆتە چالأیەوە و بەرگری کردن تیایدا زیانمان بەردەکەوێ،بۆیە بەیانی پێش خۆرهەلأت جووینە گوندی(عزیز قادر) کەنزیکە ی 3 کیلۆ مەتر لە گوندی توکنە وە دووربوو .**

**لە گوندی (عەزیز قادر) بە هەر چوار دەوری دێ دا دەستمان کرد بە کونکردنی خانووەکان بۆ مەتەرێز رێگای هاتوو چوونمان لە نیوان حەوشەکاندا کردەوە ، دیسان کاتژمێر 8ی بەیانی کاك عوسمان پێی ووتین بەزوویی لەگوندەکە دەرچن و بەم چەم وهەردە دا کەدەکەوێتە رۆژهەلأت و نێوان هەردووگوندی توکن وعزیز قادر بلأوببنەوە و سەنگەر بگرن**

**چاوەڕێ بووین بە زوویی دوژمن بگاتە سەرمان،ئێمە سەرمان سوڕمابوو لەم هەموو شوێن گۆڕکێ و دەرچوون وسە نگەر گرتن لە دە رەوەی گوند.**

جونکه ئەمه تاکتیکێکی نویٚ بوو لە بەر ئەوەی لە هەموو شەرەکانی سالآنی هەشتاکان دا لەگەلٚ دووژمندا تەنها گوند بەسەند بوو بۆبەرگری ودوژمن شکاندن، ئێمە بەم نهێنی یەمان نەدەزانی و برسیاربوو لای هەموومان،بەلاٚم دواجار بۆمان دەرکەوت هۆی شەهید بوونی شەهید نازم و هاوڕێکانی لە گوندی تازەشار بە هۆی ئابلوقەی دووژمنەوە بووە،هەلٚبژاردنی دەرەوەی گوند بۆ ئەوە بوو تا لەزەوییەکی زۆر و بەرفراواندا سەنگەر بگرین وبەرگری بکەین.. تاکو دوژمن بە ئاسانی نەتوانی ئابلوقەمان بدات،دوژمن کاتژمێر 9ی بەیانی گەیشتە گوندی توکن پاش 20 خولەك تۆبباران و دەستریژی گولله بەتانك وجاشەوە چوونە ناوگوندەکە وئاگر بەرز بووەو دووکەلٚ گوندەکەی داپۆشی،لەگەلٚ بەرزبوونەوەی ئاگردا ناخی من دەسووتا، ئاسان نییە لە شوێنکدا لە دایك بووبیت و ژیابیت هەزارو یەك بیرەوەری خۆشی منداڵی وهەرزەکاریتی تیدا بێت و لە پێش چاوت بسوتێت و تەختی زەوی بکرێت. وەك ئەوە وایە لە پێش چاوت دایکت بسوتێنن،ئەوەندە بەئازارو ناخ هەژێن بوو هەرکیز لە زاکیرە و شاشەی چاومدا ناسرێتەوە و بەچەند دێرێك ناتوانم ئەو هەستە دەربیرم ،ئەورۆژە سەدان جارئاواتی مەرگی خۆم خواست .

لە دەورو بەری کاتژمێر 9 و نیوی بەیانیدا شەربەتوندی دەستی پێکرد لە کاتێکدا کە گەلەجاشێك گەیشتنە نزیکمان و ویستیان بجنە گوندی عزیز قادرە وە باش لێدران و کوژرانی دەیان خوفروشی کەواسووری بەر لەشکری بەعس لێکەوتەوە.

شەر گەرم تربوو.. پەلامار لەسەر پەلامار دەشکینرا،تانکەکان لە بەرزاییەکانی رۆژئاوای گوندی توکنەوە خۆیان گەیاندە رۆژئاوای گوندی عزیزقادر وهاوشانیان، بەرزاییەکانیان لێگرتن..ئەوان لەبەرزی وئێمەچالی،جاشەکان سەدمەترێك لێمانەوە دوور بوون، شەرە جوێنیان لەگەلٚماندا دەکرد. وەك ئێستا لەیادمە من و رفیقی حاجی احمد بێکەوە لەپالٚ تەپەیەك دا سەنگەرمان گرتبوو،لە بەرامبەرمان گەلە

جاشێك هاواریان دەكرد دایكتان بۆكوێ دەچن،ئەمڕو هەردە تانگرین،پێیانموت: خائینی خۆفرۆشینە بەکرێگیراوی ئەلقە لەگوێ..وەرنەپێشەوە وائێمە لێرەین.. پێشمەرفینە جوێن بەدایك مەدەن دایك كوڕی وەك ئێمەی فیداكارو وەك ئیوەی خوفروش ئەهێنێ.باوەڕبکەن ئەوەندەبەرگری بەهێزیان دەکرد جاشێك بە چنچکەوە تەقەی لێمان دەكرد..

وتم كاك رفیق ئەم سەگبابە حیساب بۆ گوللەناكا ئێمە دەلێین پێشمەرگە قارەمان و چاونە ترسە ببینە چۆن تەقە دەکات. گوٶتم یا دەبێ بیکوژین یا دەبێ بمانکوژێ، منیش هەستامە سەرچنچك دووفیشەكم پێوەنا بەهوی بەرزی شوێنی تانكەكان ئێمە لەبەر دەستی بووین تانكێك یەك تۆپی بێمانەوەنا لەتۆز وخۆڵدا وون بوین، رفیق هاواری کرد بەر نەکەوتی ووتم سلامەتم، ئەم كارە تائێوارە دەیان جاردووبارە بووە وە،بە راستی كاك رەفیق حوامێرانەوخونەویستانە بەرگری دەكرد،چەند جار هەوڵیاندا بەدەورماندا بسوڕێنەوەو لەقوڵی گوندی هەزاركانییەوە ئابلوقەمان بدەن، بەڵام بەهۆی بەرگرییەكی قارەمانانە وبەربلاوی شوێنەكەوە شكان....

بەرگرییەكی بێ وێنە كرا ، پێشمەرگە خۆنەویستانە روو بە ڕووی هەزاران جاشی خۆفرۆشی چەشكراوی دزی تالانچی بەپاڵپشتی تانك ودەیان هەلیكۆپتەر بوونەوە.

كاتژمێر 6ی ئێوارە جاشەكان لە روژئاوای گوندی عزیزقادرەوە بەپاڵپشتی دەیان تانك و فرۆكەی هەلیكۆپتەر گەیشتنە ناوگوند...دوژمن زیانی زۆری بەركەوت .

زیانی ئێمە پێشمەرگەیەك بەناوی (فوادحبیب بەلەكەیی) لەكەرتی(6)شەهیدبوو.

كوڕێكی گەنج پێشمەرگەیەكی جوامێرو قارەمان بوو هەزار رەحمەت لەگۆڕی بێت.

پاش تاریك بوون كشاینەوە بۆ گوندی(عەلیانی گەورە) وشەهیدەكەمان لەوێ بەخاك سپارد.



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## بەختیاری مەلا عزەت :

بەختیاری مەلاعزت دوای بەرگری لە پەلاماری ئەنفال بۆسەر قەرەداغ لەگەڵ بەشێك لەمەڤالأن دەکەوێتەوە دیوی گەرمیان بزانین ئەوچیمان بۆدەگێڕێتەوە:

لەگەرمەی شەڕەکەدابوو بەجیهازبانگکراین بگەینە مەڵبەند هەرکە گەیشتینەئەوێ، پێیان وتین ئەم چەك وتەقەمەنییانە بگەیەننە گەرمیان،وەجبەی یەکەمی چەکەکانم گەیاندە ئاوایی کریچنە و تەسلیمی دەست مامۆستا(جەلال جەوهەر)م کرد، لەکاتی گواستنەوەی وەجبەی دووەمی چەکەکاندا لەپردەکەی کچان کەوتمەکەمینەوە و بریندارکرام ولەگەڵ سائقەکەدا لەیەك دابڕاین بەبریندارى خۆم گەیاندە بانی مۆرد لەوێ تیمارکرام.

1988/4/16.15ئاگاداری هەمووپێشمەرگەکانیان کردوە کە لە قۆپی قەرەداغ یەك بگرنەوە، مامۆستاعلی عبدالله وکاك عدنان و شەهید(برهانی حەمەی مینا) زۆر بە هەڵوێستێکی جوامێرانەوە توانییان بمگەیەننە قۆپی .

1988/4/17دا هێزەکان لەقازانقایە کۆبوونەوەونەخشەی کشانەوەیان کێشا. *

---

* بڕوانە کوردستانی نوێ /ژ 1519 لە1998/4/19



## مانەوەی پارتیزانەکان

**دوای ئەوەی هەڤاڵ عوسمانی حاجی محمودلەگەڵ 12پارتیزان،ڕوی لەهەردوشاخ ودۆڵەکانی گەرمیان دەکەن،بڕیاردەدەن لەگەڵ ئەو هەل و مەرج وڕۆژگارە ناخۆشەدا خۆیان بگونجێنن، دوای چەندین کۆبوونەوە و راوێژی هەڤاڵانە،بەرنامەی نوێ بۆ ئەوڕۆژگارەسەختە دارێژن،بە باوەڕێکی پۆڵاینەوە خۆیان لەجاران گورج تربکەنەوە. لەڕۆژی 1988/4/15لەهەڵەتەکانی گوندی(مەسۆیی)و(درۆزنە)خۆحەشاردەدەن، دەکەونە گەڕان بەدوای ئاوەدانی دا، هەتا لەڕێی ئەوانەوە هەواڵی جەماوەرەدڵسۆزو شۆڕش پەروەرەکەی گەرمیان بزانن...لەدواین ڕۆژی شاڵاوی ئەنفالی گەرمیاندا کەڕێکەوتی20ی نیسان بوو.بەڵێنی هاوکارییان بەیەکتردەدەن..کە(مەلاسەعید احمد و سید محمد و هاوڕی موکەڕەم و کاك محمود B.K.C و احمد زەرداوی و چەند هەڤاڵێکی تر)دەبن،لەوی دڵنیا دەبنەوە کەڕژێم توانی بووی لەماوەی20ڕۆژدا خەڵکی گەرمیان پەرتەوازە وسەرگەردان بکات، دەیان هەزار کەسی ئەنفال بکات ئەوانەیش کە دەرباز بووبوون ڕوویان کردبووە شار وئۆردوگاکان. بۆئەوەی شۆڕش و گەل وپێشمەرگە بەشاڵاوی ئەنفالچییەکان لێك نەکرێن..**

**. لە1988/4/27کاك عوسمان حاجی مەحموود لەگەڵ دووپارتیزانی تردا ڕوولە ئۆردوگای (صمود) دەکەن.ئەویش بۆ دوومەبەستی سەرەکی:**

**1. بۆ دڵنیا بوون لەچارەنوسی ئەنفالکراوەکان**

**2 . پە یوەندی کردن لەگەڵ هەڤاڵانی ناوشار**

**لە دوای گەڕانەوە بۆلای پارتیزانەکان،هەواڵی دەستەکەی شەهیدسەیدجەوهەر و کاك شێخ کریم وەردەگرن.**

# وەرگرتنی هەواڵی کاک حەمەڕەش

. لە5/1/1988لەگوندی(ڕەمەزان مامکە) یەك دەگرنەوە.

ئیتر پاش چەند کۆبوونەوە، سەرلەنوێ بڕیاری مانەوە لەگەرمیان نوێ دەکەنەوە، بەرنامەی ڕێکخستنەوەی پارتیزانە دابڕاوەکان دادەڕێژنەوە،دەکەونەکۆکردنەوەی وشکەخۆراکی گوندە وێرانەکان ولەچەند حەشارگەیەك دەیانشارنەوە،شەپۆلی بێتەلەکانیان پێکەوەگرێ دەدەن..ولە24سەعات کاتێك دیاری دەکەن بۆپەیوەندی.

لە ڕۆژی3/5/1988هەواڵی کاك (حەمەرەش) وەردەگرن ولەگوندی (شێخ مستەفا) دەگەنەوەبەك ،جگە لەمناڵەکانی خۆی ئەم هەڤاڵانەشی لەگەڵدادەبێت( شێخ تەها، سالارشێخ تەها، حمەپاریوڵە، عمرسەنگاوی، هونەر، کاك اکرم،کاك خەباتەسوور، رزگار رەوف بیگەرد وچەند ژن ومناڵێکی گەرمیانی) لەوێ تەگبیر ورای خۆیان دەکەن،بەهۆی ئەو جیهازە(ڕاکاڵ)ەی لەلای کاك(حەمەڕەش)دەبێت.پەیوەندی بەکاك (فەریدون عبدالقادر)ەوە دەکەن،هەر لەوێ هەواڵی ئەوەیان پێ دەگات کەقۆناغی (ئەنفالی جوار) بۆ سەر ناوچەکانی سنوری تیپی 21ی کەرکوك و25ی خالخالان و دەشتی کۆیە وشوان وشێخ بزێنی وساڵەیی وقەلاسێوکە دەستی پێکردووە، لەگەڵ ئەوانیشدا حیهازەکان بەیەك دەبەستنەوە، هەتا ڕۆژانە ئاگایان لەیەکتر هەبێت

ڕۆژی 8/5/1988 لەنزیك گوندی(قەواڵی) لەگەڵ هەڤالان سیدجوەرو سید محمد و کاك شێخ کریم و...یەکتری دەبینییەوەو بەرنامەی نوێ دیاری دەکەن..

بۆسێیەم جار لەڕێکەوتی 8/6/1988 لەنزیك گوندی قوڵی خان کۆبوونەوەیەکی تر پێکدەهێنن و هەموو بەڵێن نوێ دەکەنەوە کەتادواهەناسە(گەرمیان)چۆڵ نەکەن.. هەرلەوێ را بروسکەیەك بۆکاك نەوشیروان مستەفا بەرێدەکەن ئەویش بەم بروسکەیە وەلامیان دەداتەوە:

---

لای ڕاستەوە، ئاراس شێخ جناب، لوقمان چاوڕەش، هەڤاڵ مامۆستا جلال شێخ کریم، جلال شەممەیی

**لە/ نەوشیروان مستەفا**

**بۆ/ کاک حمەڕەش *و کاک عوسمان وکاک عدنان وکاک سید محمد و باقی برادەران**

**سڵاوێکی گەرم ......**

**1 ـ هیوادارین خۆڕابگرن وهەوڵبەن پارێزگاری لەخۆتان وهێزەکانتان بکەن.**

**2 ـ پێویستیەکانتان بۆجێ بەجێ دەکەین، ئاگادارمان بکەن چیتان پێویستە.**

**3 ـ هەوڵ بدەن ئازوقەو تەقەمەنی لەشوێنی ئەمیندا کۆ و پارێزگاری بکەن.**

**4 ـ بەم نزیکانە لێپرسراوی باشتان بۆدەنێرین ،هێزەکانتان بەپێی هەلومەرجی نوێ ڕێک دەخەینەوە.**

**5 ـ مشوری دکتۆرو دەرمانتان بۆدەخۆین.**

**6 ـ مشوری ئازوقەو پێویستی ترمان خواردوە بۆتان دابین دەکەین.**

هەرهەمان ڕۆژ بەپێ ی شارەزایی هەڤاڵان دەستەکان

بەسەر ناوچەکانی گەرمیاندا دابەش دەکەن بەم جۆرە:

*کاک حمەڕەش سەرپەرشتیاری دەوروبەری سەنگاو و ئاشداخ.

* کاک مەلا احمد و سیدمحمد وکاک عد نان حمەی مینا بۆ باوەنور.

* کاک عوسمانی حاجی محمود ومەلاسعید ومام جەلال مەسۆیی وکاک حمە ئاخە و کاک احمدی حاجی ڕشید وکاک عوسمان تلیشانی وهەڤاڵە پارتیزانەکانیان بۆ هەردوو بەری (ئاوەسپی)

*کاک سیدجوەروکاک شێخ کریم چاوڕەش وهەڤاڵەکانیان

بۆدەوروبەری (تەکیە)و (بەگزادە) و (حسن پرچن).

جگە لەم دەستەو مەفرەزانە چەندین دەستەی ترلەسنوری قەرەداخ وگەرمیان و چەمی ڕەزان وشوان وشێخ بزێنی و بناری خاڵخاڵان ودەشتی ساڵەیی دەمێننەوە.



# کۆبوونەوەیەك لە خۆشناوەتی

* لە 1988/7/25

بەستنی کۆبوونەوەیەکی فراوانی هەموو سەرتیپ و رابەر سیاسی و لێپرسراوی رێکخستن و کادیرە پێشکەوتووەکانی(ی ن ك)لە مەڵبەندی( 3)پێك دێت، لەو کۆبوونەوەیەدا گفتوگۆ لەسەر نامەیەکی ئاراستەکراوی نەوشیروان مستەفا بۆ کۆبوونەوەکە دەکرێ، نامەکە دەربارەی ئەوەدەبێ کە شەڕی بەرەیی زیانی زۆری بۆ( ه پ ك) تێدایە و پێویستە لەداهاتوو لە سەرانسەری کوردستانداشەڕی پارتیزانی دەست پێ بکرێت.

سەرچاوە: هاورێنامە بۆ مێژووی کوردستان و کورد / هاورێ باخەوان

. چاپی یەکەم بنکەی چاپ و پەخشی سەردەم / سلێمانی / 1999.

# نامەی کاک حەمەڕەشید باریکە( گۆیژە ) بۆ کاک حەمەڕەش

هاوڕێیان (شێروانە)

بەڕێز سلاوێکی شۆڕشگێڕانە

هیوامان سەرکەوتن و بەردەوامی خەباتە بۆهێناە دی ئامانجەکانمان

هاوڕێی هێژا نامەی 7/15 تان گەیشت وسوپاستان دەکەین.

کەنامەکەتان گەشت(......) نامبارەك خۆی تەسلیم کردبۆوە لێرە بەخۆی (....)وە و دەوری (30) پ.م ی لەگەڵ بوو..نیازەهەیە لێرە مەفرەزەی خاصەی بۆبکەوەوە و بینێرنەوە ناوچەی قەراخ.

* ناوەندی بەڕێزمان ئاگادارکرد لەپێویستی کەل وپەل و یارمەتی تان بەم زووانە بۆتان جێ بە جێ دەکەین.

* ناوەندی بەڕێز ئاگاداری کردین کە کاك ئازاد لەگەڵ کۆمەڵێك پ.م دێنەوە ناوچەکەتان و بەرێ کەوتوون..تکایە لەگەیشتندا زوو نامەیمان بۆبنێرن هەتا هاوکاری لەگەڵ بکەین.

* دەنگ وایە کە (...) تەسلیم بووبێتەوە ...گەر وایە ئاگادارمان بکەن..

* تکایە نامەیەکمان هەیە بۆ کاکەڕەش بەزوویی پێی بگەیەنن..

وەلامەکەی مان بۆ بنێرنەوە زۆر سوپاستان دەکەین.

* دەنکوباس بەگشتی خراپ نییە باری عێراق زۆرخراپە،سەرکردایەتی و بەرە کۆبوونەوەی هەمە لایەنە وبەربلاویان کردووە بۆ هەڵسەنگاندنی هەموو ڕووداوەکان وهەموو ئیختیمالەکانی وەستانی شەڕ..خۆیان بۆهەموو احتمالێك ئامادەکردووە.بەگشتی باریان باشە و ئومێدیان زۆرە دوژمن لەپەلەقاژەی مەرگدایە. . گۆرانکاری سەیر و کتوپڕ بەڕێوەیە و بەعس زۆرشپرزەیە..

* بلاوکراوە لەبەر ڕێگە خراپی ناگاتە لامان..

* تکایە پێویستیەکان تان بەجۆر و ژمارە تحدید بکەن تا لەداهاتودا جێبەجێی بکەین.

و هەرسەرکەوتوبن

گۆیژە

1988/8/4

## کێومالێکی تر:

1988/8/ 6 کۆتایی بەماوەی لێبووردنەکەدێ،هەر ئەو ڕۆژە هێزەکانی ڕژێم چڕتر لەجارانی پێشوو دەکەونە کێومالکردن..بەمەبەستی هەراسانکردن وکوشتن و ڕاونانی پارتیزانەکان،بەلام خەیالیان خاودەکەنەوە ،ورەو بیرو باوەڕی پارتیزانەکان لەپیلانەکانی ئەوان بەهێزتردەبێت.مانگی ئۆکتۆبەر جیا لەمانگەکانی تر،بەردەوام هێزەکانی سوپاوجاش بەپیادە وبەکۆپتەر،کێومالی گەرمیانیان دەکەن.



## گەڕانەوە بۆ گەرمیان

. ڕۆژی 22/8 1988 هەڤالان ئازادی سەگرمە وکاک ئەردەلان وکاک سەلام رسول وکاک بەکرە کەر ومەریوان حاجی حسێن لەگەل دەستەیەک پێشمەرگە دەگەڕێنەوە بەرەو گەرمیان.دوژمن لەڕێی دەزگاسیخوڕیەکانییەوە بەگەرانەوەی ئەم پۆلە پێشمەرگەیە دەزانێ وزۆرنیگەران دەبێت هەربۆیە پێش گەیشتنی ئەوان

لە 19 .24/8 1988 بەردەوام دەبێت لە کێومالکردنی گەرمیان.

لەولایشەوە بەڕێز کاک (ئازادی سەگرمە) وەک لێپرسراوی سنووری مەلبەندی یەک دیاری دەکرێ.لەگەل خۆی دا نامەی هەڤالان کاک نەوشیروان وکاک کۆسرەت وملازم عمر عبدالله بۆ ئەو مەبەستە بۆ هەڤالان دەهێنێ..

## پارتیزانەکان و چەند چالاکییەك

. ڕەتڵەکەی کاك عوسمانی حاجی محمود شەوی 19/18ی 1988/9 بەچەکی (R.P.G) پەلاماری ڕەبیەکانی سەر کوورە گەچەکانی شاری (کفری)دەدەن، لەئەنجام دا (4) سەرباز دەکوژرێن، کەیەکیان ناوی(مشعل خدر)دەبێ،ڕەتڵەکەی کاك ئازاد وکاك حەمەڕەش لەشوێنی کۆنی مەڵبەندی یەك پەلاماری هێزەکانی ڕژێم دەدەن و چالاکییەك ئەنجام دەدەن... .

## هەندێ لەهاوکارانی پارتیزانەکانی گەرمیان

1 . صدیق سعید احمد (سوپا) 2 . جلال عبدالله محمد (سەردار)

3 . محمدمحمود امین (خەلیفە) 4 . انورصمد عبدالرحمن (کارێزی)

5 . نوری سعید احمد (برای سوپا) 6 . إسماعیل إبراهیم مەردان (سامی)

7 . کامەران عبدالله محمد(کامەران) 8 . مجید قادر علی ڕەباتی

9 . نازم محمدسلیمان 10 . تەها مەلارەشید

دوای گیرانی هاوڕێ محمدرحیم حسن(شەماڵ)وئاشکرابوونی،هاوڕێیانی گەرمیان یا خۆیان حەشاردا،یاخۆ پەیوەندییان بە پارتیزانەکانەوە کرد کەبریتی بوون لە :

1. شەهاب احمدمحی الدین (هەژار) 2 . محمد حمە امین شەربەت

3 . حمە امین شەربەت سەرقەڵایی 4 . فایق حسن احمد سەرقەڵایی

5 . هاوڕێ نەریمان کەلاری 6 . خلیل إبراهیم احمد کارێزی

7 . احمد شەوکەت ڕۆستەم 8 . سەرگوڵ علی (هاوسەری سوپا)

9 . محمد وەلی (خاوەن دەواجنی حمەی وەلی)

## هاوکارانی پارتیزانەکان لەسنووری بازیان

1 . حسن محمد (نەسرەوت) 2 . عمرمحموداحمد(پیرۆت)

3 . تاهیر محمد (نەوزاد) 4 . صباح محمد (ئەرسەلان)

5 . عبدوڵلا صابر ڕەشید 6 . عوزێر محمد (هەڵمەت)

7 . ئەرکەسین احمد(نەسرین)

# هاوکاری پارتیزانەکان
## لەسنووری هۆزی زەنگنە



## حاجی کریم قادر
## سەرۆکی تیرەی زەردی لە عەشرەتی زەنگنە

هەرچەند پارتیزانەکان خۆیان و بەپاڵپشتی ڕێکخستنەکان هەتا بڵێی بەمشوور و ئازابوون بۆ خۆ ژیاندن و رازی بوون بەو ژیانە سەختەی خۆیان هەڵیان بژاردبوو. بەڵام هەر ئەوەندە هۆکاری مانەوەو درێژە پێدانی خەباتەکەیان نەبوو.ئەوجەماوەرە دڵسۆزەی بەرلەئەنفال شۆڕشیان لەئامێزگرتبوو، دەسبەرداری ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی خۆیان نەبوون. حاجی کەریم زەرداوی پێشتردانیشتووی ئاوایی(دوانزە ئیمام)دەبێ پیاوێکی شۆڕشگێڕ وتێکۆشەروبەهەڵوێست بووە،لەمێژووی ژیانیدادرێغی نەکردوە بۆخزمەت بەنەتەوەکەی، دەیان جارژیانی خۆی وکەسوکاری خستۆتە مەترسییەوە لەشەستەکان پێشمەرگەی حزبی شوعی عێراق دەبێت ـ لە دوای هێرشی ئەنفال و ڕۆخاندنی گوندەکانی کوردستان کۆڵی نادات و،هەمیشە بێ گوێدانەهیچ مەترسیك هاوکارو پشت و پەنای پارتیزانەکانی گەرمیان دەبێت،چەن جارێك گومانی لێ دەکەن .. بەڵام زیرەکانە کارەکانی خۆی جێبەجێ دەکات.

# هاوکاری پارتیزانەکان لەسنووری دەربەندیخان

1 . حەمەرشیدشەریف (کامیل)

2 . حەمەعەلی حەمەساڵح (شەمماس)

3 . صدیق عوسمان معروف (شاهۆ)

4 . ئەحمەد کوڵکنی ( تەیموور)

5 . صالح حەمەخان کەریم*

6 . نوری حەمەخان کەریم

7 . مجید حەمەخان کەریم

8 . واحید حەمەخان کەریم

9 . یەحیا احمد حەمە

10 . عەلی قادر فەتاح

* صالح حەمەخان کەریم وئەوپێنج چەکدارەی لەگەڵی بوون ئەندامی رێکخستن بوون. بەئاگاداری ورەزامەندی چەکیان هەڵگرتبوو،لەناوچەی هەنارە دەبن رۆڵی باشیان دەبێت لەهاوکاری پارتیزانەکان.

# چەمی لاهێز و پەلاماری ڕۆژی 1988/10/11

بەپێی بیرەوەریبەکانی کاک عوسمانی کاک عوسمانی حاجی مەحموود کە لەچەند چاوپێکەوتنێکدا لە سایت و گۆڤار و ڕۆژنانەکان بڵاوبوونەتەوە شەوی 10 لەسەر 1988/10/11، کاک ئازادی سەگرمەو شەهیدحەمەڕەش‌و کاک ڕۆستەم، لەگەڵ ژمارەیەك فەرماندەو کادرو پێشمەرگە لەیەکێك لەکەلۆزەکانی (ئەشکەوتەکانی) چەمی لاهێز دەبن، ئەو جێگایە دەکەوێتە قولایی گەرمیان لەنێوان گوندەکانی فەقێ مستەفا، کەلۆز لوقمان، هەردو قولیجان هەمان شەو کاک عوسمان ودوو پێشمەرگە دەگەنە لایان.

سەر لەبەیانی 1988/10/11 بەئاراستەی داری خلە بەڕێدەکەون، دەبینن کاك ئازادی سەگرمەو شەهید حەمەڕەش‌ومام ڕۆستەم و برادەرانی تربارگەو بنەیان پێچاوەتەوەولەچەندولاخێك باریان کردوون،ولاخەکان ئێسترو ماین‌و گوێدرێژ دەبن. دەیانەوێ بەئاراستەی چەمی ئاوە سپی بڕۆن،هەردو لایان بەدو ئاراستەی پێچەوانە دەڕۆن پاش ماوەیەك لەناکاو چەند هەلیکۆپتەرێك پەیدادەبن، دوای چەند جارێك سورانەوە تەقە لە کاك ئازادی سەگرمەو برادەران دەکەن،شەڕوبەرگری دەستیپێدەکات،بەلام شەڕێکی نا بەرامبەرلەئەنجامی شەڕەکەدا سێ پێشمەرگە شەهید دەبن:

1. شەهید شێرکۆ جدی
2. شەهید مهندس هەڵکەوت
3. شەهید شێرزاد عەریف ڕەمەزان

کاک ئازادی سەگرمە بەسەختی بریندار دەبێ و قاچێکی دەشکێ، کاک تەهای برای کاک ئازادو کاک سەرکەوتی پورزای و کاک سامالٚ رەحیم کاکەولآ بریندار دەبن، برینی ئەم سیانە تا رادەیەك سوك دەبێ. هەلیکۆپتەرەکان بۆ ماوەیەك ئاسمانی ناوچەکەبەجێدێڵن بەئاراستەی سەنگاوو چەمچەماڵ دەڕۆن، لەو ماوەیەدا کاک ئازادی سەگرمەو بریندارەکانی دور بخرێنەوە، پاش ماوەیەك جارێکیتر دێنەوە، ئەمجارەیان 8 هەلیکۆپتەر دەبن، دوی شەرکەرو شەش دانەی حەماڵ. دەچنە سەرمەیدانی شەرەکەوهێزی تایبەت وجاش دادەبەزێنن،تەرمی شەهیدەکان و باری وڵاخەکان دەبەن،لەوشەرەدا دوژمن زیانی دەبێ، ئەم زانیاریە پاش راپەرین بەهۆی دەسکەوتنی بەڵگەنامەیەکەوەئاشکرادەبێ،بەڵگەنامەکەلای کاک ئازادی سەگرمەیە. لەبەڵگەنامەکە نوسراوە عەمیدی روکن(ئیسماعیل عەبدولقادر جەبووری) لەوشەرەدا کوژراوە، کە فەرماندەی هێزی پاراستنی کەرکوك بووە.

هەر بەو هۆیەش هەلیکۆپتەرەکان بۆ ماوەیەك ناوچەکەیان بەجێهێشتووە.

بۆ کاک ئازادی سەگرمەو بریندارەکان لەوکاتەدا هیچ دەرمانو کەرەستەیەکی پزیشکییان لانابێ، بەتایبەت برینەکەی کاک ئازاد قورس و ئێسك شکان دەبێ.. سەر لەئێوارەی 11 لەسەر 12 1988/10 کاک عوسمان وشەهید حەمەرەشو کاک رۆستەم و پێشمەرگەکان، کاك ئازادی سەگرمەو بریندارەکانی تر دەگوازنەوە بۆ حەشارگەکەی کاک مەلا ئەحمەدو کاک سەید محەمەدو کاک عەدنان حەمەی مینا، لەنزیك دێی حەمەی عەبدلکەریمە سورە سەر بەناحیەی باوەنور، ئەم گواستنەوەیە بەشەوو بەناوچەیەکی هەردەو هەڵەتدا، بەو هەمو برینەوە زەحمەتیو ئازارێکی بەسوێ دەبێ بۆ کاک ئازاد. بەڵام ئەوەی کە پێویستە بووترێت کاک ئازادی سەگرمە وەکو هەمیشە نمونەی خۆڕاگریو جوامێریو خاوەن ئیرادەی بەهێز دەبێ.

کاتێك دەگەنە لای برادەران ، کاك عەدنانی حەمەی مینا جانتایەك پڕ دەرمان و پێداویستی پزیشکی لادەبێ، خۆشی هەندێ شتی سەرەتایی دەزانی لەچۆنیەتی بەکارهێنانیان.بەپێی توانا کاك عەدنان برینەکانی کاك ئازادی سەگرمە پاك دەکاتەوەو دەیبەستێ، هەروەها بریندارەکانی تریش تیماردەکات، پاش چەند رۆژێك ڕێکخراوی شار کاك شێخ سدیقیان بەدەرمانەوە دەنێرن، کاك شێخ سدیق فەرمانبەری تەندروستیو ئەندامی کۆمەڵە دەبێ، بێگومان هاتنی لەوکاتەدا کارێکی ئازایانەو خۆنەویستانە دەبێ،کاك ئازاد بەوشێوەیە بۆ ماوەی 26 ڕۆژ دەمێنێتەوە.

لەشەوی 8/7 1988/11 لەدەواجنەکەی کاك حەمەی وەلی، بەهۆی برادەرانی ڕێکخستنەوە دەیگوێزنەوە بۆ شاری سلێمانی، لەو سەردەمە دژوارەدا کاك حەمەی وەلی دەواجنەکەی جێگایەك بووە بۆ ئەنجامدانی پەیوەندی نێوان پارتیزانەکانو ڕێکخستنی شار، هەر بەو هۆیەوە دواتر دەیگرن و زیندانی دەکرێ، ئەو دەواجنە دەکەوتە نێوان (دەربەندیخان ـ باوەنور)ەوە،نزیك چەمی سیروان.

* سەرچاوە : ڕۆژنامەی ئاوێنە / کۆتایی تەمموزی 2015

## ـ ئازاد محمد غریب عەبدوللا (ئازادی سەگرمە)

. لەساڵی 1951 لەگەڕەکی سەرشەقامی سلێمانی لەدایك بووە.

. ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بووە.

. رۆژی 19/7/1976 لەگەڵ هاورێیان(سالارعزیز و جەمالی عەلی باپیر و تایەری شێخ صدیق )

رووده‌کەنەشارباژێر و پەیوەندی بەهێزی پێشمەرگەوە دەکەن..

. یەکێك لەفەرماندەی خاوەن ئەزموونی رۆژە سەختەکانی شۆڕشی نوێ بووە.

. لە 1983 سەرتیپی (57)ی سەگرمە بووەو بارەگای لەگوندی (مێولێ) بووە

. لە 11/10/ 1983 دا لەگەڵ (80)پ.م مەخفەری پۆلیسی سەنگاو دەگرن.

## لەقاسمە رەشەوە بۆ گەرمیان

دوابەدوای ئەنفالی سێ وکشانەوەی زۆربەی پێشمەرگەکانی گەرمیان بەرەوسەر سنووری مەڵبەندی 3 ی هەولێر و ناوچەی خۆشناوەتی ..

کاك ئازاد چاوی دەکەوێ بە بەڕێزان کاك کۆسرەت وملازم عومەروچەندهەڤاڵی تر، پێیان دەڵێ:((دەمەوێ هێزێکی تایبەتی پێکبهێنم وبگەڕێمەوەبۆسنووری گەرمیان و سنووری سەگرمە،ئەوانیش پێی دەڵێن:بگە لای کاك نەوشیروان لە قاسمەڕەش و ئەومەسەلەیە لەگەڵ ئەو یەکلابکەوە..بەخێرایی بەڕێ دەکەوێت، لەوێ هەڤاڵان، نەوشیروان مستەفاو فەرەیدون عەبدولقادرو شەهید ئازاد هەورامی و مام رۆستەم دەبینی،ماوەیەك پێکەوە دەبن،دواتر دەچنە گوێزێ، رۆژێکیان کاك نەوشیروان رووده‌کاتە مام رۆستەم وکاك ئازادی سەگرمەو پێیان دەڵێ:

(ئێوەکوڕی رۆژە رەشەکانن،ئێستا دەبێ وەك دوو لێپرسراوی سیاسی وعەسکەری رووبکەنە مەڵبەندی (یەك)و(دوو) بۆکاری پارتیزانی..) باسی چۆنیەتەی پێکهێنانی هێزەکان دەکەن.کەهەر دەستەیەك لە(20)پارتیزان زیاتر نەبێ و (B.K.C وR.B.Gو

قەناسێك وجیهازێك وچەكی بچووكیان پیّ بێت ، جفرەیەكی تایبەتی بۆ پەیوەندی نێوان خۆیان وپارتیزانەكانیش دادەنێت..

لە 20/7/ 1988 كاك نەوشیروان نامەیەكی تایبەتی دەنووسیّ بۆ رێكخستنەكانی ناوشار (كەدەبیّ هاوكاری تەواوی شەهید حەمەڕەش ئازادی سەگرمە بكەن) پێیان دەڵیّ:(جیهازێكی راكاڵمان لەماڵی شەهید جەباری حاجی رەشیدی لێپرسراوی رێكخستنی ناوشار حەشارداوە. ژمارەی تەرەدودی جیهازەكەیان پێدەداو پێیان دەڵیّ:(لەكاتی زۆر پێویستدا دەتوانن چیتان بویّ بیڵێن و بۆتان جێبەجیّ دەكەن، لەوێوە بروسكەیەك دەكەن بەلاّم ئەو وەلاّم ناداتەوە، بۆئەوەی دوژمن پێی نەزانیّ).

. كاك ئازادی سەگرمەو دەستەكەی، مام رۆستەم و (12) پ.م ماڵئاوایی لەبرادەران دەكەن وبەرەو (تاتی دۆ) دەكەونەڕیّ..

شەولەقەندیل دەمیننەوە بەیانیەكەی دەگەنە نزیك (سوورەدیّ) كاك عومەر فەتاح لەویّ دەبیّ، پاشان رێگا دەگرنەبەرو ئیوارەكەی دەگەنە سنووری (دۆڵە رەقە)....

كاك عوسمان بچكۆل توشیان دەبیّ جیهازێكی بچووكی پیّ دەبیّ، شەو لایان دەمیننەوە، ئیوارەی رۆژی دوایی عوسمان بچكۆل وەك شارەزایەك لەگەڵیان دەڕوا، لەپەڕینەوەدا شەهید عەلی نەبی هاوكارییان دەكات، شەوەكەی دەگەنە گوندی (گولاّن) لەدامێنی چیای (ماكۆك) ولەشاخەكەدا دەمێننەوە، پاشان رێگادەگرنەبەرو بەیانی زوو دەگەنە چیای (كەژۆست)، كاك سیروانی كوێخا نەجیم وبرادەرانی تیپی (25)ی خاڵخالاّنی لیّ دەبێت لەوێوە روو دەكەنە بارەگای مەڵبەندی (3)هەولێر كاك كۆسرەت ومولازم عومەرو شەهید حەسەن كوێستانی و شەهید عەبدولڕەزاق و ماموّستا چەتۆ لەویّ دەبن. چەند رۆژێك لەویّ دەمێننەوە، لەدواییدا بەرەو دۆڵی سماقوڵی بەرێدەكەون، مام رۆستەم لەویّ دەمێنێتەوە، شەو بەنهێنی لە جادەی هەولێر. كۆیە دەپەڕنەوە بۆ دەشتی كۆیە،بەگوندەكان وێرانەكاندا تێدەپەڕن

شەوەکەی بەریّ کەون بەرەبەیانیەکەی دەگەنە ناوباخێك پاشان، نیوەڕۆکەی ڕێگا دەگرتە بەر ئێوارەکەی دەگەنە (هەردەو هەڵەتەکانی ئۆمەرگومەت وسیێگردکان.. کۆمەڵیّ سەربازی هەڵاتووی لێدەبێت،کە پارتیزانەکان دەبینن سەریان سوڕدەمینیّ، پێیان دەڵێن (پێشمەرگەکان دەگەڕێنەوە بۆ سنوورەکانیان، شۆڕش بەردەوام دەبیّ، زۆریان پێخۆش دەبێت)دەکەونەڕیّ بۆ ئێوارە دەگەنە قەراغ زیّ، کەڵەکە وانەکان لەویّ نابن، کەڵەکەکانیش نادۆزنەوە، ئێوارەی ڕۆژی دوایی دەچنەوە سەرزیّ، مام (لاوە کوێخابابە) بەکەڵەکەکەی دەیان پەڕێنێتەوە ئەوبەر،وەستا سابیرو کاکەمەندو چەندبرادەرێکی تردەبینن، هەردەستەیەکیان لەگەڵ شارەزایەکدا خۆحەشاردەدەن، بەیانییەکەی کاك سیروانی کوێخا نەجیمو کاك مستەفاچالآوایی وشەهید سەرکەوت و خەلیل بێدەری وشەهید ئیباو و علی ناروجەیی و خلیل تۆماری تاگوندی (باوە فەتیّ بەرێیان دەکەن،شەوەکەی لەجادەی کەرکوک - سلێمانی دەپەڕنەوە، تاریك و لێڵی بەیانی دەگەنە هەردوو تاوێرەکانی گوندی (چاڵگە)ی ناوچەی هەمەوەند، تا ئێوارە لەویّ دەمێننەوە،دواتر لەجادەی سەنگاو. قادرکەرەم دەپەڕنەوە بۆ گەرمیان.

## هێزەکەی گەرمیان وقەرەداغ دەکرێن بە حەوت مەفرەزەی پارتیزانی

لە 1988/8/23 لەگوندی(خان)ی نزیك ئاوەسپی لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی مەحموددا یەك دەگرنەوە،بەجیهازو نامە ئاگاداری پارتیزانەکان دەکەنەوە کەبگەنە ئەشکەوتەکەی (چەمی قامیشەخان) بۆ کۆبوونەوە (پاشان شەهید حەمە ڕەش، شەهید سەید محەمەد، شەهید مەلا ئەحمەد، شەهید مەحمودی مامە عەزە، شەهید سەیدجەوهەر.شەهیدشێرکۆجدی،شەهیدهەڵکەوت،کاك عوسمانی حاجی مەحمود، کاك شێخ کەریم چاوەڕەش،مام جەلالی مەسۆیی،کاك مەلاسەعید، کاك حەمە پاڕاوڵەیی.کاك شێخ مەحمودو مامۆستا کاکە ڕەش)دەچن بۆ کۆبوونەوەکە،بەپێی نەخشەیەکی نویّ هێزەکان کەن بەشەش مەفرەزەی پارتیزانی نویّ .

. پارتیزانەکانی سنووری بناری گل ودووز وەك دوودەستە دەبن لەناویەك دەستەدا بەفەرماندەی شەهید سەید جەوهەرو شێخ کەریم چاوڕەش.

. پارتیزانەکانی ناوچەی کفری وسەرقەڵای لای ئاوەسپی بەفەرماندەیی کاك عوسمانی حاجی مەحمود دەبێت..

. پارتیزانەکانی سەنگاو ئاجداغ بەفەرماندەی شەهید حەمەڕەش دەبێت.

. پارتیزانەکانی کەلاروکفری بەفەرماندەیی سەیدمحەمەدومەلا ئەحمەد.

. پارتیزانەکانی کەلار و دەربەندیخان بەفەرماندەیی عەدنانی حەمەی مینا.

. پارتیزانەکانی قۆپی قەرەداغ بەفەرماندەیی شەهید مەحمودی مامە عەزە

. پارتیزانەکانی سنووری سەگرمە بەفەرماندەیی کاك شێخ مەحمود.

. کاك ئازادیش خۆی لە کەلۆزێکدا لەلای چەمی ئاوەسپییەوەسەرپەرشتیی هەموو پارتیزانەکان دەکات،هەموو ڕۆژ پێش نیوەڕۆ وئیواران بەجیهازی (هۆکی تۆکی) پەیوەندی بەهەموویانەوەدەکات،جفرەی تایبەتییان دەبێت،چەندجارێك بەجیهازە راکاڵەکە پەیوەندی بە (م.س)وە دەکەن، هەواڵی دەستە پارتیزانەکان وکوردستان وعیراقیان رادەگەیاند،ئەوانیش هەواڵەکانی خۆیان دەگەیاندە پارتیزانەکان.

لەیەکەم کۆبوونەوەی گرنگدا بۆزەبر وەشاندن لەدوژمن، پەیوەندی دەکەن بەدۆست وناسیاوەکانەوە، لەهەموو قۆڵەکانەوە، بۆچەسپاندنی توانا و بەردەوامی مانەوەیان لەناوچەکەدا لەکۆبوونەوەکەدا کاك ئازاد رووله هاوڕێکانی دەکات و دەڵێ:

.(کێ دەیەوێ بمێنێتەوە با بمێنێتەوە کێش نەخۆش و ماندوەونەتوانە نامەی بۆ سەرکردایەتی بۆ دەنووسم ، هەموو پارتیزانەکان لەوڵامدا جوامێرانە دەڵێن:

(لێرە دەمێنینەوە، درێژە بەخەباتی پارتیزانانە دەدەین..)

لەدواییدا هەر دەستەیەك روو دەکاتە سنووری خۆیان.

## نەخشەکەی ئوتێل ئەبو سنا سەرنلگرێ !

. کاك ئازادی سەگرمە چەند جارێك لەگەڵ شەهید حەمە رەش وکاك عوسمانی حاجی مەحمودسەردانی دەستە پارتیزانەکان دەکەن ...

. شەوی 18 19/9./1988 دەستەی پارتیزانەکانی کاك عوسمانی حاجی مەحمود لەشاخی باوە شاسوارێ کفری لەرەبییەکەی دوژمن دەدەن ...

هەر هەمان دەستە لەنزیك گوندی (سەید جەژنی) سەرقەڵادا لوغمێك دادەنێنەوە...

لە 1988.10.6 دا لەژێر ئیڤایەکی (فەوجی سووك)دا دەتەقێتەوەو دەبێتە هۆی کوژرانی جاشێك وبریندارbوونی جاشێکی تر..

. ئیوارەیەکی تر کاك ئازادو شەهید حەمەرەش و چەند پارتیزانێك لەمۆڵگەی جاشەکان لەشوێنی مەڵبەندی (ی.ن.ك)ی جاران دەدەن..

## ساروخی کۆیتەرەکە

. کاك ئازاد لەسەر نەخشەیەکی دیاریکراو دەست دەکات بە ( استطلاع )ی هەموو سنوورەکان،بۆئەوەی زانیاری لەسەرشوێنی سەربازگەو رەبیەومۆڵگەی جاشەکان و جموجۆڵی سەربازی دوژمن کۆبکاتەوە،چونکەکەلوپەلەکانیان بەولاغ دەگواستەوە، هاتووچۆش بەناویاندا زۆر زەحمەت بوو.

+ کاك ئازادی سەگرمە لەپایزی 1988دا نامەیەك بۆ شەهید جەباری حاجی رەشید دەنووسێ، بۆ ئەوەی نوێنەری رێکخراو بنێرێت بۆ لایان تانەخشەیەکی نوێ بۆهەماهەنگی دابنێن بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو بارودۆخە دژوارە، پاش ماوەیەك کاك(حەمە رەشید شەریف)دەنێرن بۆ لایان کەناسراوبوو بە(مەلا رەشید باریکەیی) لەشاخی سەگرمە یەکتر دەبینن، نامەیەکی رێکخراوی پێدەبێ، پاش وتووێژێکی زۆر،بۆچوونەکانی ئەوان پەسەنددەکات...

نامەیەکیش بۆشەهید جەباری حاجی رشید دەنێرێ، هەر لەوکاتەدا چاودێرانی UN لە(ئوتێل ئەبو سەنا)دەبن بۆ جێبەجێکردنی دواخاڵەکانی رێکەوتنی کۆتایی شەڕی (عیراق . ئێران) کاك ئازاد: (نەخشەیەکی ورد دەکێشێت، بۆ ئەوەی بتوانن چەند چاودێریەکیان لێ دەستگیر بکەن بۆ هەژاندنی راگەیاندن و رای جیهانی، بۆ ئەوەی بزانن دوای کیمیابارانی هەڵەبجە و تراژیدیای ئەنفالەکان، پارتیزانەکان لەقوڵایی دەسەڵاتی دوژمندا چالاکی دەنوێنن.

. شەوی 1988.10.11/10 کاك ئازاد سەگرمەو کاك عوسمانی حاجی مەحمود لەگەڵ مام رۆستەم وجەلالی مەسۆیی و شەهیدان شێرکۆ جدی و هەڵکەوتی موهەندس و چەند پارتیزانێکی تر لای شەهید حەمەرەش دەبن..

بۆ سەعات 9ی سەرلەبەیانی کاك عوسمانی حاجی مەحمود وکاك مەلا ئەحمەدو کاك عەدنانی حەمەی مینا،کەلەنزیك گوندی(زاوت)ی سەر بەناحیەی باوەنووردەبن، چونکە بڕیار وادەبێ کە شەوی 1988.10.15/14 بۆ مەوعیدی رێکخستن بچنە دەواجنەکەی (حەمەی وەلی) لەنزیك(ئاوەخوێری) سەرجادەی کەلار. دەربەندیخان.

مام جەلال و بەهادینی برای شەهید حەمەڕەش و کاك حەمەرەحیمی جیهاز لەو جێگایە دەمێننەوە کە شەو لێی بوون لەکەڵۆزی هەنجیرەزەردەی سەرچەمی لاهێزە، رۆژی1988/10/11ئەم پارتیزانانە :

(ئازادی سەگرمە،مام رۆستەم حەمەڕەش،هەڵکەوتی موهەندیس، شێرکۆعەبدوڵلا، خوارەحم حەمەصالح(چالاك) .رزگار رئووف بێگەرد،سامالٚ کەرکوکی، تەهاغەریب، جەمال کەمال،سەرکەوت احمد. شێرزاد کەرکوکی)دەکەونەڕێ دەگەنە نزیك گوندی (فەقێ مستەفا) لەچەمێکدا بشوویەکی کەم دەدەن،لەپڕ گوێیان لە دەنگی هەلیکۆپتەر دەبێت،بەپەلە ولاٚخەکان لەچەمەکە دەشارنەوەوخۆیانیش دادەمەزرێن.

کۆپتەرێکی بچووک کە هەم فەرماندەسەربازییەکانی هەڵدەگرت هەم تیژرۆتربوو دەگاتە سەر چەمەکەو بەهۆی نزمبوونەوەوە ئاشکریان دەکات..

ئیتر(7)کۆپتەرکەی تریش دەگەنەسەریان و دەست بەئاگربارانیان دەکەن، پاشان هەلیکۆپتەرەکانیش کەپڕ لەچاش وهێزی تایبەت دەبن هەوڵی نیشتنەوە دەدەن، بەمەبەستی گەمارۆدان و شەهیدکردنی هەرهەموویان، پێش ئەوەی کارلەکار بترازێ هەڤاڵ(ئازادی سەگرمە)کەخۆی چەکێکی (BKC) پێدەبێت لەکاتی نزمبوونەوەی هەلیکۆپتەرە بچکۆلانەکە بۆچەند مەترێك کەبەچاوی ئاسایی سەرنشینەکانی دەبینێت،دەسرێژێکیان بەنیشانە پێوە دەنێ،دڵنیا دەبێت کەپێکاویانیە،دوایی روخانی رژێمی صدام حسین وبردنی بەڵگەنامەکان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەیەکێك لەبەڵگەنامەکان ئاماژە بەوشەڕە کراوەکە(کۆپتەرەکەی فەرماندەی پارێزگاری نەوتی کەرکوك پێکراوە و لەئەنجامدا دووئەفسەر بەناوەکانی عمید رکن إسماعیل عبدالقادرجبوری و مقدم روکن جاسم عیسی حمید یش بریندابوون و گوێزراونەتەوە بۆ نەخۆشخانەی سەربازی کەرکوك).

ئیتر دوای پێکرانی..کۆپتەرەبچکۆلەکە بەرزدەبێتەوە و یەکێك لە کۆپتەرگەورەکان چەند مووشەکێك ئاراستەی پارتیزانەکان دەکات،یەکێك لەمووشەکەکان زۆرلە نزیك کاك ئازاد دەدات و بەسەختی برینداری دەکات، هەڤاڵان(هەڵکەوت وشێرکۆ جدی و شێرزادعەریف رەمەزان)شەهیدەبن،هەڤاڵان (سەرکەوت وسامان کەرکوکی)یش بریندارەبن. دواتر بەهۆی پێکرانی سەرنشینانی کۆپتەرە بچووکەکەوە، هەرهەشت کۆپتەرەکە بەرەوکەرکوك دەگەڕێنەوە..

کاك ئازادی سەگرمە لە چاوپێکەوتنێکدا گوتوویەتی: (چالاك هاتە نزیکمەوە، وتم قاچم پێکراوە،دەتوانی بمکەیتە کۆڵ (12.10)مەتر بردمی.. ماندووبوو، لەبن تاشە بەردێکدا دایانم، بەبەردەوامی خوێنم لەبەر دەڕۆیشت، لەناکاو وتی:

ئەوە کاك حەمە ڕەشە، وتم بۆم بانگ بکە، شەهید حەمە ڕەش هات و وتی:
حەزم نەدەکرد تۆ واببینم، جەستەم لەخوێندا سووربوو، منیش وتم:مەیەڵە دەست دوژمن بکەوم، جوامێرانە وتی گەر بکوژرێم نایەڵم دەست دوژمن بکەویت..
پارتیزانەکانی تریشی نارد بۆلای بریندارەکانی ترو منی دابەکۆڵداو بەخێرایی هەنگاوی دەنا، ئەودڵۆپە خوێنانەی دەسرییەوە کەلەجەستەوە دەکەوتە سەرخاك.
دوو جار بوورامەوە، جاری یەکەم هۆشم هاتەوە، هەر بەکۆڵییەوە بووم بەجەمالی خوشکەزام وزرگاری ڕەئوف بێگەردم وت:
ئێوە بڕۆن یارمەتی بریندارەکانتر بدەن..! لەدواییدا مام ڕۆستەمیش لەکۆڵی کردم، بەیانییەکەی کەبەدوو ئاڕاستەی جیاواز بەڕێکەوتین، ئێمە بۆ سەرچەمی ئاوەسپی و کاك عوسمان و شەهید مەجید دوزیش بەرەو ئاراستەی گوندی زاوت ڕۆیشتن..
نزیکەی 45 دەقیقە دوور کەوتبوونەوە گوێمان لەتەقەی کۆپتەرەکان دەبوو، بەخێرایی چووبوونەناوئەشکەوتێکەوە،دواترنەقالەیەکیان هێنامنیان خستەسەری، جارێکی ترکۆپتەرەکان پەیدابوونەوە،برادەران بەخێرایی بە(ژاڵە تەڕو گیا) دایان پۆشیم ولێی دامەزران وتیان:
گەر کۆپتەرەکان بمان بینن. بەرگری دەکەین بۆ پاراستنی تۆ، بەچاوی خۆم کۆپتەرەکانم بینی، سەعاتێك زیاتر دەستڕێژیان لەهەمان شوێن کردەوە، کەسیان بۆ نەدۆزرایەوە،گەڕانەوە،برادەران منیان گواستەوە بۆ بنکەکەی کاك حەمەڕەش، لەرێگا وتم:پارچەیەك لەپشتیوێنەکەم بکەنەوە، سەرەوەی برینەکەم بۆ ببەستن، بۆ ئەوەی لەوەزیاتر خوێنم لەبەرنەڕوات،عەسرێکی درەنگ گەیشتینە بنکەکەو لەبن کەلۆزێکدا دایاننام، زۆرم سەرمابوو، بەدوو بەتانی دایان پۆشیم...
دڵۆپ.. دڵۆپ ئاویان بەگەرومدا دەکرد،هیچم پێنەدەخورا،گوێم لەمام ڕۆستەم گوتی:شێرکۆ جدی و هەڵکەوتی موهەندیس و شێرزادکەرکوکی شەهیدبوون،

هاوڕێکانە دووفەرەدەکایان هێناو لەم لاو ئەولای ولاخێك دایان مەزراند، نەقالەکەیان لەسەر بەست، ئێوارەکەی شەهید حەمە رەش‌و وکاك عوسمانی حاجی مەحمود پەیوەندیان لەگەڵ سەید محەمەدومەلا ئەحمەدو کاك عەدنانی حەمەی مینا کرد، بەجیهازی تەلەفۆنکن ئاگاداریان کردنەوە چەند ولاخێك بهێنن و بێنە گوندی (مارف سیدە) شەو لەویٚ یەکمان گرتەوە بەرێکەوتین بۆ پەناگاکەیان لەپشت گوندی (حەمەی عەبدولکەریمە سوور)، قەرەوێڵەیەکی قەیدیان لەویٚ بۆ پەیداکردم، کاك عەدنانی حەمەی مینا دەرمانی لابوو،بەئامێرو کەل وپە لی پزیشکیی ، برینەکانی بۆپاك دەکردمەوەو تەداوی دەکردم، تەختەیەکیان لەملاوئەولای قاچم لەسەر شێوەی (ل) بەست، شەوو رۆژێك لەویٚ مامەوە پاشان گواستیمانەوە بۆ پەناگەکەی شەهید مەحمودی مامەعەزەو کاك حەمەیاریاوڵەیی،لەکونەسوچرێك بوو گەورەیان کردبوو لەنزیك گوندی(مراوە) لەویٚ مامەوە،حاڵم بەرەوخراپی دەچوو، دوژمن بەبەردەوامی بۆ ماوەی (72) سەعات کێوماڵی سەراپا گەرمیانی کرد.)*

## لە فەتاحەوە بۆ رەنج

لەئێستگەوەبانگەوازکرا (لەفەتاحەوە بۆ رەنج، بەپەلە پەیوەندی بەباوکی (تایلان)وە بکەن، فەتاح کاك نەوشیروان و(رەنج)یش شەهیدجەباری حاجی رەشید و باوکی (تایلان)یش کاك ئازاد دەبیٚ، چونکە کاك نەوشیروان ناوی مناڵەکەمی دەزانی

. شەوی 1988.10.15/14 هەواڵی رووداوەکەو برینداربوونی کاك ئازاد و هاوڕێکانی لەلایەن کاك عوسمانی حاجی مەحمودەوە بەهۆی کاك محەمەدمەحمود (خەلیفە)وە دەنێرن بۆ رێکخراوی سلێمانی،بەهۆی کەمتەرخەمی هەڤاڵێکی رێکخستنەوە نامەکە دواکەوێت...

لە 1988.10.19نامەکە دەگاتە دەست حەمەرەشید شەریف(هاوڕیٚ کامل)ئەویش دەیگەیەنێتە رێکخراوی سلێمانی..

. لە 1988.10.20 کاک نەوشیروان مستەفا لەنامەکەیدا داوا لەرێکخراو دەکات دەبێ بایەخێکی زۆربەچارەسەرو گەیاندنی کاک ئازاد بەسەرکردایەتی بدرێ.

## لەدەواجنی(حەمەی وەلی)یەوە بۆ سلێمانی

کەرتی رێکخستنی شەهید سەرکەوت، کاک شێخ سدیق ناسراو بە(هاورێ شاهۆ) بە ناوی نهێنی(د.مەحمود)ەوە دەجێتە ناو پارتیزانەکان وبریندارەکان تیماردەکات، لەگەڕانەوەدا کاک ئازاد پێی دەڵێ:(بەرێکخراوی سلێمانی بڵێ بمگەیەننە شار) دوای گەڕانەوەی د.مەحمود لەکەلارەوە بۆسلێمانی، کاک ئازاد رۆژبەڕۆژ حاڵی خراپ تر دەبێت، لەسەر ئەوحاڵەشەوەکاک ئازادبەهاورێکانی دەڵێ:

(ئێمە لەبەر دڕندەیی دوژمن خۆمان لەکونە سوچردا حەشارداوە، سوچرەکانیش لەترسی ئێمە، لەنزیکمانەوە خۆیان شاردۆتەوە...)

. لە1988.10.27کاک عوسمانی حاجی مەحمود نامەیەك بۆ(هاورێ کامل)دەنێرێ، باس رێگایەکی گونجاودەکات.تا کاک ئازادی پێ بگەیەننەوە ناو شار..

لەنامەی 1988.10.29دا کاک عوسمانی حاجی محمود نووسیبووی:

(ئێمە دەتوانین بە7 سەعات کاك ئازاد بگەیەنینە شوێنی مەبەست، دەبێ ئێوە ئۆتۆمبیل ئامادەبکەن،چونکە دوژمن زانیویەتی کاك ئازاد بریندارکراوەو بەشوێنیدا دەگەڕێ،کەرتی شەهیدسەرکەوت لەرێی سدیق سەعید(هاورێ سوپا)وە وەرەقەی (طبی) بۆ کاك ئازاد ئامادەدەکەن،کە گوایە لەئۆتۆمبیل وەرگەڕاوەو پێویستی بەوە هەیە بنێرێ بۆ سلێمانی).

## دارکونارەکە

دارکونارەکە شوێنێکی تری بەیەکگەیشتنی هاوکاری پارتیزانەکان و پارتیزانەکان دەبێ،لەوشوێنە لەنێوان (کفری)وگوندی (کنگربان)چەندجاریك یەکتریان بینیبوو، هاورێ سوپا بە هاوکاری کاك(صلاح پەرلەمان) و کاك (ئەنوەر کارێزی) وکاك

(مجیدرەباتی) شەوی 1988/11/10 چاویان بەپارتیزانەکان دەکەوێ و بەرنامە دادەڕێژن کەچۆن کاک ئازادی سەگرمەوکاک سەرکەوت بگوێزنەوە بۆ سلێمانی.

. شەوی 1988.11.16 کاک حەمەڕەش و سەید محەمەدو مەحمودی مامە عەزەو عەدنانی حەمەی میناو کاک عوسمانی حاجی مەحمود لەگەڵ چەند پارتیزانێکی تر کاک ئازاد دەگەیەننە دەواجنەکەی(حەمەی وەلی)مام زۆراب و هاوسەرەکەی و کوڕەکەی زۆر بە میهرەبانییەوە خزمەتی کاک ئازاد دەکەن...

. کاک کارزان ئیسماعیل ئۆتۆمبێلەکەی خۆی دەداتەکاک حەمە لەتیف(هاوڕێ فوئاد) خۆشی سواری ئۆتۆمبێلێکی سووردەبێ و لەسلێمانییەوە بەرەو کەلار بەڕێدەکەون، کاک حەمە رەشید لەئاوەخوێری دابەزێ، ئەوانی تریش دەچن بۆ کەلار، شەو لەوێ دەمێننەوە.پارتیزانەکانیش کاک ئازاد بە کاک حەمە رەشید دەسپێرن ، جەمالی خوشکەزاشی لەلا بەجێ دەهێڵن،، شەوەکەی هەرسێکیان لەوێ دەمێننەوە، سەعات 6ی بەیانی کاک کارزان و کاک حەمە نوری و کاک حەمەرەشید ئیجازەی عەسکەری و کتابی نەخۆشخانەی بۆ ئامادەدەکەن وکاک ئازاددەخەنە ناو ئۆتۆمبیلە سوورەکەی کاک کارزانەوەو کاک حەمە نوری و کاک حەمە رەشیدو کاک حەمە لەتیف بە ئۆتۆمبێلێکی تر لەدواوە چاودێرییان دەکەن، کاک حەمە رەشید بەجەمال ئەڵێ: جارێ تۆ لێرەبە با کاک ئازاد بگەینین،دوایی دێمەوە بەشوێن تۆشدا.کاک کارزان کاک ئازاددەباتە ماڵ جەبارحاجی رشیدوکاک جەباریش ناوچەوانی ماچ دەکات، کاک حەمە نوری و کاک حەمە رەشیدیش دەگەنە ئەوێ، پاشان کاک ئاکۆ محەمەد وەهبی و کاک عەزیز عومەریش سەردانی کاک ئازاددەکەن،دوای نیوەڕۆکەی کاک (بەکری دارتاش) معاون دکتۆرێك دەبا بۆتیمارکردنی برینەکەی، بۆ شەوەکەشی کاک جەبار لەرێگای (شێخ عومەری مەحوی)یەوە، د.سەروەری حەمەی دەرویش کەریمی دەهێنێ بۆ بینینی.

. بەیانی یەکەی کاك کارزان، کاك ئازاد دەگوازێتەوە بۆ رانیە، کاك(سیدحاجی) و کاك(مستەفا کەرکوکی) حمایەی دەکەن، شەوەکەی لەماڵی سید حاجی دەمیننەوە، پاشان کاك کارزان دەیبات بۆ ماڵی(ماموٚستا عومەر)ی برای کاك(ئەحمەدە بچکۆل) لەقەلادزێ، هەر لەوێ عەبدلرەحمانی برای حسێن جنوبی و د. محەمەد قادر مینە تیماری دەکەن..رێکخستن هەوڵ دەدەن لەرێگای دۆڵی(زەنان)ەوەکاك ئازاد بگەیەننە سەرکردایەتی، بەلام ئەورێگایەشیان کارێکی دژواردەبێ،دکتۆرە دۆستەکان بەنیاز دەبن قاچی ببڕنەوە،بەلام خۆی رازی نابێت،پاش دووهەفتە لەئازاروچاوەڕوانی لە(قەلادزێ)وە دەیگەڕێننەوە بۆ سلێمانی بۆ ماڵی کاك سامان مەولود...

شەهید (بەکری دارتاش) وەرەقەیەك لای(د.ئازاد ئیسماعیل حەقی)دەبرێت و ئێوارەیەکی درەنگ شەهید جەبارو کاك شاسوارو کاك سامان مەولود کاك ئازاد دەبەن بۆ عیادەکەی، دوای فەحسەکەی، د. ئازاد بەئینگلیزی هەندێ قسە لەگەل شەهید جەباردا دەکات، پێی دەڵێ: (گەر چەند رۆژێکی تر نەشتەرگەری بۆ نەکرێ، تووشی نەخۆشی (گەنگرین) دەبێ، بۆیە شەهید جەبار دەڵێ: (دەبێ هەرچۆنێك بێ بگەیەنرێتەبەغدا،لەوێ چارەسەربکرێ ئەرکەکەشی لەسەرشانی هەموومان دەبێت). بۆ ئەومەبەستە پەیوەندی بە (د.خەسرەوگوڵ محەمەد)ەوە دەکات، کەئەو دەمانە لێپرسراوی نهێنی رێکخستنەکانی ناو بەغداد بوو، داوای لێدەکات، پسوڵەی دکتۆرێکی پسپۆری بۆ وەربگرێ... هەر ئەو رۆژە سەردانی(د.مظفر کرکجي)لە نەخۆشخانەی (نینوی للکسور)دەکات و پێی دەڵێ: (خزمێکی نزیکم لە سلێمانی یەو، پێویستی بەنەشتەرگەری هەیە) ئەویش رازی دەبێ کە ببینێ، شەهید سەید حاجی و شەهید مستەفا کەرکوکی، پسوڵەی عیادەی(طبي)و(عدم تعرض)ێکی بۆ ئامادە دەکەن، شەهید جەباریش پسوڵەی نەخۆشخانەی جمهوری سلێمانی بۆ بەدەست دەهێنێ و ئاراستەی دکتۆرەکانی بەغدادیش دەکرێ.

. بەیانی 1988.11.29(مستەفا ئیبراهیم)و(حەمە نوری)و حەمەرەشید شەریف، لەماڵی کاك سامان مەولود کاك ئازاد دەگەیەننە بەغداد، بۆ شەودەچنە لە ئوتێل (شط العرب)شەهید جەباریش دەگاتە بەغدا،ئێوارەی دوایی د.خەسرەو کاك ئازادیان لێ وەردەگرێت،دیباتە ژووری (د. مظفر) بۆ فەحس، بەرێکەوت ئەو رۆژە کوردێکی خۆفرۆش لە عیادەکە دەبێت،بەڵام کاك حەمەنوری و هاورێکانی کارێکی وا دەکەن هەست بەهیچ نەکات.

د.مظفر کە کاك ئازاد دەبینێ سەری سوڕدەمێنێ تووڕەدەبێ، ئەڵێ:

چۆن تا ئێستا لەسلێمانی هیچی بۆ نەکراوە، نەشتەرگەرییەکەی زۆری تێدەچێ، ئەویش بۆ ئەوەی هەست بەهیچ نەکات معامەلەی لەگەڵدا دەکات، دواتر رێکدەکەون بە(3)هەزار دینار نەشتەرگەری بۆ بکات، شەوەکەی کاك شاسوار لای دەمێنێتەوە، هەموو جۆرە فەحسێکی بۆ دەکەن..

. نیوەڕۆی (1988.12.1)دوای(52)رۆژ بریندارى سەعاتێك زیاتر لەژووری نەشتەگەری دەمینێتەوە، نەشتەرگەریەکی(11) تەقەڵی بۆدەکەن (6) شیشیش بەقاچیەوە بە برغوو چەسپ دەکەن، بۆ ئەوەی ئێسکەکانی رابگرێ و نەجوڵێ کەهۆشی دێتەوە د.مظفر دەچێتە ژوورەکەیەوەودەپرسێ (ئێستا تۆ لەکوێی؟

ئەویش دەڵێ : لەژوورەکەی خۆمم.

بۆشەوی دووەم کاك (ئاکۆ محەمەد وەهبی) لای دەمینێتەوەو برادەران دەگەڕێنەوە.

. لە 1988.12.14 د.خەسرەو وکاك ئاکۆمحمد کاك ئازاد لەنەخۆشخانە دەردەکەن، دەیبەنە ماڵی دایکی د.خەسرەو لەگەڕەکی (مدینة الثورة)دواتر دەیبەنە ماڵێکی تر پاش (10) رۆژ (مەلیحە خانی) هاوسەری وهەردوو منداڵەکەی دەچن بۆ لای، چەند جارێکیش شەهید جەبارو شەمام خان و کاك حەمە نوری و هاورێ مراد سەردانی دەکەن، پاش مانگێك د.خەسرەو شوێنەکەی دەگۆڕێ و کاك ئازادو هاوسەرو

منالەکانی دەباتە مالی هاوڕێیەکی لەدەرەوەی بەغدا، هەموو پێنج شەموانێك د.خەسرەو کاك ئازاد دەباتە لای د.مظفر پاش سێ مانگی تەواو بۆ دواجار بەبەنج شیشەکانیان لەقاچی دەرهێنن.

## لەبەغداوە بۆ قاسمەرەش

لە 1989.3.1دا شەهیدجەبارو شەمام خان کاك ئازاد لە بەغدا وە بەرەو سلێمانی و مالی خۆیان بەڕێ دەکەن،کاك ئازاد کراسێك وپانتۆلێ، لەبەردەکات،عەینەکێکیش لەچاودەکات،کاك (حەمەرەشید)یش هاوسەر وهەردوو منالەکەی (هەلۆ ولاوێن)ی گەیاندبوۆوە سلێمانی، بۆ دووەم رۆژ سەربەیانی کاك کارزان بەئۆتۆمبێلەکەی خۆی کاك ئازاد دەبات بۆ قەلادزێ لەبەر جاشەکان بەکەنەکەوەدا دەڕۆن دوو تەواری دەستیان لێ رادەگرن، کاك کارزانیش دادەبەزێت و بەوریاییەوە پێیان دەلێ:

(نەمزانی جەماعەتی خۆمانن وامەزانی رەبایەکەی ئەوبەرمانن)....

سندوقی ئۆتۆمبیلەکەی بۆیان دەکاتەوە،وتبوویان بڕۆ،بێکێشە دەگەنە قەلادزێ، لەرێگا کاك سەیدقادری باوکی کاك مستەفاو کاك ئەحمەد خۆیان بەحیزبی دیموکراتی ئێران دەناسێنن.کاك ئازادی سەگرمە نامەیەك بۆ (د.سەعید)نووسێ (باسی تراژیدیای کارەساتەکەو برینداری خۆی و بۆ دەکات،دەنووسێت:

ئێستا پێویستم بەهاوکاری ئێوەیە، بۆ زانیاری زیاتر دەتوانن پەیوەندی بەهەڤال (نەوشیروان مستەفا)ەوە بکەن ئەوان ئامادەیی خۆیان نیشان دەدەن بۆ گەیاندنی، جلی خاکی خۆیان بۆدەهێنن و لەبەری دەکەن، سەعات (7)ی بەیانی بە ئۆتۆمبێلی خۆیان کاك ئازاد دەگەیەننە دواسەیتەرە،عەسکەرێك لەوێ دەبێ،کە دەیانژمێرێ (9) کەس دەبن،ئەلێ: فەرموو بڕۆن ..!ئیتردەگەنە سونێ،لەوێ کاك ئازاد بەهەردوو دارشەقەکەوە سواری ولاخێك دەبێت و روو دەکەنە قاسمەرەش.

* سەرچاوە : هەردوو مالپەری کوردیپیدیا و شارپرێس




1989 /2/19

# شەهیدبوونی مەلائەحمەد و

# هەڤاڵەکانی لەئەشکەوتی(داری خلە)

ئەشکەوتی(داریخلە)یەکێك لەو حەشارگانەبوو کە پارتیزانەکانی سنووری گەرمیان بۆخۆپاراستن لەهێرش وپەلاماری ئەنفالچییەکان کردبوویان بەبنکەی حەوانەوە، ڕۆژانی17و18ی شوبات بارانێکی زۆر دەبارێت،هەندێك خزانی بچووك بچووك لەدەوروبەری ئەشکەوتەکە ڕوودەدات..

لە رۆژی1989/2/18چوار پێشمەرگەی ئازای پارتیزان بەرەوقوولایی گەرمیان دەکەونەرێ بەمەبەستی چاوپێکەوتنی هەڤالانی رێکخستنی ناوشار ...

ئەوئەشکەوتە هەرتەنیاو تەنیا حەشارگەیەکی سادە نابێت،بەڵکوو خۆی لەخۆیدا بنکەی پەروەردەیی رووناکبیری پارتیزانەکانیش دەبێ،جگەلەوەی هەردەم شوێنی باس کردنی بابەتی فکری وپەیڤین دەبێ، کتێبخانەیەکی خنجیلانەشی تێدا دەبێ.

لە 19/ی شوباتی ساڵی 1989 دالەکاتێك دا هەڤاڵ (مەلا احمد ) و شەش هەڤاڵی پارتیزانی تری لە ناو ئەشکەوتی(داری خلە)دەمێننەوە،ئەشکەوتەکە بەسەریاندا هەرەس دەکات و دەبێتە هۆی شەهید بوونی هەرهەموویان ....:

**ناوی شەهیدانی ئەشکەوتی( داریخلە ):**

1. شەهید ئەحمەد صالح(مەلائەحمەدیگەرمیان)
2. شەهید دارا قادرسەمین
3. شەهید سەلام محمدقادرحسین
4. شەهید نوریقادر
5. شەهید رحیم محمدکریم
6. شەهید حەیدەر محمد
7. شەهید حمید قادر

بەرلەروودانی رِوخانی ئەشکەوتەکە نەخۆشی لەرزوتا کاریگەری زۆر خراپ لەسەر باری تەندروستی زۆربەیان دروست دەکات هەربۆیە هەمیشەلەخەمی پەیداکردنی دەوا ودەرماندا دەبن،ئەورۆژە چەند هەڤاڵێك لە دەرەوەی ئەشکەوتەکە دەبن،وەك (حەمەسۆران)و(کەریم)دواترکەدڵنیادەبنەوە لەوەی ئەشکەوتەکە هەرەسی کردووەو هەڵدانەوەی لەتواناو وزەی ئەوان بەدەرە ،

هەرئەرۆژە(کەریم)کاك حەمەرەش لەوکارەساتە دڵتەزێنەئاگادار دەکاتەوە، هەرهەمان شەو کاك سیدمحمد یش بەبێتەل کاك حەمەڕەش وکاك عوسمان وگشت هەڤالانی گەرمیان و سەرکردایەتی لەرووداوەکە ئاگاداردەکەنەوە..

## ئەشکەوتی داری خلە :

### تەرمی حەوت پێشمەرگە (13) مانگ لەئەشکەوتێکدا*

لەساتەوەختی پرۆسەی ئەنفالکردنی میللەتی کوردو کشانەوەی بەشێکی زۆری هێزی پێشمەرگە بۆسەرسنوورەکان وسنووری مەڵبەندی سێ کە خۆشناوەتی و دۆڵی مەلەکان و بالیسان وخەتێ و سماقوڵی و دەشتی کۆیەو هەولێری دەگرتەوەو نەمانی ئومێدێك بۆ زیندوبوونەوەی شۆڕش، شەهید مەلا ئەحمەد کەلاری بڕیاری مانەوە ئەدات و ڕازی نابێت کوردستان جێبهێڵێ بۆیە لەنامەیەکدا بۆسەرکردایەتی یەکێتی دەنوسێت:

(هەڤاڵان..سلاوێکی گەرم، من بەتەمای مانەوەو درێژەدانم بەخەبات و چۆڵنەکردنی ناوچەکە،ئەوەش بۆ کەسێکی وەکو من کەسەڵت و شارەزای تەواوی ناوچەکەم کارێکی ئاسانترە) لەوکاتەشەوە ژمارەیەك پێشمەرگە دەگەڕێنەوە گەرمیان و لەدەشت و دۆڵ و ئەشکەوت و چیاکاندا دەمێننەوە بەمەبەستی هیلاککردنی سوپای بەعس وسەلماندنی وجودی پێشمەرگە لەسنورەکەدا، بەڵام لەڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراوداو لەزستانی 1989دا بەکارەساتێك کەبەئەشکەوتی(داری خلە) ناسراوە،مەفرەزەیەك پێشمەرگەی ئازا کەژمارەیان حەوت کەس دەبێت دەبن بەژێر ئەشکەوتەکەوەو ئەشکەوتەکە دەبێتە یەکەم وێستگەی گیاندەرچونیان وهەرلەوێدا تەرمەکانیان دەمێنێتەوە..

لەدوای ڕاپەرینی بەهاری ساڵی1991. کاك حەمەسۆران غازی سالارکەخەڵکی گوندی(کارێز)ی سەربەقەزای کفریەوتەمەنی چل ساڵە دەبێ و یەکێکە لەو کەسانەی لەگەڵ ئەومەفرەزەیەدا بووە وقەدەر ڕزگاریکردوە لەوبارەیەوە گوتوویەتی:

(دوای پرۆسەی ئەنفال زۆربەی پێشمەرگەکان کشانەوە بۆ سەر سنوورەکان و سنووری مەڵبەندی سێ بۆبارەگاکانی یەکێتی لەو شوێنانەی کەئەستەم بوون دەستی بەعسی پێبگات،بەلاّم لەگەرمیان و لە ناوچەکانی تیپی 21 ی کەرکوك کە شوان وشێخ بزێنی وبناری خاڵخالاّن وسەر زێی بچووکی دەگرتەوە کۆمەڵێك پێشمەرگە مابوونەوە وەکو پارتیزانی کەزیاتر لە قۆناغی خۆحەشارداندا بوون و دوور لەگوندەکان، لەهەردەو هەڵەت و شوێنەعاسیەکاندا خۆیان دەشاردەوە، لەبنکەی تایبەتدا یان لەئەشکەوت و کون و مەرجەدا کەخۆیان دروستیاندەکردبوو) بەپێی زانیاری چەندمەفرەزەیەك بەسەرپەرشتی هەڤاڵان(عوسمانی حاجی محمود و مام جەلال مەسۆیی و شەهید حەمەڕەش و شەهید مەلا ئەحمەد کەلاری و شەهید سەیدو شەهید مەحمودی مامەعەزەو عەدنانی حەمەی مینا) لەگەرمیاندادەمێننەوە، کەهەریەکەیان کۆمەڵێك پێشمەرگەیان لەگەڵدا دەبێت ولەچەند شوێنێکی جیاجیای سنوری گەرمیاندا خۆیان حەشاردەدەن، کۆمەڵێکیان لە (داری خلە) و زاوت و ڕۆسەی شاماروبراوەل دەمێنننەوە، شەهید (حەمەڕەش)یش لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لە ئەشکەوتەکانی چیای(ئاشداخ) لەسنووری سەنگاو و(شێخ کەریم چاوڕەش)یش لەسنووری ئاوباریك و بناری گل و عوسمانی حاجی مەحمودیش لەقاتعەکانی کفریدا لەگەڵ شەهیدمەلائەحمەد کەلاریدا دەمێننەوە..

کە لەمانگی چواری ساڵی 1988دا ئەنفال لەسنووری گەرمیان کۆتایی دێت، مەکتەبی عەسکەری و سەرکردایەتی یەکێتی بڕیاردەدەن لەشەڕي نیمچە بەرەییەوە بگوێزنەوە بۆ شەڕی پارتیزانی،لەمانگی ئاب دا هێزێکی(50)کەسی بەدووبەش لەدۆڵی سماقوڵیەوە بەسەرپەرشتی مام ڕۆستەم و ئازادی سەگرمە دەگەڕێنەوە سنوری گەرمیان،مام ڕۆستەم بۆناوچەی شوان و شێخ بزێنی و سەرپەرشتی پێشمەرگەکانی تیپی (21)کەرکوك و (25)ی خاڵخالاّن و ئازادی سەگرمەش بۆ

گەرمیان بۆ سەرپەرشتی ئەوپێشمەرگانەی لەگەرمیان ومەڵبەندی(1)دا مابوونەوە، کە سنووری قەرەداغ و گەرمیان و حەوزی شارەزوورو بازیانی دەگرتەوە.بەهۆی سوڕانەوەی بەردەوامی هەلیکۆپتەرەکانی سوپای عێراقەوە ناچار ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە بەدووبەش دەگەڕێنەوە بەمەبەستی ڕزگاربوونیان لەهەر ڕوداوێکی چاوەڕواننەکراو،نزیکەی 25 پێشمەرگە وەك یەکەم وەجبە بەسەرپەرشتی ئازادی سەگرمە دادەبەزێ و پاش گەیشتنیان بەگەرمیان وەجبەی دووەمیش بەسەرپەرشتی مام ڕۆستەم دوای ئەوان بە 10 ڕۆژ دادەبەزن و بەشێوەی مەفرەزە هەرچەند کەس و بەسەر ناوچەیەکدا دابەش دەبن و مەفرەزەیەکی 9 کەس بەسەرپەرشتی شەهید مەلا ئەحمەد کەلاری لەئەشکەوتی (داری خلە)دا دەگیرسێنەوە و ئەوێ دەکەن بەشوێنی حەوانەوەی خۆیان.. دوای بەسەربردنی سیازدە مانگ لەوێدا ئێوارەیەکی زستانی ئەو ساڵە ئەشکەوتەکە دەبێتە گۆڕ بۆ 7 کەسیان و بۆماوەی سێ ساڵ تیایدا دەمێننەوە تائەوکاتەی ڕاپەڕین دەست پێدەکات...

بەپێی گێڕانەوەی حەمەسۆران(ئەشکەوتی داریخلە لەوگوندەکاندا بەکونە کۆترەکە مەشهووربووە، چونکە کونەکۆتری لێبووەو نزیکەی 3 مەتر پان و لەدەروازەی دۆڵ و تەنگەبەرەکەشەوە بۆ ژوورەوە نزیکەی 20 مەتر قوڵ بووەو کونە کۆترەکانیش نزیکەی 10 تا 15مەتر بەرزبوون و دەستی پێنەگەیشتووە،ئەشکەوتەکەلە سەروی گوندی زاوت و ڕۆسەی شاماربووەو نزیکەی 5 کیلۆمەتر لە باکووری خۆرئاوای ناحیەی باوەنوورو قەزای کەلارەوە دوربووە،خۆر بەکەمی گرتویەتییەوە، ئەو شوێنەش دۆڵ و کەندو تەپە و تلانی زۆربوو وەو ئاوەرۆبووە لەبەرئەوەی خاکەکەی ڕنۆك و لەزیخ دروستکراو بووەو زیخەکەش فشۆڵ بووە. ئەوشوێنە کەمەفرەزە 9 کەسیەکەی شەهید مەلا ئەحمەدی تیابووە 500 تا600مەتر لەداری خلەوە دوربووە کەدارێکی بەڕوو بووە لەسەر بەرزاییەك هەڵکەوتووەو لەهەمولایەکەوە

دیاربووە،ئەشکەوتەکە وەکو دووژوور وابووەو پێشی کەڵەك ژەن بوو وە...
مەفرەزەکەی شەهید مەلائەحمەد یش دەیکەن بەبنکەی خۆیان و بەزۆری لەوێدا دەمێننەوە،دەربارەی هۆکاری هەرەس هێنانی ئەشکەوتەکەش حەمەسۆران باسی ئەوەیکردووە:(ڕۆژی19/ 2 /1989 کەهۆی هەرەسی ئەشکەوتەکە ئەوە بووە ئەوساڵە بارانێکی زۆرباریوە پێیان نەزانیوە باراناوی زۆر ژێر ئەشکەوتەکەی بنکۆڵکردووە، کاتژمێر5،30ی سەرلەئێوارەی ئەو ڕۆژە ئەشکەوتەکە هەرەس دەکات و هەریەکە لەشەهید مەلائەحمەد کەلاری و شەهید مام حەمید مەجیدو شەهید دارا نارێنی و شەهید سەلام و شەهید نوری ناسراو بە(پۆلاً) کەهەرخەڵکی نارێن بوون ، شەهید حەیدەر . خەڵکی شۆڕاوە . شەهید ڕەحیم ، دەبن بەژێر زیخ و چەوی ئەشکەوتەکەوەو دەستبەجێ گیان لەدەستدەدەن و دوکەسەکەیتریش کە (حەمەسۆران و محەمەد سەید محیەدین) دەبن ناتوانن هیچ کارێك بکەن تەنها ئەوەنەبێت کەمەفرەزەکانی دیکەی لێ ئاگادار دەکەنەوە،چیرۆکی مانەوەی هەریەکە لە (حەمەسۆران و محەمەد سەید محیەدین) و ڕزگاربوونیان لەو مەرگە چاوەڕوان نەکراوە چیرۆکێکی زۆرسەیرەبووەو حەمەسۆران خۆی کێڕاویەتەوە:

(شەهید مەلائەحمەد کەلاری و شەهیدسەلام لەسەر جێگەکەیان ڕاکشابوون ڕادیۆیان بەدەستەوەبوو گوێمان لەڕادیۆی(دەنگی گەلی کوردستان)دەگرت، کەهەواڵەکان کۆتایی هات کاتژمێر بووە 5ی سەرلەئێوارە ئەوکاتەش مەوعیدی جیهازمان لەگەڵ مەفرەزەکانی تردا هەبوو شەهید سەلام وتی کاك سەید مەوعیدی جیهازە ناچی بۆجیهاز ووتی بەڵێ جیهازەکەی هەڵگرت و بەپەلە کەوتەڕێ..

گووتی حەمەسۆران تۆ نایەی..؟ گووتم بۆنا ووتی دەی چەکێك و دووربینەکە لەگەڵ خۆتدابێنە بابچینە سەرەوە شوێنەکە نزیکەی سەدوپەنجا مەتر دووربوو لە ئەشکەوتەکەوە لەتەنگەبەرەکەوە دەچووینە سەر ڕچەڕێیەك لەوێ جیهازەکە

وەریدەگرت کەچووین تەنها دوربینەکەم هەڵگرت بەهۆی قسەکردنەوە لەگەڵ برادەراندا چەکم لەبیرچوو گەشتینە نیوەی ڕێ کاك سەیدیش جیهازی دەکردو منیش بەدووربینەکە تەماشای دەوروبەرم دەکرد.. کاتژمێر گەشتە نزیکەی 5،30 جیهازەکەی تەواوکرد دووربینەکەی لەدەستم وەرگرت تەماشای دەوروبەری پێدەکرد شوێنێك سپیایی بوو دیاربوو بەفرباریبوو وتی نەوەك خێمەبێ بزانە ئاگر لەدەوروبەریدا نیە نزیکەی دە هەنگاوێك لێم دوورکەوتەوە من ئەوکاتە تەماشام دەکرد دەنگێك پەیدابوو دەنگەکە دەنگێکی ئاسایی نەبوو دەنگی هەرەس بوو ئاوڕمان دایەوە بەلای دەنگەکەدا تەماشامان کرد بەرد وتەلآشێك لەشاخەکە ڕاستەوە بوو بەڕاکردن خۆمان گەیاندەوە شوێنەکەی خۆمان کە تەماشامانکرد بە بەرزی نزیکەی10مەتر زیخ و چەو کەوتۆتەخوارێ و بەئاسانی دەستمان دەگەشتە کونە کۆترەکان تا 10خولەك بانگمانکردن و چووینەخوارەوە بەدۆڵەکەدا ووتمان بەڵکو کەسێکیان بۆکارێك دەرچوبێ، بێسود بوو.. ئێمەش بەناچاری ئەو شوێنەمان بەجیهێشت و چوین بۆ بنکەکانمان لەناوچەی زاوت و بەردەبەلەکە.. دوبرادەرمان لەوێ بوون چوین بۆلایان و شەوگەڕاینەوە نزیکەی نیوکاتژمێری تر لەوێ ماینەوە هەر بێ سود بوو هیچ هەوڵێکمان پێنەدرا بۆڕۆژی دواتر واتە 1989/2/20 مەفرەزەکانی ترمان ئاگادارکردەوەو بۆ ڕۆژی سێیەم هاتن بەهانامانەوەو ئەوانیش هەموو هەوڵێکیان بێسوودبوو، لەیەکەم خولەکەوە بێئومێدبووبووین لەوەی کەئەوان مابن لەبەرئەوەی هەرەسەکە تاوێرنەبوو تابۆشایی بخستایەتەوە)

دواتریش بەهۆی بەردەوام سووڕانەوەی هێلیکۆپتەری هێزەکانی ڕژێمەوە مەفرەزە پارتیزانەکانی هێزی پێشمەرگە ناتوانن تەرمەکان لەئەشکەوتەکەدا دەربهێنن و هەرلەوێدا بۆماوەی 3 ساڵ دەمێننەوە تادوای ڕاپەڕینەکە لە 1991/11/1 دوای کارکردنی بەردەوامی شۆفڵ بۆماوەی هەفتەیەك و دۆزینەوەی تەرمەکانیان

لەمەراسیمێکدا تەرمەکانیان دەبەنەوە بۆگۆڕستانی کەلاری کۆن و لەوێ دەیاننێژن، دوای هەڵدانەوەی ئەشکەوتەکە ئەوشتانەی دەدۆزرێنەوە بریتی دەبن لە(ژمارەیەك کتێبی جۆراوجۆر و مۆرێکی تیپی 55ی قەرەداغ کەئەوکات شەهید مەلائەحمەد فەرماندەی بووەو قەڵەمێکی پارکەری جاف و ڕادیۆیەکی بچووك و یەکێکیتری ناشناڵی یابانی شکاو و 6 تفەکی، هەمە جۆری زامن نەکراو و 1 ئاربیجی و 6 تاقم و ڕەزنی 8 مەخزەنی و چەند شانەو مەخزەنێکی پەرتەوازەو چەند لاقەمزەلیەکی شکاوو ژەنگخواردوو جیهازێکی ڕاکاڵی بچووك و جامانەیەکی لولدراوو کلاوێك و چەند تاکە گۆرەویەك و تیرەو دەزوویەکی خاکی و 10 پاکەتە جگەرەی کیس و مقەبای جۆری بەغدادو تاقم تەراش و گوێزان و مەقاشی شکاو لایتی گەورەو بچوك و 6 چەقۆو حەربەی هەموجۆری مشت شکاوو ژەنگن و شوشەیەك عەتری تانیوەپڕو کتریەکی قوپاوو دووپەرداخ و قۆریەکی شوشەی پەراش پەراش و 2 کەوچك و 6 زەمزەمی و مەتارەی قوپاوو سێ ڕۆژ ژمێری شەهید مەلائەحمەد کەبیرەوەری و یاداشت و مێژوی پێشمەرگایەتی لەسەرەتای ساڵی 1987 ەوە تا 1989/2/18 تێدابووەو دووانیان لەبەرباخەڵیدا بەهۆی ئارەقکردنەوە شڕوبەرگ دڕاوبوونە و سێیەمیشیان بەرگێکی نوێی هەبووەو خەتێکی نوسراوی کاڵی لەسەر بووە لەگەڵ چەند پێنج دیناری و دەدیناریەکی ڕزاودا...

وابڕیاردەبێ کەدوای ڕاپەڕین پێشانگایەکیان بۆبکرێتەوەو ئەرشیف بکرێن بەڵام هەموویان لەساتەوەختی شەڕی ناوخۆدا لەڕۆژی 31 ی ئابدا لەناودەچن ...

بەپێی دۆکیۆمێنتە دەستکەوتووەکانی (ئایندەی گەرمیان) لەلاپەڕی یەکەمی ڕۆژژمێرە نوێیەکەی شەهید مەلائەحمەد کەلاریدا جگە لەناوو نازناوی خۆی و پیشەکەی بۆگەڕەك نووسیبووی(چیاکانی کوردستان)و خوێنەکەشی (+O) بووە.. یاداشتی ڕووداوی ڕۆژێك پێش کارەساتەکەشی لە ڕۆژژمێرەکەیدا تۆمارکردوە کە

1989/2/18ە و نووسیویەتی(ئەمرۆناوچەکە ئارام بوو..دوژمن کشابوونەوەو نەمابوو.. برادەرانمان بەڕێکرد.. لەهێلانە هەلۆکە بووین، شەو گەڕاینەوە ژمارە 4 کە(نهێنی ئەشکەوتەکەبووە)لەنامەیەکی پەخشان ئامێزیشدا کە بۆ هاوڕێیەکی نووسیوە بەناوی(ئومێد)باسی لەژیانی مندالی خۆی و هاوڕێکەی کردووە و لەبەشێکی نامەکەدا وانووسراوە:(ئومە گیان لەژیانێکی ناسۆردا ئەگەڕێم هەر هەنگاوێکم ئاوازێکەوهەرترپەیەکی دلە چەوساوەکەم ئاواتێکە شەوگاری تال ومۆن پێوەی دەتلێمەوەو دێڕەکانی ئەڤینیمان وەك ملوانکەیەکی شیلان دەبریسکێتەوە ودەیکەمە مل کچەهەژارێکی ئەفریقا،چونکە چاوەکانمان تامەزرۆی پێکەنینی خۆری تاریکایی چاوی شەقامەکانە..) دەربارەی چۆنێتی پەیداکردنی خواردنیش حەمەسۆران دەگێڕێتەوە: (سەرەتا بەپێی توانا خواردنی گوندەکانمان کۆدەکردەوە ئەوەی خەلك لەترسی بۆردومان و شەڕوشۆڕ بردبوویە بن ئەشکەوت و مەغارەکان و لەدووری گوند داینابوون دواتریش پەیوەندی لەگەلْ ڕێکخراوی کۆمەلە دروستبوو لەناوشارداو ئەوکاتە بەیارمەتی ئەوان خواردن و دەواو دەرمانمان بۆدەهات، ئەوەش سدیقی حاجی سەعید . ئەبوو عەلی . لەڕێگەی یەك مەفرەزەوە شتەکانی دەناردو دواجار لەڕێگەی عوسمانی حاجی مەحمودەوە دابەشدەکرا یەکەمجار لەدەواجنەکانی تەنیشت گوندی ئاوەخوێرییەوەبۆمان دەهات دواترگۆڕییان بۆدەواجنەکەی کفری.)

بەپێی زانیاریەکان مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگە لەو سەردەمەدا فەرمانی ئەوەیان پێنەبووە گورزلەحکومەت بووەشێنن زیاتر لەقۆناغی پارێزگاری خۆیاندابوون.. چونکە ئەوێ ڕۆژێ خەلك باوەڕی وابوو پێشمەرگە هەبێت شۆڕش هەیە نەبێت شۆڕش کزو لاوازەو نیە.. بەبڕوای حەمەسۆرانیش (بوونی پێشمەرگە لەناوچەکەدا ئەگەر تەقەیەکیشی نەکردایە حکومەتی هیلاك دەکرد چونکە بەدرێژایی دووسالْ بۆ

دووساڵ و نیو هەفتەی جارێك بەردەوام هێزێکی گەورەی دەهێناو لەگەڕاندابوو چون دەیزانی پێشمەرگە ماوەتەوە)هەر بەپێی زانیارییەکان لەوماوەیەدا دووجار ڕوبەڕوبوونەوە لەنێوان پارتیزانەکان و سووپای ڕژێمدا ڕووی داوە و لەیەکەم ڕوبەڕوبوونەوەشدا کەلەگەڵ مەفرەزەکەی ئازادی سەگرمەدا دەبێت 3 پێشمەرگە شەهید دەبن و 4 پێشمەرگەی دیکەش بریندارەدەبن، لەبارەی هۆکاری دروستبوونی ئەو ڕوبەڕوبوونەوانەشەوەحەمەسۆران ڕاگەیاند "وەجبەکەی کاك ئازادی سەگرمە کاتژمێر10ی سەرلەبەیانی کەکاتێکی زوو بوو بە مەبەستی گۆڕینی شوێنەکەیان دەرچوون بۆ شوێنێکیتر لەوکاتەدا هێلیکۆپتەر ئامادەدەبێت و ئاشکرادەبن و ڕوبەڕوو دەبنەوەو بەوهۆیەشەوە سێ پێشمەرگەیان لێ شەهید دەبێت بەناوەکانی

(1. شەهید شێرکۆ جدی

2 . شەهید شێرزاد عەریف رەمەزان

3 . شەهید مهندس هەڵکەوت

کەئەندازیاربوو لەبەشی بێتەل کاریدەکردو هەرسێ تەرمەکەش کەوتە بەردەستی حکومەت و....

4 پێشمەرگەی دیکەش بریندار بوون کەیەکێکیان ئازادی سەگرمە بوو و دواتر لەرێگەی رێکخراوی ناوشار ودەستەکانی یەکێتیەوە دەبرێتەوە ناوشارو لەوێشەوە دەبرێتە بەغداد بۆ چارەسەرو دواتریش دەکەینرێتەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی.

---

* سەرچاوە : ڕاپۆرتێکی کەمال محەمەد ودلێر عەبدولڕەحمان و ئەرشیفی جەمیل محەمەد ئیبراهیم

# پرسەنامەی نامەی کاك ملازم عمر

برای بەرێزو خۆشەویست کاك حەمەڕەش

سلاوێکی گەرم..

هیوامان باشی وسەرکەوتنتانە،زۆربەگەرمی لەهەواڵتان دەپرسین.

دڵمان هەمیشەلاتانە،ئومێدەوارین سەلامەت وپارێزراوبن.

ئەم ماوەیە کەبێ دەنگ بوون زۆرلەمەراقی ئێوەدابووین،

کەنامەکەتان گەیشت چاوودڵمانی پێ ڕوون بووەوە .

وەکیلی سلاومان بە بۆکاك شێخ کەریم وکاك عوسمانی حاجی محمود و

هەموو پێشمەرگەقارەمانەکانی کەلەگەڵتانن..

بەراستی هەمووتان نموونەی پیاوەتی وجوامیرین وجێی شانازی هەموومانن.

ئەمەش وەلامی نامەکەتانە لەگەڵ ڕەئی خۆمان:

1. زۆربەداخین بۆشەهید بوونی کاك مەلائەحمەدو هەڤاڵەکانی،لەم کاتەدا بۆئێمە زەربەیەکی کوشندەبوو.بەلام نەتان نووسیبوو ئایا لاشەکانیان چی بەسەرهاتووە؟ چونکەکەسوکاریان ڕۆژانە دێنەلای ئێمە.تکایەبەنامە یالەرێی جیهازەوە ئاگادارمان بکەن ئایە هەرئەوحەوت کەسەبوون یاهی کەیان لەگەڵ بووە.؟

لاشەکانیان چی بەسەرهاتوە؟ چونکی دەنگ وایەدەست دوژمن کەوتبن.

2. واجیهازمان ئامادەکردووە ،ئەمڕۆکاك حامد لێرەیەو سبەی جیهازەکە ئەبات، بەنیازن ئێرانیەکان موافەقەت بکەن ،کاك محمودسەنگاوی و چەند پێشمەرگەیەك ڕێگەبدەن هەم خۆیان بێن هەم جیهازەکانیش بەێنن.

کاك محمودو ژمارەیەکی باش دەمێکەخۆیان ئامادەکردووەوامان کردووە بە 2یان3 مەرحەلەبێن.ئەوانەی خۆیان ئامادەکردووە 70 کەسن، سەرەتا 30 کەسیان دێن ..

3 . خۆشمان چاوەروانی ئەوەدەکەین لەم رۆژانەدا مام جەلال لەتاران بگەرێتەوە و کۆبوونەوەکانی خۆمان تەواو بکەین،دوای ئەوە لەبرادەرانی سەرکردایەتیش دێنە خوارەوە،ئیمکانە مەرحەلەی یەکەم 3کەسمان بێن بۆلای ئێوەو برادەرانی هەولێر.

4 . لەدەرەوە دکتۆر مکرم مام جەلالی بینیوە داوایئەوەیان کردووە کەگفتوگۆ بیکەن وعراق ناردوویەتی..ئێمەش وەلأممان داونەتەوە کە ئامادەین، جاچاوەروانی ئەوەین کەبەم نزیکانە گفتوگۆی ئێمەو دەوڵەت دەست پیٚبکات. بەلأم رێك دەکەوین یانا ؟ ئەمەیان بەدەستی ئێمە نیە وبەدەستی عیراقە. ئێمەلەلای خۆمانەوەبەئومێدی رێکەوتن لەگەڵیان دەچین بۆپێشەوە.

5 . داوامان وایەئەم ماوەیە زۆرخۆتان بپارێزن ،خۆتان لە قەرەی شەرمەدەن مەگەربیێ بەتووشتانەوە،یان گەرمەفرەزەی بچوك بچوکی4کەسی بنێرن بملاو بەولادا دەستێکی کوتوپربووەشێنن و بگەرێنەوە.

هەرکات کاك محمود وبرادەران گەیشتنەلاتان هەولْ بدەن بەقەدەر ژمارەی ئەوان بنێرنەوە،خۆت صیحەتت تەواونیە پێمان چاکەسەرێك بدەیتەوە،گەر برادەرانی کەش لەپێشمەرگەو مەسئول ویستیان بگەرێنەوە ئەوەقەرارەکە بۆ خۆتانەو خۆتان برادەرانە بەجێی دەهێنن کی بمێنیْ وکیْ بگەرێتەوە.

6 . کاك ئازاد گەیشتەلامان وئێستالەتارانە بۆعیلاج، وەزعی زۆرباشە،زۆر بە تەقدیرەوەباسی هەمووتانی دەکرددەیوت زۆرپیاون وحەزم نەدەکرد بەجێیان بهێلم ،هەتا ئەیوت کاك حەمەرەش کارێکی وای کردووە مەحجوبی کردووم، قەت کاری وای نەکردووە ، من واهەست بکەم کە کۆن شتێك هەبووبێت لەنێوانماندا زۆرمان پیٚخۆش بوو.. ئومێدەوارین کەنموونەتان زۆربێت .

7 . بۆئازوقە و پیویستییەکانی خۆتان چیبەچاك ئەزانن؟

پێشنیارتان چیە؟ تکایە هەم ئاگاداری ئێمە هەم هی برادەرانی سلێمانی بکەن هەتاچی ئەکریت ئێمەبیکەین .

8. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی بڕیاری ئەوەی داوە کەدرێژە بەخەبات بدەین.

هیچ کەس لەمەسئول وئەندامانی سەرکردایەتی نەچنەدەرەوەی وڵات.

هەموو لەگەڵ هێزەکەمان بمێنینەوە، گەرهیچ چارەیەکمان نەما هەمووبێینەوە وڵات، بەمام جەلالیشەوە،لاشەکانمان لەکوردستان بەجێ بمێنی وئاشبەتاڵ نەکەین.

9 . لەماوەی ئەودووساڵەدا پێشمەرگەزۆربەکەمی تەسلیم بوونەتەوە، دەتوانین بڵێین لە 100٪ پێشمەرگە تەسلیم نەبوونەتەوە.

10. لەگەڵ کاک محمودسەنگاوی مەرحەلەی یەکەم دکتۆریشیان لەگەڵدایە.

ماڵی خۆتان وهەموولایەك زۆر باشن،ئێستا مامۆستاجەلال لێرەیە سلاوی هەیە.

سڵاومان بگەیەنە بەکاك جەوهەروسید محمدومەلاسەعیدوهەمووان.

هەربژین ..

برای دڵسۆزتان

عومەرعەبدوڵا

لەبری م.س

1989/3/29

براگیان ئەوەکاك عومەر نامەی بۆنوسیون زۆرم سڵاووڕێزبۆ هەمووتان هەیە، قوربانتانم کورکوری تەنگانەئەبێ،ئێوەش ئەو کوڕەن وتەنگانەش بەری کورتە، سڵاو بۆهەمووان *

فەرەیدوون

1989/3/29

* کاك فەرەیدون عبدالقادر ئەم هامشەی لەسەرنامەکە نووسیوەو خەتمی سەرکردایەتیشی لێ داوە.

# دوو نامەی کاك حەسەن کوێستانی بۆپارتیزانەکانی گەرمیان

**نامەی یەکەم بۆهەڤاڵ مەلاسەعید**

**هاوڕێی بەریزمان مەلاسەعید**

سلاوی گەرم وەیوادارین سەلامەت وسەرکەوتووبن.

رێزوسلاّومان هەیە بۆگشت برادەران.

نامەی رۆژی 2/24/ تان گەیشت وبەرلەهەمووشتێك هەواڵی شەهیدبوونی(7) رۆڵەی تری بەجەرگی گەلەکەمان لەم کاتەناسك وقۆناغە نوێیەی خەبات دا، لەناخەوەهەژاندینی و بەوپەڕی ناسۆرو پەژاریەوە پێمان گەیشت، ئێمە لەکاتێکدا سەری رێزو نەوازش بۆگیانی پاکی ئەوحەوت شەهیدەوهەموو شەهیدانی تری رێگای ئازادی ورزگاری دائەنوێنین وسەرەخۆشیلەخۆمان وئێوەی تێکۆشەرئەکەین، لە هەمانکاتیش داسەبووری خۆمان و کۆمەلانی زۆرلێکراوی میللەتەکەمان بەوە ئەدەینەوە کەسەنگەری خەبات وبەرنگار بوونەوە هەرگیزچۆڵ نابێ و بگرە رۆژلەدوای رۆژ بەهێزترو تۆکمەتردەبێت بەرووی دوژمنان وداگیرکەراندا، گەڵێك رۆڵەی ئازاو دلێری وەك ئێوەی هەبێت کەخۆشی وئارامی لەخۆی تەرەکردبێ و گیانی خۆی بەخت کردبێ لەپێناوی پاراستنی شەرەف وکەرامەتی گەل و نشتیمانەکەیدا لەدژوارترین هەل ومەرجی خەبات وشۆرشدادرێژە بەبوونی خۆی بدات مەحاڵەئەوگەلە لەناوببریت وشوینەواری لەمێژوودا بسرێتەوە وەك فاشیەکان گەرەکیانەو خەوی پێوەئەبینن. ئەی هەرئێوەنەبوون کەدرتان بەتاریکی وتەم ومژی

دوای ئەنفالە بەدناوەکان دا وسەرلەنویٚ بانگەوازی هەڵگیرسانەوەی شۆڕشتان هەڵدایەوە لەسەرچیا سەرکەشەکان وپێدەشتەکانی کوردستان؟!

هەرئێوەنەبوون خەون وخەیالە نەزۆکەکانی دوژمنتان پوچەڵکردەوە کەدەیان ووت ئیتر شۆڕش وبزوتنەوەیکوردبۆ یەکجاری خامۆش بووەو هێزی(پ.م)لەناوچوون؟!

ئەوەبووسەلماندتان بۆهەمووان کە زەبروزەنگی دوژمن نەیتوانیوەو ناشتوانیٚ سەر بە تێکۆشەرە شۆڕشگێڕەکانی گەل نەوی بکات ولەڕێگای خەبات دووریان بخاتەوە، خۆراگری وبەگژاچوونەوەی هێزەکانی دژمن باشترین بەڵگەی ئەم راستییەن.

هاوڕێیان !

ئێمە هەست بە هەموو ئێش وئازارێکی ئێوەی دلێر و قارەمان ئەکەین ولەگەڵ ئەندێشەکانتاندا دەژین لەم بووارە ناهەموار و سەختەدا کە دووچاری گەل و جولانەوەکەمان بووە، پیروهۆشمان لەگەڵتانە، بەڵام دڵنیاشین لەوەی کەئێوەب ەبیروباوەڕێکی پۆڵاین و ورەیەکی بەرزەوە بەرەنگاری دوژمن دەبنەوەو درێژە بەخەباتی شۆڕشگێڕانەتان ئەدەن، دڵنیاین لەوەی کەپاراستنی گەل ونشتیمانتان خستۆتەسەروهەموو ویست وخۆشییەکی ژیانی خۆتانەوە کەئەمەش بالأترین سیفەتی تێکۆشەری کۆڵنەدەرو لەخۆبووردەیە. کۆمەلانی خەڵکی گەلەکەمان شانازیتان پێوەدەکەن وپەنجەی رێزوتەقدیرتان بۆدرێژئەکەن بەوەی وایەی لە سەردەستی پیاوە ئازاوخەباتگێڕەکانی کوردستاندا دوارۆژێکی گەش ورووناك ئاسودەیان بکا وبەسەربەرزی ژیان بەرنەسەر.ئاواتەخوازین هەردەم سەلامەت وسەرفرازوسەرکەوتووبن.

هاوڕێیان:خاڵەکانی ترینامەکەتان هەموویان پەسەندوبەجێن ولێیان ئاگادار بووین سەبارەت بەوانەی پەیوەندیبەئێمەوەهەبیٚ هەرلەئیستاوە دەستبەکارئەبین بۆ جێبەجێکردنیان.ئێمەش پێمان چاکە تەنها هەرلە رێگای مەلاسەعیدەوە ئیش

وکارەکان ئەنجام بدرێ وەك خۆتان نووسیوتانە.وائەمجارەش مەبلەغی (3500) دینارتان بۆئەنێرین لەبری یارمەتی مانگی(2)ی خۆتان هەروەها (1500) دیناریتریش بۆدابین کردنی یارمەتی(پ.م)ەکانی گەرمیان،خۆتان چەند بە مەعقول ئەزانن بۆیان رەوانەبکەن وئاگاداری وەزعیانمان بکەنەوە.

هەروەها ئاگاداربووین لەجەدوەلی حساب ئەوپارەیەی لەمانگی10 /88 وەپێتان گەیشتووە کەهەمووبریتیبووله(41)هەزار دینار سوپاستان ئەکەین، ئەوەی لای ئێمەگرنگ بێتەنهابۆ زانینی حسابەکەیەکەئێمەش تیا بەرپرسیارین بەرانبەر سەرەوە دەناحسابکردن لەگەڵ کەسانێکی خۆبەخت کەروتێکۆشەری وەك ئێوەدا نەنگی ودڵگرانیمانە ئەگەرناچاری و پێویست نەبێ.

نامەکەی هاورێ(حەمەرەش )مان پێگەیشت لەگەڵ تێبینی و روونکردنەوەیدا،جێگەی سوپاسەو بەجیا وەڵامی ئەدەینەوە.

ئیتر رێزوسلاومان هەیەو هەربژین بەخۆشی وسەربەرزی. *

براتان

حەسەن

1989/2/27

* سەرچاوە : رەشەبای ژەهرونەنفال/عەبدولاکەریم مەحمود

# نامەی دووەم بۆ کاك حەمەڕەش

**هاوڕێی هێژاوبەرێز کاکەحەمە**

سڵاویگەرم وبەئومێدی سەلامەتی وسەرکەوتنتانین..

رێزوسڵاومان هەیە بۆ یەکەیەکە پێشمەرگە قارەمانەکان وسوپاستان ئەکەین.

نامەی25.24 /2ت گەیشتەدەستمان زۆرخۆشحاڵ بووین بەزانینی هەواڵتان بەتایبەتی لەدوای ئەوکێشە ناهەموارەی هاتبووە رێگەکەتان دیارە بە هۆیکاری پێویست وگرنگە،وە ئێوە ش رووتان کردۆتە ئەوشوێنە، ئێمەلای خۆمانەوە پێ‌بەپێ متابعەی هەوالتانمان کردووە، هەروەهاخەڵکمان ناردووە بۆهەواڵ پرسینی ئەوماڵەی ئێوەی لێ‌بوون،خۆشبەختانە کوری ماڵەکەش بەربوو،هیچیان تووشی گێرمەو کێشە نەبوون.

هاوڕێی تێکۆشەر:بروابکە ئێوەی قارەمان وخەباتگێرهەمیشە وان لە بیروهۆشماندا، لەگەڵ ئازارەکانتاندا دەژین بەڵام دڵنیاشین لەوەی کەبیروباوڕی پۆڵاینی ئێوە لەهەموناخۆشی وزەبرو زەنگیکی دوژمن بە هێزترەو هەرگیزنەودۆخە ناهەموارە ناتوانی‌شوێز پێتان پی‌لەق بکا ولەسەرڕێگای تێکۆشان وشۆڕش لاتان بدات ، ئێوەی ئازاو دلێر باشترین و بەرزترین نموونەیتێکۆشەری شۆڕشگێری گەلەکەمانن کەبەرنگاری دوژمنی فاشی بوونەتەوەو نەخشەو پیلانەگلاوەکانیانتان بەتاڵ کردۆتەوە،دوژمن دەیەوی‌بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان خامۆش بکاو هێزی پێشمەرگە لە ناوبەری و بۆیەکجاری تەفروتونامان بکات، بەڵام نازانی فیداکارەکانی ئەم میللەتە هەموو خەون و خەیاڵە نەزۆکەکانیان پوچەڵ ئەکەنەوەو هەرگیز سەنگەری شەرەف وخەبات بەجی‌ناهێڵن وهەموو ویست وئارەزووەکانی خۆیان ئەکەنەقوربانی پاراستنی گەل ونشتیمانەکەیان.هاوولاتی یە ستەمدیدەکانی

کوردستان چاوەڕوانی دەست وبازووی ئێوەی کۆڵنەدەرو خۆڕاگرەوەی وای دوارۆژێکی گەشتان لیٚچاوەروان دەکەن. هەرئێوەجێگەی رێزو تەقدیرو شانازین، ئاواتەخوازین هەمووکات سەربەرز و سەرفرازو سەرکەوتووبن ، پێمان خۆش بوو کەچاوتان بەبرادەرەکەمان کەوت ولەگەڵ کاك عوسماندا نەخشەی کارکردنی داهاتووتان دانا،هەروەها ئاگاداری تێبینی و روون کردنەوەکەت بووین، لەسەر لیستەی ناوی (پ.م)ەکان کەژمارەیان (16) کەسە.

بەڵام پێمان چاکە بەڵکوبەفەرموویت یەکێك یان دوان لەو(پ.م)انەکەئەوانیتر واتە (16)کەسەکە بناسێت بۆئەوەی لەرێگای ئەو یەك دووکەسەوە بدرێن بەخەتێکی تروپێویستیەکانیان دابین بکریٚ لەگەڵ یارمەتی مانگانەیانا .

(6)(پ.م)ەکەی کۆن لەرێی برادەرەکانەوەیارمەتیەکەیان بۆئەنێرین کەبریتیەلە (420) دینار.

هاوڕیٚ.. دەربارەی ئەودووناوەی تر(...)ئەوەی کۆن خەڵکی سەنگاو بوو ئێستا لەئۆردوگای شۆرش دائەنیشیٚ بەڵکوبەفەرموویت خۆت نامەی بۆ بنوسیت بۆئەوەی لەسەرئەوە پەیوەندی پێوە بکریٚ.

ئەوەی شەهید(علوان)جیٚبەجیٚئەکەین وئاگادارتان ئەکەینەوە.ئیتر هیوادارین رەمزێك بۆ(16)پ.م ەکەدابنێن بۆپەیوەندی پێوەکردنیان لەرێگای ئەوناسراوانەی کەخۆتان دایان ئەنێن وەك(ناوەندی) بەرێز ئاگاداری کردوین.

دووبارەرێزوسڵاومان هەیەوئاواتمان سەلامەتی وسەرفرازیتانە.*

هەربژین..

براتان حەسەن

1989/2/27

* هەمان سەرچاوەپێشوو

# بروسکەیەك

**لە /مەکتەبی سیاسی**

**بۆ/ حەمەرەش ***

**دوای سلاو**

**سلاو وریزمان بۆگشت پیشمەرگەقارەمانەکان.**

**کاك محمودسەنگاوی وژمارەیەکی باش ئامادەن ولەسەرپین.**

**موشکیلەی ریگامان هەیە،ئەوشوینەی کاك رۆستەم و**

**برادەرانی لیگەراونەتەوە گیراوە.**

* رەشەبای ژەمرونەنفال/عەبدولاکەریم مەحمود/بەرگی یەکەم .

*لە1989/3/10جارێکی ترکاك حەمەڕەش وعوسمانی حاجی محمودومجیددووزی و کریم رەشید احمد لە دەواجینی مەلا بەنزین چاویان دەکەوی بە کاك عزیز و (ابوو علی)یش لەوێ ئامادەدەبێ.

لەیاداشتنامەکەی کاك حەمەرەشر دا بەم شێوەیە باس لەم چاوپێکەوتنەکراوە:

أ . لە دەواجنەکەی مەلابەنزین چاومان بەبرادەران کەوت،ئەودەواجنە نزیك کفری و چەندکیلۆمەترێك رۆژئاوای شار باشتر ئەودەواجنە لەلایەن هەڤالانی رێکخستنەوە ئیجارکرا،برادەرێك کرا بەلێپرسراوی ئیداری دەواجنەکە،ئیتر پەیوەندیەکانمان لەگەڵ رێکخستن جیبەجێئەبوو شێوازێکی زۆر باش وعەمەلی بوو.

ب . لەومەوعیدە دا کاك ابووعلی وکاك عەزیزمان بینی... کێن وخەڵکی کوێن.؟

ج . مەبەست لەوبینین وسەردانە دووهۆ بوو

1. گواستنەوەی خەتی پەیوەندیمان لەگەڵ رێکخراو لەدەواجنەکەی کاك حەمەی وەلی لەجادەی کەلار. دەربەندیخان بۆ جادەی کفری . دوز .

2. دانانی بەرنامەیەك لەگەڵ کاك عەزیز کەماوەیەك بوو کرابووە بەرپرسی رێکخستنەکانی کەلاروکفری.ئەوشەوەی کەرۆیشتین بۆسەرمەوعیدەکە ئەم ناوانەی خوارەوەبووین:

1. حەمەرەش      2. عوسمانی حاجی مەحمود

3. مجید دوزی      4. کریم رشیداحمد

شەولەگەڕانەوەدا بارانێکی زۆرزۆر لێیداین وتەواوشەکەت وماندووی کردین .

جگە لەچەك وتفاقی..پارتیزانی .لەلایەن رێکخراوەوەهەندێك شتمان بۆهاتبوو، وەك پێڵاو وەپاتریەکی 12ڤۆڵت بۆجیهازی گەورە،ئەوانەیش خۆمان هەڵمان ئەگرت،بەنسبەت پاتری بۆجیهازە ڕاکاڵەکە ئەبووهەر20.17رۆژجارێك بنێرین بۆپاتری چونکە هیچ ئامێرێکمان لانەبوو بۆشەحن کردنەوەی. )



# مامۆستا عەلی:
# پارتیزانەکانی داریخلە

ئەو گەلەی رۆڵەی وەکو پارتیزانەکانی هەبووبێ هەرگیز سەری نەوی نەکردووە و کۆڵی نەداوە..ئەو دوژمنەی بیەوێ گەلێکی ستەمدیدەی وەکو کورد ئاودیوی خانەی نەهامەتی بکات سەری لە بەردی هەڵوێستی مەردانەی بەرگریدەدات و لە بەرپێی پێشمەرگەی گیانبازدا دەپڵیشێتەوە.لەو هەلومەرجەدا کە پێشمەرگایەتی پێی نابووە قۆناغێکی سەختەوە،خەڵکە دڵسۆزەکەی لادێ راپێچی توونی مەرگ کران، دێهاتە بێ وەیەکان لە مەنجەنیقی تاوانی بەعسدا سووتان، پێشمەرگە پارتیزانەکانی یەکێتی لە هەڵسانەوەیەکی مێژووییدانەخشێکی نوێ وئەزموونێکی سەرکەوتوویان لە رەوتی رووبەڕووبوونەوە و داخکردنی دوژمندا تۆمارکرد.

ئەشکەوتی داریخلە لە دەرگایەکی گەورەوە پێی نایە ئاستانەی مێژووەوە، بووە رەمزی بەرگری و شانازی،بەڵام رمووزنی سرووشت دەستی نایە بینی ئاسوودەیی، ئەم ئەشکەوتەوخەونی 7 گوڵەئەستێرەی هەڵپرووکاند، 7 گیانی پڕ لە ئەوین بوونە قوربانی، 7 دڵی پڕ لە خۆشەویستی خاك بە دەسرازەی مەرگی ناوادە پێچرانەوە.

هۆ ئەشکەوتی داریخلە..! ئێمە رقمان لە تۆ نییە، تۆ بوویتە دیوەخانی میوانە پێشمەرگەکان ودەستی دڵسۆزیت کردەملیان.هەمووڕۆژێ لەپێدەشتی گەرمیانەوە دەڕوانینە بالآی بەرزت لەو بەرزییەدا یادی پڕ لە سۆزی خۆشەویستەکانمان لە دووتوێی دڵی بریندارى تۆدا دەکەینەوە و سەبووریمان پێدەگات.هەموو رۆژێ کە سۆمای چاومان بە بەژنی داری خلەدا دەڕوانێ سەرلەنوێ لەناو مناڵدانی خۆشەویستیمانداترپەی دڵی رۆڵەکانمان لەدایکدەبێ وجارێکیتریش بەوانەی خۆبەختکردن گۆشیان دەکەینەوە..هەرئەوانیش،زادەی هەلومەرجێکی نوێبوون بۆراپەڕینی سەرتاسەری کوردستان و رزگاربوون لەچنگی مەرگی دوژمن.



# شۆڕش بەم گوندەدا تێپەڕی
# داریخلە، خانەخوێکەی پارتیزانەکان

2020 /05/ 06
کوردستانی نوێ

م. عەلی

هەمیشە گوندەکان خانەخوێی شۆڕش و ماڵە جووتیارەکان دیوەخانی پێشمەرگە بوون، بۆیە لادێ و شۆڕش حمکانەی یەکتری بوون و لێکجیانەکراونەتەوە

داریخلە کە 750 مەتر لەسەر رووی دەریاوە بەرزە، لەهەموو گەرمیانەوە دیارە، سەردەمانێکی زوو ئەو بەرزییە چڕەدارستان بووە، ئێستا ئەو تەنیا دارە کە تەمەنێکی زۆری هەیە بەناوی خلکی یۆسوجانییەوە ماوەتەوە، نەك تەنیا خێڵەکانی جاف لە گەرمیان و کوێستانکردندا بەوێدا رەتدەبوون، بەڵکو دواتر چووە تۆماری مێژووی شۆرشیشەوە..ئەودەمانەی بەعس وەیشوومەی ئەنفالی هەڵکرد ودێهات قەرەچۆڵیبرا و کەس نەما بەوگوزەرەدا تێپەڕێ، تەنیا رێبوارانێك دڵیان نەهات سێبەری پڕ لە خەمباریی پیرە داریخلە بەجێبهێڵن پارتیزانەکانی یەکێتیی بوون.. ئەوان لەبەنا تاقەداردا،لە تەنیایی ئەوڕۆژگارەدا ئاوازەکانی ئاوەدانییان دەوتەوە، ئاوێزانی حیکایەتەکانی ئاسۆریی ئەو ساتە تاڵانە بوون..

پارتیزانیی ئەم قۆناغە ئەزموونێکی نوێی داهێنانی پێشمەرگانە بوو، لە سەردەم و زەمینێکی تایبەتدا خەملا و کەرەستەکانی رسکان، لەکاتێکدا رەشبینی سەراپای کوردستانی داگرتبوو..

ئەم هەڵوێستە جەربەزەیەی پارتیزانەکان لەخۆیدا وەڵامدانەوەیکی ددانشکێنی رژێمی کوردکوژی بەغداد بوو، کە ویستی بە ئەنفال شوێنەواری کورد لەسەربساتدا

بسرێتەوە. ئەشکەوت بووە هێمای عیشقی هەمیشەیی و جێمەزاری عاشقانی خاك و خەبات. ئەوان عیشقی هەمیشەیی نیشتمانیان لا بەرجەستەبوو, هەرکەس عیشقی نیشتمانی نەبێ تامی ئازادی ناچێژێ, خەونە ئاواتەکانی دەدزرێ.. لەنێوان رەتکردنەوەی چەوسانەوە و ملکەچیدا بەرگری خوێنین دەرسکێ، داستانی لەدایکبوونێکی پیرۆز تۆماردەکرێ، گیانی شەهید سەوزدەبێ..

مرۆڤی تێکۆشەر مەرگ هەڵدەبژێرێ, چوون لە واتای ژیان دەگا, بۆئەوەی خەڵکیی هەوای هەواری ئازادی هەڵمژن, لە بەربەرۆچکەی سەرفرازیدا بحەوێنەوە. فاکتی دوای ئەنفال وێرانەخاك و چۆڵەوانیی، خەڵکیی بێسەروشوێن، هیچ شتێك لە شوێنی خۆی نەمابوو، سەرەڕای هەموو هەڕەشە و رەشەبا و پیلانەکان، ئەو تفەنگبەدەستانەی مابوونەوە بەردەوامیی خەباتیان بڕیاردا و نەیانهێشت قوتیلەی ناو دەواری شۆڕش دابمرکێتەوە، بەڵام سروشت لەعاستیان بێبەزەییبوو، وەکو دێوەزمەیەك لە ساتەوەختێکی درەنگی زەردەپەڕی ئێوارەی رۆژی 1988/2/19دا هەڵیکوتایەسەریان و 7 گیانی دارماڵ لە خۆشەویستیی نیشتمان لە گەرووی بێدەنگیی ئەشکەوتدا نووقمبوون، کاتێ سەیید محەممەد و حەمەسۆران لە جیهازکردن گەڕانەوە ئەشکەوت دیارنەمابوو، برادەرەکانیانی قووتدابوو! ئیتر لەوڕۆژەوە هەموو ئێوارەیەکی 2/19ی هەموو ساڵێك حەوت قوتیلە لەناو دڵی ئەشکەوتی داریخلەوە وەکو یادەوەرییەکی خەمبار هەڵدەبن. هەرەسهێنانی ئەشکەوتی داریخلە هەست دەبزوێنێ, لە یەك چرکەدا 7 دڵسۆزی ئەم گەل و خاکە بنەژێر هەرەسی سروشتەوە و بۆ یەکجاریی ماڵئاوایی لە مەکۆی خەباتی رۆژانێکی دژوار بکەن, بەڵام ئەوان 7 مەشخەڵانی بڵێسەداربوون هەرگیز نەکوژاونەتەوە، هەمیشە لەتاریکاییدا دەدرەوشێنەوە. ئەوەی دوورونزیك شەهید مەلا ئەحمەد و هاوڕێکانی ناسیبێ دەزانێ ئەمانە چەند گەورەبوون, هەڵوێستیان

چەند مەزنبوو، مەگەر تراژیدیای هەرەسهێنانی ئەشکەوتەکە تەعبیر لە پایەبەرزییان بکات و گرێی نهێنیی دەورومەقامیان لای خەڵکی بکاتەوە..

گەر ڕۆژێك بیبلۆگرافیای شەهیدانی کوردستان تۆماربکرێ دەبێ لە رووبەرێکی بەریندا میرغوازێك بۆ ئەم 7 قارەمانە دیاریبکرێ تاکو نەوەکانی دواڕۆژمان بێبەشنەبن لە بەرامەی زانیاریی خۆبەختکردن و خۆنەویستیی ئەم رۆڵە جوامێرانەی کوردستان..

هەتاهەتایە شەهیدانی نەمر: مەلائەحمەد، حاجی حەمید، دارا، رەحیم، پوڵا، حەیدەر، سەلام لە ئەلبومی یادەوەری مێژووی بەرگری و هەڵسانەوەی شۆڕشی نوێدا بەگەورەیی دەردەکەون تاکو کورد بژی ئەو شاسوارە ئەنفالبەزێنانە بەزیندوویی لە قوتووی دڵی هەموو نیشتمانپەروەرێکدا دەژین.

چەند ساڵێك پێش ئێستا بۆ ڕێزنان لە گەورەیی هەڵوێستی ئەو نەمرانە پرۆژەی دیواربەندێکی گەورەمان بردە لای بەرپرسانی دارایی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەو بەرزایی داریخلەیە دروستبکرێ کە لەهەموو لایەکی گەرمیانەوە دەردەکەوێ و دەشبێتە جێ سەیرانێکی ناوازە تا هەمیشە یادی ئەو شەهیدانە و رووداوی هەرەسی ئەشکەوت و سەردەمی شوومی ئەنفال و پارتیزانیی لە یادەوەریی خەڵکیدا بەزیندوویی بمێنێتەوە، بەداخەوە ئەو پرۆژەیە کە گرنگیی خۆی هەیە رەتکرایەوە، ئێستاش پرۆپۆزەڵی ئەو پرۆژەیە هەرماوە.

لەگەڵ ئەوەشدا شەهیدانی ئەشکەوت بۆ خۆیان تۆماری رووداوێکی پرشنگدار و خوێناوین لە رەوتی مێژوویی جووڵانەوەی رزگاریخوازی گەلەکەماندا کە تایبەتمەندیی خۆیان هەیە لە ساتەوەختی سیاسی و دیدی پێشمەرگایەتی و رەنگوبۆی کەسایەتی پڕ بەپێزیان هەتاکو جۆرە تایبەتمەندییەك لە شێوەی شەهیدبوونیاندا هەیە کە چێژی خۆشەویستی وبیرەوەری کارەساتاوی دەبەخشێ..

ئەوانە رەمزی تەحەدایەکی نوێبوون لە بەربەرەکانیکردنی دوژمنانی گەلەکەماندا, شێوازی رەفزی خۆبەدەستەوەدانیان نەخشەکێشا لە دۆخێکی دژواردا, ئەوان دیاریی رێکخستنێك بوون قاڵبووی زەمینەی بەرگری و خۆبەختکردن، بەڵکو داینەمۆی جۆشدانی جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کورد بوون کە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەسەر کەلاوەی هەرەس زەنگی سەرلەنوێی خەباتی لێدایەوە, وا پەروەردەبوون کە جارێکیتر دەستی خۆبەدەستەوەدان بەرزنەکەنەوە، کوڕی شۆڕش چۆڵنەکەن, بۆیەش لەو زەمانەی ئەنفالدا بەو گیان و کردار و هەڵوێستە کۆککرابوون..چیتر چرای زەمینەی تێکۆشان خامۆشنەکرێ، بەڵکو بە خوێنی هیمەتی تێکۆشەرانی بڵێسەکەی ورشەدارتر بێ..

ئەمە یەکێك لە شانازییەکانی پێشمەرگە و پارتیزانەکان و یەکێتییە کە توانییان لە دۆخێکی وا بەرەنگاری زلهێزێکی سەربازیی ببنەوە کە گەورەترین تەکنیکی سوپایی و تاکتیکی لەناوبردنی گەلەکەمانی هەبوو، بۆیە شەهیدانی ئەشکەوتەکەی داریخلە نموونەیەکی بەرزی شێوە نوێی شەڕی پێشمەرگانەی سەردەمی شۆڕشی نوێیە کە داهێنان و ئەزموونی بەپێزی تیایە، کە لە بیری وردی ئەو قارەمانانە و پێداویستیی ئەو بارودۆخە هەڵهێنجراوە، شایانی ئەوەیە لەلایەن زانکۆکانی کوردستانەوە بایەخ بەو ماوە مێژووییەی شۆڕشی کوردستان بدرێ، لێکۆڵینەوەی وردی لەسەربکرێ.

---

* **ماڵپەڕی** کوردستانی نوێ 06 /05/ 2020

# کۆبوونەوەیەکی پێویست

<u>12 /1989/4 کۆبوونەوەی کاك حەمە ڕەش وهەڤاڵەکانی</u>

1989/4/16جاشەکان و کۆیتەر کێوماڵی دەوروبەری (کانی عبید) دەکەن.

1989/6/28کاك(کوردۆ قاسم)وکاك (محمودسەنگاوی)وکاك(فازل شیرەمەڕی)و (حەمە پاریۆلە و(حەمەچاوجوان و) مقدادبها الدین وسوهاد وماجد وحەمە ئێرانی و إبراهیم وئازاد قەرەویسی وماموستا یاسین و هەڵکەوت و د.هاوڕێ وکەمالەخڕە و حسن حاجی برایم و رئوف حاجی صابر و حەمەسیاسی و ماموستانەجم و هەژار و کاکەتوکنی)وچەندهەڤالی ترگەڕانەوەگەرمیان.

. 1989/6/29هەڤالان(کاك حەمەڕەش)وکاك (سیدجەوهەر)و(کاك شێخ کریم)و (مەلاسعید)و (احمدی حاجی رشید) لەگەڵ چەند پارتیزانێکی تردا لەگەرمیانەوە دەکەونە ڕێ بەرەوبارەگاکانی سەرکردایەتی (ی،ن،ك)..

. 1989/7/1دووژمن بە هێزێك کێوماڵی دەوروبەری (تەکیە)ی قەرەداغ دەکات.

1989/7/3. پارتیزانەکانی گەرمیان هەڤالان کاك شێخ کەریم و هاورێیانی لەگەڵ هەڤاڵ کاك محمود سەنگاوی کاك کوردۆ وهەڤاڵەکانیان یەك دەگرنەوە....

*1989/7/4 لەگەڵ کاك حەمەڕەش وحەمە ئاخەو هەڤاڵەکانیان لە چیای ئاشداخ یەکدەگرنەوەپێکەوە دەچنەسەردانی پارتیزانەکان لای مەریوانی حاجی حسین و مەلا سعید واحمدی حاجی رەشیدوهەڤاڵەکانیان لە لەنێوان تیلەکۆ. مەلا هۆمەر.

1989/7/10لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی محمودوهەڤاڵەکانی لەقوولایی گەرمیان یەك دەگرنەوەخۆیان سازدەدەنەوەودەچنەسەردانی هەڤاڵانی ڕێکخستنی سلێمانی. لەوێ لەرێی کاك عزیزو کاك احمدکوڵکنی یەوە پەیوەندی دەکەن بە(لالەسەرحەدی روغزایی وکاکەحەمەی حاجی محمودی هارونی و کاك عوسمانی مام کریم ... چەند هاوکارێکی تری پارتیزانەکانەوە.)

*شەوی1989/7/18

لەپاڵ(ئەشکەوتی داریخلە)سەردانی هەڤاڵ(سیدمحمد)وهاورێکانی دەکەن.

# دەورەتەسلیم

1989/7/23

وەك لەرۆژ ژمیرەکەی هەڤاڵ حەمەرەش دا یاداشت تۆمارو کراوە لە رۆژی23 /1989/7 کاك حەمەڕەش هەمووچەك و تەقەمەنی وباقی پێداویستیەکان تەسلیم بەکاك مەحمودسەنگاوی دەکات: (ئەمڕۆلەگەڵ کاك مەحمودسەنگاوی دەورو تەسلیممان کرد ئەم شتانەی خوارەوەمان پیشان دان وئاگادارمان کردن وتەسلیم مان کردن، بۆبەڵگەیش هەردوکمان ئەم نوسراوەمان ئیمزاکرد:

1. جیهازی(راکاڵی)گەورە دووجیهاز، یەکێکیان ئیش ناکات.
2. موجەفیرە = یەك دانە
3. جیهازی باشا یەك دانە زۆربەمەزبووتییە.
4. تەجەیزقودرەی ڕاکاڵ سێ دانە یەکیان ئیش ناکات.

. ئیمەئەم چەکانەشمان بەم شێوەیە داوەپێیان وئاگادارمان کردن:

5. کەلاشینکۆف(11 دانە)کەلاشینکۆف دوانیان لەهەژارئاوا شکاون.

3 سێیان لای حەمەپاریۆڵەیە ،6شەشیان ئەحمەد زەرداوی دایناوە.

6. قەناس یەك دانە کەدراوە بەکاك کوردۆلەگەڵ کلاشینکۆفێکی موزەلیدا، کلاشینکۆفێکیش دراوە بەکاك سید محمد.

7. بیکەیسی یەك دانە کاك حەمەئاخە دەزانێ لەکوێیە.

8. ئار بیکەی 2دوودانە یەکێك لای کاك ئەحمەدزەرداوی وئەویترهینی رستەکەی کاك ئازادبوو لەگەڵ بیکەیسی یەکدا.

9 ـ بیست وسیٚ ئارپیجی کە دووانیان هین کاك جەوهەرو هەشتیان هینی کاك شیٚخ کریم و 13سیانزەیان هی کاك عوسمان حاجی مەحمود وپیشانی پ.م صباح وعوسمان مەلاجەمیل دراون.

10 . سی وشەش کلاٚشینکۆف کە20بیستیان هی کاك عوسمانەو10دەیان هینی کاك جەوهەرە و6 شەشیان هینی کاك شیٚخ کریم بوو. شویٚنەکانیان پیشان کاك صباح وعوسمان ملاجمیل درا.

11 ـ سیٚ BKC یەکیٚکاك عوسمان ویەکیٚکاك شیٚخ کریم و یەکیٚکاك جەوهەر،ئەوەی کاك کریم کاك حەمەئاخەئەزانیٚ،ئەوەی کاك جەوهەرکاك کامەران ئەزانیٚ،ئەوەی کاك عوسمان لای خۆیانە.

12 ـ 4 چواردیکتارۆف سیٚیان لای کاك عوسمان وئەوی تریان صباح وعوسمان ئەزانن.

13. 1 یەك برنەو هینی کاك کریم بوو،صباح ئەزانیٚ

14. 3 سیٚ ژ.3 صباح وعوسمان ملاجمیل ئەزانن.

15. 2 دوو قەناس کەلای کاك عوسمان حاجی مەحمود ن.

16. 2 دوو ئارپی کەی کەلای کاك عوسمان حاجی مەحمود ن.

17. 7 حەوت ئارپی جی کەیەکیٚکیان شکاوە،

کاك حەمەئاخە هەمویان ئەزانیٚ.

18. 1 یەك ئارپیجی ترماز لای احمد زەرداوی یە ئەودایناوە.

| | |
|---|---|
| واژۆ | واژۆ |
| وەرگر/محمود سەنگاوی | حەمەرەش |
| 1989/7/23 | 1989/7/23 |

## ناوی ئەوپێشمەرگانەی
## لەگەڵ کاک حەمەرەش گەرانەوە بارەگاکانی سەرکردایەتی

*لە 1989/7/29پارتیزانەکان کولیچەونان دروستدەکەن وئامادەی دەکەن..

*1989/7/30 لەشاخی(ئاشداخ)ەوە کاک حەمەرەش وهاورێکانی خواحافیزی لە کاک مەحمود و هەڤاڵانی دەکەن وبەرەوسەرکردایەتی بەرێ دەکەون،کەبریتی دەبن لەم هەڤاڵانە:

1. محمد شێخ کریم عیسی(حەمە رەش)
2. کریم احمدخدر ج ف ت
3. جەوهەرلەتیف محمد ف ك
4. احمدحاجیرشیدعباس ف.ك
5. یاسین عبدول محمد ف.ك
6. نازم نجم احمد ف.ك
7. سعید احمد رێکخەری کۆمەڵە
8. اباهیم حسین(مەریوان) ف.ك
9. عادل عبدالقادر رحیم
10. جەعفەرلەتیف محمد
11. فازڵ احمدخدر
12. بابا محمد سعید
13. عبدوالرحیم نامق رحیم
14. جمال محسن جەوهەر
15. نادرمجیدجوامێر

16 . محمدکریم جەوهەر

17 . غائب حسین علی

18 . حسام علی محی الدین

19 . هونەرعلیمحمود

20 . رزگار رەئوف

21 . خەبات حسن

22 . علی احمدمحمد

23 . جەمال صابر

24 . قادرمحمد فەرەج

25 . کامەران سعیدمحمد

26 . علینوریدەروێش

27 . شکور محمد سلێمان

28 . رحیم رشیدمحمد

29 . برهان عبدالرحمن

*لەنێوان 1989/7/25هەتا31 7/1989

کێومالّی ناوچەکانی گەرمیان لەلایەن جەیش وجاشەوە بەردەوام دەبێت، دۆلّ بەدۆلّ بەدوای پارتیزانەکاندا دەگەڕێن..

*لە1989/8/10تا1989/8/17کێومالّوگەڕان بەدوای پارتیزانەکاندا درێژەی دەبێت، لەو ماوەیەدا کاك محمودسەنگاوی چەندجارێك بەجیهازی ڕاکالّ پەیوەندی بەسەرکردایەتی و(د.س)ەوەدەکات ولەبارودۆخی گەرمیان وپارتیزانەکان ئاگاداریان دەکاتەوە.



## بروسکەی هەڤاڵ مام جەلال

<u>*لە1989/9/13هەڤاڵ مام جەلال ئەم بروسکەیەیان بۆ دەکات:</u>

**لە/ مام جەلال**

**بۆ/** محمودسەنگاوی

(**هەندێ میوان دێنەلاتان..**

**ئەوانە میوانی منن،هەرچی لەتواناداهەیە بۆیان بکەن ...)***

*1989/9/14 جارێکی تررژێم بە هێزێکی زۆری سوپاوجاشەوە دەست دەکاتەوە بەکێوماڵکردنی ناوچەکانی گەرمیان..

بۆگەڕان بەدوای پارتیزانەکاندا....

*17 /9/ 1989 هەڤاڵ عوسمانی حاجی محمود دوای مانەوەی پترلەساڵێك و پێنج مانگ لەگەرمیان بەپارتیزانی لەگەڵ چەند پارتیزانێکدا دەکەونەڕێ بۆبارەگاکانی سەرکردایەتی لەسنوورەکانی عێراق ـ ئێران.

*1989/9/19کاك محمودسەنگاوی ودەستەیەك لەپارتیزان دەچنە شوێنێکی دیاریکراووچاویان دەکەوێ بەهەڤاڵانی(ڕێکخراویسلێمانی) کەبریتی دەبن لە (کاك حمەنوری وسدیقی حاجی سعید (هاوڕێ‌سوپا) هەرلەوێ میوانەکانی(هەڤاڵ مام جلال) یان تەسلیم دەکەن ..

* ئەومیوانانەسەربەجەماعەتی(لەشکری بەدر)دەبن وبەیانەوێ‌بۆکاروباری خۆیان بۆناوەڕاست وخوارووی عێراق یارمەتی بدرێن هەتابچنەخوارێ / نووسەر

*1989/9/29جارێکی تر رژێم کیوماڵی دەوروبەری(تەپەعارب)دەکات.

*لەئەیلولی1989دا(سەلامی کویخا)و(محمودی مامەعەزە)و(صدیقی سۆفی مجید)و (صدیقی علی تۆفیق)و(کاك فەلاح)و(هوشیار عبد محمد)و(کاك احمدB.K.C)و (احمدی حاجی عزیز)لەگەڵ چەند پارتیزانێکی تردا دەچنە شاخی(بەمۆ وخوشك) ماوەی دوو مانگ لەوێ دەمێننەوە.

* لە1989/10/1مەتا10/24 1989

دوژمن چەند جارێك کێوماڵی بەشی هەرە زۆری گەرمیان دەکەن،بەتایبەتی دەوروبەری گوندەکەلاوەکانی(کویك،فقێ مستەفا، سەرقەلاً،حەسەن کەنوش،درۆزنە، مەسۆیی، قولیجان،باوەکر، کانی عبید،دوبراو، جامرێز،قادراوا...)

*لەمانگی ئۆکتۆبەری ساڵی 1989 دا کاك عوسمان حاجی محمود و (10) پارتیزان دەگەنەوە سەر سنوری ئێران .

*لەنێوان 1989/10/25تا29 12/ 1989پارتیزانەکان لەگەڵ ژیانی نێو ئەشکەوت وحەشارگەکان ودوور لە ئاوەدانی وململانێ لەگەڵ سەرماو سۆڵە. درێژە بەخەباتیقارەمانانە دەدەن .

*1990/1/9 لەجیهازی(م.س)ەوە بروسکەیەکی رێکخراوی سلێمانی لەلایەن کاك جەباری حاجی رەشید(حسن حسین)ەوە،دەگاتەکاك محمودوهەڤاڵەکانی:

لە/ حسن حسین

بۆ/ محمودسەنگاوی

(شەوی1990/1/20لەخوارشاری کفرییەوە،لای یەکەم تاوەری کارەبا،لە رۆژهەڵاتی جادەکەیە، بۆلای رۆژئاوای جادەکە دەپەڕێتەوە، بەردێکی سپی لە ژێردا دانـراوە، لای ئەوتاوەرە کارەبایەدا ئامادەبن. بۆپـەیوەندی کردن لەگەڵماندا ..)

* لە 1990/2/1 هەتا 1990/3/17لەگەڵ ئەوەی کاك محمودوکاك کوردۆقاسم و چەندهەڤاڵێك تووشی نەخۆشی (گرانەتا)دەبن،رژێمیش خەریکی کێومالّی ناوچەکە دەبێت.. بەلاّم هەمووئەمانە کۆڵیان پیّنادات.

* لە1990/4/3

جارێکی ترکاك عوسمانی حاجی محمود لەگەڵ چەند لە هەڤاڵەکانی لە بارەگاکانی سەرکردایەتی یەوە دێنەوە خوارێ بەرەوگەرمیان،لەگەڵ کاك محمود سەنگاوی و کاك کوردۆ و هەڤاڵەکانیان یەك دەگرنەوە.

*لە رۆژی 4/12 1990

کاك محمودوهەڤاڵەکانی دەورە تەسلیم لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی محموددەکەن و دەکەونەڕێ بەرەو بارەگاکانی سەرکردایەتی لەسەرسنوور..

*لە/4/15 1990

هەڤاڵ کوردۆقاسم وکاك محمودسەنگاوی وچەندپارتیزانێکی تر دەگەنەودێی (مامەخەلان)و بارەگاکانی (ھ.پ.ك).

. لەمانگی مایسی 1990دا دوو پێشمەرگە لەکاتی ئەنفال دا کەبەرەزامەندی تەسلیم بوونەوە لە ڕێکخستنەکانی ناوشاردا زۆرچالاك بوون وزۆرهاوکاری پارتیزانەکان بوون وهاتنەوە گەرمیان، ئەوانیش (جمعە مجید داودی)و (فایق کەلاری) بوون .

. لەمانگی تمووزی 1990دا

هەڤاڵ سید جەوهەر و(8) پارتیزان گەڕانەوە بۆ گەرمیان

. لە تمووزی1990دا

کاك رئیس ودەستەیەك پێشمەرگە گەیشتنەوە قەرەداغ

. لە 1990/11/24 کاك حەمە ڕەش وهەڤاڵەکانی گەیشتنەوە گەرمیان

ئەوانیش بەرنامەی ڕاپەڕینیان پیّ بوو.

. شتێخ محمد شێخ کریم عیسی(حەمە ڕەش)کەسنەزانی لە شێخانی کربچنەیە.

. لە ساڵی 1957 لە گوندی هۆمەرامانی ناوچەی قەرەداغ چاوی بەدنیاهەڵێناوە.

. خوێندنی سەرەتایی لە سەنگاو تەواو کردوە .

. ساڵی 1974لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا پەیوەندی کردوە بە شۆرشی ئەیلولەوە وبووە بەپێشمەرگە لەهێزی (رزگاری)

. دوای گلانی ئەسپی ئەیلول بۆتە پۆلیس لە ( سلێمانی،کەلار، سەنگاو ) دژی دزو جەردە و تاوانبار دەیان چالاکی نواندوە .

. ساڵی (1977) پەیوەندی کردوە بەکۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە .

. ساڵی (1978) خەباتی شارو شاخی پێکەوە گرێداوە بوە بە پێشمەرەگە لە هەرێمی (1)ی یەکێتی نیشتمانی کوردستان .

. لە دەیان چالاکی و نەبەردیدا سەمای مەرگی لەسەر جەستەی داگیرکەران ساز کردوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پلەی کۆڵ نەدەری دراوەتێ .

. ساڵی (1980) بوە بە فەرماندەی مەفرەزە لە جەباری .

. ساڵی (1981) کراوە بە فەرماندەی مەفرەزە لە کەرتی بازیان .

. ساڵی (1982) کراوە بە جێگری فەرماندەی کەرتی (3) ی هەمەوەند .

. ساڵی (1984) کراوە بە فەرماندەی کەرتی (3)ی هەمەوەند .

. ساڵی (1985) کراوە بە جێگری فەرماندەی تیپی (57) ی سەگرمە .

. ساڵی (1986) کراوە بە فەرماندەی تیپی (51) ی گەرمیان .

. ساڵی (1987) گواستراوەتەوە بۆ فەرماندەی تیپی (53) ی شێروانە .

. وێڕای پێنج جار برینداربوونی ڕۆڵی گرنگ و بەرچاوی لەم داستان و نەبەردیانەدا بینیوە: . شەڕو نەبەردیەکانی گرتنی سەنگاو

. داستانی گرتنی بێتواتە / نەبەردی دۆڵە ڕەقە

. داستانی ڕزگاری / نەبەردییەکانی شارباژێڕ

. داستانی قەیوان ماوەت / نەبەردی زیندانە

. یەکەم ڕەبیە لە شۆڕشی نوێدا لەسەر دەستی حەمە ڕەش گیراوە

. لە ساڵی (1982) لەسەر جادەی چەمچەماڵ / سەنگاو لە ئەنفالەکان دا هەزاران هاوڵاتی و پێشمەرگەی لە دەستی ڕژێم ڕزگار کردوەو گەیاندونیەتیە ناوچەی ڕزگار کراو ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە بەتایبەتی دوای ئەنفالی (1و3) لەسەر داوای خۆی لە ناوچەکانی سنوری گەرمیاندا ماوەتەوە ،دواتر بۆتە فەرماندەی هێزەکانی پارتی زانی لە گەرمیان بەهۆی یارمەتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە لە سلێمانی توانیان بنکەو بارەگای هێزی پێشمەرگە لە سنوری گەرمیان و قەرداغ و بازیان دروستبکەنەوە،هەر ئەم بنکانەش بوون بەناوەندی ڕێخستنی جەماوەرو پەیوەندی کردن بە پێشمەرگەی کۆن وڕێکخستنی دابڕاوی یەکێتیبۆ سازدانی ڕاپەڕینی ئاداری 1991..

. لە ڕاپەڕینی بەهاری 1991 دا شاری کفری بەسەرپەرشتی شەهید ڕزگار کراوە ، بۆ هاوکاری هەڤاڵ (عوسمانی حاجی محمود ) وهاوڕێکانی بەرەو (دووز ) کەوتۆتە ڕێ بەڵام لەڕۆژی 1991/3/11 دوای ڕزگار کردنی دووز لەسەر جادەی ( دووز / تکریت ) بە گوللە هاوەن بریندار بووە بەنیازی گەیاندنی بە نەخۆشخانەی سلێمانی هاوڕێکانی بەرەو کفری بردویانە بەڵام لە نزیک ( سلێمان بگ ) کەوتۆنەتە کەمینی ( مجاهیدینی خەلق)ەوە لەگەڵ دوا سەفەری شەهید بونیدا دوا نیگای لەسەر وێنەی( ڕۆژان و کەژوەست) جوتە کیژۆڵەو( کاروخ)ی کورە تاقانەی لێکناوە . هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی.



## مامۆستا جەلالی شێخ کەریم *
## ئاوا بیرەوەریەکانی دوا دیداری
## لەگەڵ شەهید حەمەرەش دەگێڕێتەوە

ڕۆژی ٢٠١٧/٩/٣ سەردانی بارەگای سەرەکی پارتیزانەکانی گەرمیان و قەرەداخ وبازیانمان کرد کە بارەگای شەهید حەمە رەش بوو بە شوێنی جیهازی راکالە کە ناسراو بو. ئەشکەوتێکی زۆر گەورەو لەشوێنێکی زۆر سەختدایە کە خەلکی ناوچەکەش زۆر بەکەمی شارەزای ئەو ئەشکەوتەن لە دورەوە دیار نیە دەمی ئەشکەوتەکە زۆر گەورە نیە .بنە هەنجیرێکی گەورە لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدایە بە شاخی سەگرمەوەیەلەنیوان سنوری هەردووگوندی زەردەلیکاووقەلای تەپەگەروس. .من وبەرێز کاك ئاواتی شێخ جەناب جارجار بۆسەردان یان بۆ ناردنی بروسکەبۆ مەکتەبی سیاسی وکاك نەوشیروان سەردانی ئەو ئەشکەوتەمان ئەکرد..رۆژی ١٩٩١/٣/٦ سەعات ٧ ی بەیانی بۆ دواجار خواحافیزیمان لە شەهید حەمەرەش کرد ئەو بۆ کفری و من و کاك ئاوات بۆ سلێمانی لەو ئەشکەوتە .. شەوەکەی تا بەیانی لە خۆشی رابەریندا نەخەوتین ..وتمان. رەنگە یەکتری نەبینینەوە ....

ئیدی یەکتریمان نەبینیەوە....

**جەلال شێخ کەریم**

**٥ سبتمبر ٢٠١٧**

* پارتیزانی و کۆنەدان.. پێش ساڵی ١٩٩١ لەکاتی ئامادەکاری و خۆسازدان بۆ ڕاپەڕینە مەزنەکە.. ئەشکەوتی بارەگای سەرەکی پارتیزانەکانی گەرمیان (بارەگای شەهید حەمەرەش) لەزنجیرە چیای سەگەرمە پشتی گوندی قەڵای تەپە گەروس..



# دەفتەرە بچکۆلانەکەی بەرباخەڵی حەمەرەش

## له دەفتەرە بچکۆلانەکەی بەرباخەڵی کاك حەمەرەش دا ئەم چەندیرەی لای خوارەوە یاداشت کراوە:

*یەك شەممە 989/2/19

دنیا ئارام بوو .لەسەعات 12 دا دووکۆپتەرهاتن وەیچی ترنەبوو.

مام جەلال گەڕابوو وە.وتیان مساقی جەبهەی عیراقی تەوقیع کراوە.

سەعات پێنج ونیوئێوارە قەڵبەز روخا بەسەرشەهید مەلاأحمدو هاوڕێکانیان.

* دووشەممە 989/2/20

لەمەقەڕبووین ئێوارەسیدمحمد بروسکەی کرد وتی کاك مەلاأحمدو

شەش پێشمەرگە بەهۆیروخانیقەڵبەزەوە شەهید بوون.

شەوسەعات 9 کەوتینەڕێ تاسەرچەمی مامەران.

* سێشەممە 989/2/21

بەرێوەبووین لەگەڵ کاك شێخ کەریم وەونەرو کەریم بەرەو سیدمچەو

شلان کە کاکەمەلاأحمدوشەشر ڕۆڵەیگەلەکەمان شەهیدبوون.

* لە شەوی 22.21ی شوباتی 1989 کاك حەمەڕەش و

کاك عوسمان حاجی محمود سەردانی هەڤاڵانی شاردە کەن و

چاویان بە کاك عزیز دەکەوێت وهەرهەمان شەو دەگەڕێنەوە....



# پارتیزانی لەبیرەوەری یەکدا

دوابەدوای دەستپێکردنی ئەنفالی سێی گەرمیان،پاش بەرگریەکیقارەمانانەی زۆر بڕیاری شەڕی پارتیزانی دەبێتە پێویستییەکی حاشا هەڵنەگر،دەستەیەك لەو پارتیزانانەی گەرمیانِ کەبریتی دەبن لە(سامی ئاسایش،شەهید بورهان،مەلاکەریم، حاجی عوسمان ،کاك خالید،کاك هەیاس،کاك دڵشادی عەدەدجیهاز ،کاك فەرهاد ، کاك شوان.کاك جەماڵ زرگوێزی،کاك بەکر فەرماندەی کەرت لەتیپی57ی سەگرمە، کاك کوردۆ سور،کاك عومەر کەرکوکی)بەسەرپەرشتی کاك عەدنانی حەمەی مینا بەرەو بنار دەڕۆن و دەچنە گوندی(بانی مۆرد)بۆ شەوی دووەم دەچنە قۆپی قەراغ لەوێ دەمێننەوە،ئەوشەوە دنیا زۆرسارد دەبێ،لەبەرئەوەی هیزەکە هەندێ منالْ و عایلەی پیشمەرگەیشیان لەگەڵ دەبێ، بەناچاری بۆ شەوی سێیەم بەڕێ دەکەون، شەوەکە ئەوەنە تاریك دەبێ،بۆئەوەی دانەبڕێن،دەست بەپشتی یەکترییەوە دەگرن، بۆشەوی چوارەم دەچنە(قازان قایە)لەوێوە بەڕێ دەکەون بۆ ئەوەی لە جادەی ئەلاییەوە بپەڕنەوە،لەلای ئەلآیی ڕێگاکەیان لیْ تێکدەچێ، تا دۆزینەوە نزیك دەمەو بەیان دەبنەوە،هەربۆیە دەچنەگوندیْ(تیمار)ئەوڕۆژەعەسرەکەی لەلایەن حکومەتەوە تەقەیەکی زۆردەکرێ،بەلاّم ئەوان هۆکارەکەی نازانن،دواتر دەزانن بەهۆی گرتنەوەی (فاو)وە بووە،لەوێوە بەرەو سەرزێ دەڕۆن،دوای کیمیابارانکردنی گۆپتەپەو هێرشی ئەنفالی چوار،دەگەڕێنەوە بۆ سنوری گەرمیان، لەسنووری چەمچەماڵەوە دەپەڕنەوە وبەچەند قۆناغ دەچنە نزیك گوندی مەملەحە،لە نزیك گوندەکە بنکەیەك دروست دەکەن، لە بەرئەوەی خواردنیان کەم و وەزعیان خراپ دەبێ، کاك عەدنان

پێیان ئەڵێ: هەندێکتان بچنە ئەو گوندە بزانن چی دەگوزەرێ، هیچ نەبێ هەندێ خواردن دابین بکەن،چەند کەسێك دەچنە ناوگوندەکەوە،هەندێ ئەشیاکۆدەکەنەوە. کە دەگەڕێنەوە بنکەکە، ئیشەکان دابەشدەکەن،کاك خالید خواردن دروست دەکات، کاك سامی وحاجی عوسمان وکەسێکی تر نان ساجی دروست دەکەن،کاك عومەر و کاك کوردۆسور و کاك بەکر ئەشیاکۆدەکەنەوە،هەرکەسەخەریك کاری خۆی دەبێت، شەوێك هەست دەکەن پڕ ناو گوندەکە جاشە،تێیان دەخوڕن ئێوەکێن..؟

بۆهاتونەتە ئەم سنورە..ئێرە سنووری ئێمەیە..خۆیان وەك جاش نیشاندەدەن ، ئەوانیش ئەڵێن: هاتوین..بە دوای کەس و کارماندا ئەگەڕێین..بە دەم قسە کردنەوە دەچن بەرەولایان، کەنزیکیان دەبنەوە..خۆیان ئاشکرا دەکەن،ئەڵێن:راستی ئێمە پێشمەرگەین،ئەوان زۆردەترسن.قسەیان لەگەڵدەکەن:حاڵی کوردستانتان بینیوە؟ گوندەکانتان بینیوە، چیان لێ بەسەر هاتووە..؟

ئەوانیش ئەڵێن:ئێمەیش یارمەتی خەڵکمان داوە، مەبەستمان خراپەکاری نییە..

بەهەرحاڵ ئیزنیان دەدەن،جاشەکان دەڕۆن، ئەوانیش بەپەلە دەگەڕێنەوە بۆ لای هاوڕێکانیان،دوای نانخواردن وپشوویەك،ئەوشوێنەیش بەجێدێڵن و بەڕێ دوکەون بەرەو قەیتول و گۆلباخ، حاجی عوسمان لە پێشەوە ڕێنماییان دەکات..

شەوشتێك لەناوگوندەکە بریسکە دەداتەوە، دەکەونە گومانەوە،دوایی بۆیان دەردەکەوێ کە ئەوە خانوەکەی (کاکەڕەش)ە پێشترسوتێنرابوو، بریسکەی ئاگری هیشتا هەر تێدا دەبێت، ئەو شەوە لە سەروی گوندەکە لە دۆڵێکدا دەمێننەوە، شەوی دواتر دنیایش زۆر ساردەبێ، بەڕێ دەکەون بەرەو(کۆیك) و(فەقێ مسەفا) و(زاوت)ئیتر هەرلەو سنورە دەمێننەوە، لەگەڵ (مەفرەزەکانی شەهید حەمەڕەش و مەلائەحمەدکەلاری وسەیدمحمد و مەفرەزەکانی کاك عوسمانی حاجی محموود و هاوڕێکانی شەهید مەحموودی مامەعەزە) درێژەبەخەباتی پارتیزانی دەدەن.



**شەهیدی فەرماندە محمود عەزیز**

**ناسراو بە (مەحمودی مامە عەزە)**

# سەرەتای پەیوەندیکردنی بە شۆڕشەوە

**شەهیدی فەرمانده(محمود عەزیز) ناسراو بە (مەحمودی مامە عەزە)**

لەساڵی 1954 دا لە گوندی هۆرینی بناری بەمۆ لە خێزانێکی هەژاری کوردپەروەر چاوی بەدنیا هەڵدەهێنێ، بەگەورە بوونیشی لەئاسۆی گەلی کوردی دەڕوانی وهەست بە لێپرسراویەتییەکی زۆر دەکات بەرامبەر ئەم خاکە بێنازە کە لەلایەن رژێمی دڕندەوە بەخراپترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرا..

لە 1978دا پەیوەندی دەکات ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و (هێزی پێشمەرگەی کوردستان)ەوە، لەناو جەماوەری ناوچە رزگارکراوەکاندا کەسێکی خۆشەویست و خۆنەویست و ئازاو بەخشندە دەبێ کە هەمیشە لەناو هاوڕێکانیدا کەسێکی قسەخۆش وخاوەن خۆشەویستییەکی زۆر بووە...

## - چەندین پلەی وەرگرتووە

چەندین پلەی بڕیوە وەکو پلەی پێشمەرگایەتی و پلەی فەرماندەی مەفرەزەو فەرماندەی کەرت و فەرماندەی تیپی سەر لەشکر، هەروەها هەمیشە لەسەنگەری پێشەوەی داستان و نەبەردەکانی هێزی پێشمەرگەدا بووە، چەندین داستانی پڕ لە سەروەری بۆ گەل ونیشتمان لەناوپەڕەکانی مێژوودا تۆمارکردووە،ئەو داستانانەی کە شەهید رۆڵی بەرچاو و کاریگەری تیایدا هەبووە وەکو داستانەکانی ئاڵان و حاسل و داستانی رزگاری و شەڕەکانی قەیوان ماوەت و گرتنی مەعەسکەری دووداره‌و شەڕەکانی دەشتی گەرمیان و دۆڵی قەرەداغ و شاخی زەردە، هەروەها لەدوای کارەساتی ئەنفال یەکەم فەرماندە بوو لە گەرمیان کە بڕیاریدا بە پارتیزانی لەگەڵ خێزان ومنداڵەکانی ومەفرەزەکەیدا لە دۆڵی قەرەداغ وگەرمیان بمێنێتەوە و خاکی نیشتمان بەجێنەهێڵێت

## ـ خۆراگری شەهید وەك شاخی بەمۆ

شەهید محمود خەباتگێرو پارتیزانێکی خۆڕاگر بووە، لەکاتی پارتیزانیدا لەلایەن چەندکەسێکەوە خیانەتی لێدەکرێ وبەکارەساتێکی دڵتەزێن لەئەشکەوتی دەربەند سورین برایەك وکوڕە گەورەکەی وپێشمەرگەیەکی هاوسەنگەری شەهید دەکرێن و خێزان ومنداڵەکانیشی برینداردەبن،ئەوانیش شەهیدان قارەمانی مامەعەزەو شێرکۆ مەحمودی مامە عەزەو محەمەد علیاوەیی بوون،ئەم کۆسپە گەورانە هیچی لەقارەمانیەتی کەمنەکردەوە،هانیاندا درێژە بەخەباتی پارتیزانی بدات تا راپەرین. هاوسەریشی رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لەرزگارکردنی بناری بەمۆی دەربەندیخان و خانەقیندا. شەهیدچۆن لە خەباتی شاخ و پارتیزانیدا پێشڕەو بوو،لەخەباتی شاریشدا کادرێکی دڵسۆز بووە، لەساڵی1993دا لە هەوڵێکی بێ وێنەدا لەسەر ئەرکی خۆی وحکومەت دوای ماندووبوونێکی زۆر، توانی کارەبا بگەیەنێتە زۆرێك لە گوندەکانی بناری بەمۆ.شەهیدی فەرماندە مەحمود عەزیز کەسێکی راستگۆو دڵپاك و بەخشندە بوو،چەندین کێشەی کۆمەلایەتی بەئاشتی چارە کرووە، هەر لەبەرئەوەش بوو لەلایەن دانیشتوانی بناری بەمۆ هەڵبژێردرا بە سەرۆك عەشیرەتی شەرەف بەیانی ،هەروەها تا دواساتەکانی ژیانیشی ئەو شەرەفەی بە دڵسۆزی و ئەمانەت ولەخۆبووردەییەوە خۆبەخشانە پاراست، شەهید هەمیشە خۆشەویستی دانیشتوانی ناوچەکە بوو بەتایبەتی بناری بەمۆ، بەڵام مەخابن ئەم رۆڵە دڵسۆزە لە رۆژی 1996/10/12 دا لەناوچەی سەرتەکی زێدی باب و باپیرانی شەهیدکراو چووە کاروانی نەمران، هەروەها لەپاش خۆشی (5) منداڵی چاوگەشی بەجێ هێشتووە بە ناوەکانی(هەڵۆ،نەوە،لەشکر،شنۆ،شادی).



# هەڤاڵ کوردۆ قاسم
## پارتیزانێکی تری دوای ئەنفال

**پاشنیوەڕۆی 2015/12/21 دوای ململانێیەکی سەخت لەگەڵ نەخۆشییەکی کوشندەدا،پارتیزانی دوای ئەنفال ، تێکۆشەری ناسراوی کورد، کوردۆ قاسم لە نەخۆشخانەی فریاکەوتنی شاری سلێمانی گیانی لەدەستدا**

**کاك کوردۆ، کوردێکی فەیلی و سەرکردەیەکی ماندونەناس و کۆڵنەدەر و خاوەن بنەماڵەیەکی تێکۆشەرو کورد پەروەری شاری بەغدای پایتەختی عێراق بوو، تا ساڵی 1979 زیاندانی بووە پیاوێکی ئازاو بوێر بووە و بەشداری بەرچاوی هەبووە لەخەباتی سیاسی و چەکداری ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا و یەکێك بووە لەئەندامانی دەستە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و تێکۆشەرێکی ئازاو چالاکی ڕێکخراوی هەڵۆی سوور بووە لەبەغدا، لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو.. تا ئەنفالە بەدناوەکان، کادرێکی چالاکی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بووە، دوای ئەنفالەکانیش لە نێوان ساڵانی 1989 – 1990 لە ناوچەکانی کەلار و کفری و سەنگاو پارتیزانێکی ئازاو چاونەترس بووە لەگەڵ هاوڕێ و هاوسەنگەرەکانی وەك (شەهید حەمەڕەش و شەهید مەلائەحمەد و شەهید سەید محەمەد و بەڕێزان مەحمود سەنگاوی و عوسمانی حاجی مەحمود)، لەهەمانکاتدا کاریگەری بەرچاوی هەبووەلەسەرپێشمەرگە پارتیزانەکانی ناوچەکە، پاشان دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی 1991 و لە دوای کۆنگرەی یەکی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان، بۆتە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی و پاشان کراوەتە لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوکی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان..**

**کاك کوردۆ پیاوێکی دڵسۆز و بەوەفاو بەئەمەك بوو بۆ خەڵکی گەرمیان و هاوڕێ تێکۆشەر و هاوسەنگەرەکانی**



# عادل نادر پارتیزان و خۆشەویستی جوتیاران

## ژیاننامەی شادڕەوان عادل نادر

. لەساڵی 1956 لەشاری چەمچەماڵ چاوی بۆژیان هەڵدەهێنێ.

. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەچەمچەماڵ تەواو دەکات.

. پەیمانگای تەکنیکی(بەشی راگەیاندن)ی لەسلێمانی تەواو دەکات.

. لەگەڵ دووبرای بەشداری شۆڕشی ئەیلول دەکەن.

. لە ساڵی 1976 دا خێزان پێکدەهێنێ..

. لەساڵی 1976 پەیوەندی بە(کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان)ەوە دەکات.

. لەساڵی 1982 دوای ئاشکرابوونی لەرێکخستن،

پەیوەندی دەکات بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە .

لە کەرتی 3ی تیپی 57ی سەگرمە دەبێت بە کادری ڕێکخستن ،

دواتر لە تیپی 59ی حەمرین دەبێ بە کادری کۆمەڵایەتی سنووری کفری

. بەشداری دەیان چالاکی لە سنووری گەرمیان وکوێستان دەکات.

. لە چالاکی و بەرگری دا پێنج جار بریندار دەبێت.

. لەدوای ئەنفال بۆ ماوەیەکی زۆر بەپارتیزانی لە گەرمیان دەمینێتەوە،

. لەشەڕی بەرگری ئەنفالدا بەچەکی کیمیاوی بریندار دەبێت ..

بەپێی راپۆرتی پزیشکێکی ئەڵمانی کاریگەری ئەو برینداریە بووە

بەهۆی جەڵتەی مێشك و دواتر بەهۆی شەهیدبوونی..

. لە1988دووکوڕ و کچێکی بەناوەکانی(ڕێبین وکۆچەر وئاوارە)ئەنفال دەکرێن.

. دوای گەڕانەوە لەپارتیزانی دەبێتە جێگری ل.ئیدارەی مەکتەبی سیاسی،

تا پێکهاتنی تەشکیلاتی مەفرەزەکان وخۆسازدان بۆ ڕاپەڕینی گەلی کوردستان.

. لەراپەڕینی 1991دا بەشداری لە رزگار کردنی چەمچەماڵ وکەرکوکی دەکات..

. لەکۆڕەوەکەدا گەرمیانی جێنەهێڵێ وداڕێژەری ڕاپەڕینی دووەم بووە

لە تەکیەوچەمچەماڵ

. لەپاش هەڵبژاردنی پەرلەمان وپێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان،

دەکرێ بە: (کارگێڕی مەڵبەندی شارەزوور،جێگری لێپرسراوی

مەڵبەندی 2ی ڕێکخستنی کەرکوك،ئەندامی مەکتەبی ڕێکخستن...)

. لە 27 . 3 . 2015 دەگاتە کاروانی پڕسەروەری.



# مامۆستا و فەرماندە و پارتیزان عادل نادر

دڵشادعەلی وەك هاوڕێی شادڕەوان(عادل نادر)

زۆرجوان گیانی ئەو ودڵی خۆی لاواندۆتەوە:

لەپڕ یادێك هاتە هزرم و مێشکی داگیر کردم ویستم بەچەند دێڕێك کەمێك لە ئازاری مێشکم کەمەوە نەم ئەزانی لە کوێ وە دەست پێ بکەم ، لەپڕ دەنگێکی نامۆو نەناس هاتە بەرگوێم وتی باسی شۆڕشی ئەیلولی بکە کەچۆن هەر لەسەرەتای هەرەتی لاویدا ئاوێتەی شۆڕش و کوردایەتی بوەو دەتوت هەر بۆ کوردایەتی خوڵقاوە، پاشان دەنگێکی خۆشەویست چرپاندی بە دڵمدا هەر زوو دەنگیم ناسیەوە دەنگی شەهید محمد نادر بوو ئەو پیاوێکی بالا بەرزی چوار شانەی سوورو سپی خاوەنی داستانی ناو چەمچەماڵ لەگەڵ هەردوو هاوڕێ کەیدا کەشەهید بون ( سۆرانی پورە گوڵە و شەهید بکر باپۆیدا) داستانێکیان تۆمار کرد کە بوە مێژوو بۆیان وە خەڵکی چەمچەماڵ شایەتی ئەو داستانە قارەمانەیان دەدەن

کە بەبەخشینی خوینی خۆیان تۆماریان کرد. ئەو وتی باسی ڕێکخستنی نهێنی شاری بۆ ناکەیت کە لەمنەوە دەستی پێ کردوو وتی دەبێت لەخۆمانەوە دەست پێ بکەین نانا باسی خەباتی پێشمەرگایەتی لەڕۆژە سەختەکانی خەباتدا بکە. دەنگێکی تر هاتە بەرگوێم دەنگەکە لەناو ڕوحمدا سەدای دەدایەوە کەوتی ڕوحەکەم ناسیم کە دەنگی پیاوە ئاڵتونیەکەی شارە دەنگی شەهیدی بالا بەرزی ی.ن.ك )دەنگی شەهید ئەردەڵێنە پێی وتم باسی پارتیزانی و کاتی ئەنفال بکە کە تەنها شاخەکان و ئەشکەوت و بن کەلۆزەکان لانەو پاڵ پشتمان بوو نانیشمان نانە ڕەقی بەجێ ماوی لادێ کان و ئاویشمان ئاوی کانی و ڕوبارو جۆگەلەکان بوو لەوپەڕی شەوە زەنگی تاریکیدا درمان بەشەوە زەنگداو بوینە پشکۆیەك بۆ خامۆش نەبونی ئەو شۆڕشە.

ئای شەهید ئەردەڵێن باسی تۆ لەکوێ وە بکەم تۆ هەر لە شانزەساڵیدا خولیای کوردایەتی بویت و یەکەم تیپی تۆپی پێ شارەکەت بەناوی پێشەوا قازی محمد دامەزراند هەر لە لاویدا چست و چالاکی خۆت دەرخست و لەناو هاوڕێ کانتدا بە (خولە تەیارە) ناوبانگت دەرکرد ، پاشان ئاوێتەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بویت و یەکەم دروشمی سەر دیواری شارەکەت بە دەستی تۆ نوسرایەوە پاشان وەك هەڵۆ دات لەشەقەی باڵ و بەرەو شاخ بەرەو گوند بەگوندو ماڵ بەماڵ لەسەر هەربانیژەی ماڵێك دەنیشتیتەوە لەکێشەو گیرو گرفتەکانیانت دەکۆڵییەوەو چارەسەرت بۆ دەدۆزینەوە، تۆ کادر بویت لەهەمان کاتدا فەرماندەو سەرپەرشتیاری داستانەکانی کەرتەکەت وشەڕەکانی سەرجادەی چەمچماڵ سەنگاو،داستانی گوندی قەرەتامۆڕ، زەنان، ژاڵەی دەربەند، گرتنی ناحیەی سەنگاو، تۆڵەی مامەڕیشەو هاوڕێ کانی، داستانی سێ مانگەی قەیوان ماوەت(سەرکردایەتی)گرتنی ناحیەی گەلاڵە بوویت، داستانەکان شایەدی قارەمانی تۆ دەدەن، تۆ زوو وتت کوردستان یەك پارچەیەو

دوژمن پارچە پارچەی کردوە و دەبێت بەخوێن ڕزگاری بکەین.. بۆیە لەشەڕی ئەلوەتان چاوی چەپت کردە قوربانی کوردستانی گەورە، پاشان لەڕاپەڕین بویتە داینەمۆی ڕزگار کردنی چەمچەماڵ و قەرەهەنجیرو بەبرینی سەختەوە هەنگاوت بەرەو ڕزگار کردنی کەرکوك ناو لەوێیش خوێنت بەخشی بەکەرکوك و بریندار بویت تۆ نەگەڕایتەوە تاتاجی سەرکەوتنت نایە سەر کەرکوك ،تۆ ئەزانی لەمەرگ بەهێزتر بویت هەشت جار مەرگت بەچۆکدادا ، دەزانیت لەپاش شەهید بونت شارهەموو بەرگی ڕەشیان پۆشی،دەیان منداڵ بەناوی تۆوە ناونران هتد..

گوێم لەبڵندگۆی مزگەوت بوو بەدەنگێکی بەرز دەیان ووت ئەی مامۆستا (عادل) ئەی خەمخۆری شارئەی ئەندازیاری ئاوەدانی لە ئێمە ڕۆیشتی لە چەمچەماڵ ڕۆیشتی تۆ خۆشەویستی هەموان بویت. ئەم جارەیان دەنگێکی پڕ بەرائەت دەنگی بەهەشتیانی شار کەلەناو خەڵك بەشێتەکان ناسراون هەمویان هاواریان دەکرد لەئێمە ڕۆی خەم خۆرو خەم ڕەوێن و ڕاوەنەوەی ئازارەکانمان بوو ،کەگوێم بۆ ئەمانە گرت ئاهێك بە دڵمدا هاتوو وتم کەواتە هەر لە ئێمە نەڕۆیشتوە لە خەڵکی شارەکە ڕۆیشتوە ...

بنون بەسەربەرزی بنون ئێوە مێژوتان بۆ؟خۆتان تۆمار کردوە بەسەربەرزی ژیان و بەسەربەرزی هەر بە پێوە شەهیدبوون...هەزاران سلاو لە گۆڕی پیرۆزتان .

---

Dilshad Ali . لندن ٢١/٦/٢٠١٨




# ژیاننامەی شەهید (مام سلێمان تەپەسپی)

## شەهیدی بەرگری لەرووبەڕووبونەوەی شاڵاوی ئەنفال..

. شەهید(سلێمان ئەحمەد عەزیز) ساڵی(1952) لەدێی(صۆفی وەند) لەدایك دەبێت.

. بەشداری شۆڕشی ئەیلولی دەکات.

. لە1976/1/20پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵەوە لە (کۆمیتەی ئاگر).

. لەساڵی1980پەیوەندی کردووە بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە

. ساڵی(1982) بووە بەفەرماندەی مەفرەزە لەکەرتی ڕێکخستنی کفری..

. لەساڵی (1985)دەکرێت بەجێگری کەرتی(2)ی تیپی(53)ی شێروانە.

- بەشداری زۆربەی شەڕەکانی (سەرکردایەتی وگەرمیانی) دەکات..

. لەشەڕی (گۆمەزەردی) بەسەختی بریندار دەبێت.

. بەداخەوە لە 8/4/ 1988 لەگوندی(هۆمەربل)ی گەرمیان شەهید دەکرێت و دەبێتە یەکەمین شەهیدی بەرگری لەڕووبەڕووبونەوەی شاڵاوی ئەنفال..

. لەدوای خۆی (گوڵە ئەحمەد فەتاح)ی خێزانی چوارمنداڵی چاوگەشی بەناوەکانی (جەبار،سیروان.فاتیمە،سنور) بۆکوردستان بەجێ دەهێڵێ.



## پارتیزانی دوای ئەنفال

## محمد حسێن سلێمان( حەمەناخە)

- شەهید محمد حسێن سلێمان (حەمەناخە)
- ساڵی 1957 لەگوندی(خێڵی ئاخە)ی بناری ئاژداخی سەنگاو لە لەدایك بووە.
- ساڵی 1979 دەبێت بە پێشمەرگە لەهەرێمی 5ی قەرەداخ
- پاشان دەبێت بەفەرماندەی کەرتی 5ی تیپی 51ی گەرمیان
- چوارساڵ بەپارتیزانی لەگەرمیان دەمینێتەوە بەشداری راپەڕینی 1991 دەکات.
- ساڵی 1991 دەکرێت بەفەرماندەی بەتالیونی 112ی دووز.
- شەوی 5/1991/11/6لەگوندی محمود پەریزا ی جەباری شەهید دەبێت

شەهید (حەمە ئاخە) شانازییەکی گەورەی لەلاپەڕەی مێژووی پارتیزانی گەرمیاندا بۆ خۆی وگەل و نیشتمانەکەی تۆمارکردووە،ساڵی 1988 کاتێك شاڵاوی ئەنفال دەست پێدەکات(حەمە ئاخە) لەگەڵ هاوڕێکانی بڕیاری مانەوە لەگەرمیان دەدەن. هەرچەندە دوژمن لە هەمووولایەکەوەهێرشی گەورەبۆسەر کوردستان وخەڵکەکەی و ئاوەدانی دەهێنێ ناوچەکەی گەرمیانیش وێران دەکات،ئەم قارەمانەو هاوڕێکانیان سەنگەرەکان ئاوەدان دەکەنەوە و درێژەبە خەباتی پارتیزانی دەدەن، هەرچەندە حەمەئاخە خێزانی وئەندامانی بنەماڵەکەی (خێزانی وکوڕوکچەکەی و سێ برای) بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەون و راپێچی بیابانی مەرگ دەکرێن، ، بەڵام هیچ کاتێك حەمە ئاخە هەست بەبێزاری وساردبوونەوە ناکات و بۆ ساتێکیش ئەو چوار ساڵە گەرمیان بەجێ نەهێڵێت و بڕیاری مانەوەلەگەڵ هاوڕێکانی دەدات،بۆیە جێی خۆیەتی هەتا گەلی کوردستان شانازی بەسەروەرییەکانیانەوە بکەن و لەلاپەڕەکانی مێژوودا بە ئاوی زێڕ یاداشتەکانیان تۆماربکرێ.



# پارتیزانی دوای ئەنفال
# ڕەمەزان ئەحمەد ڕەزا
# (ڕەمەزان کولەجۆیی)

. **شەهید** ڕەمەزان کولەجۆیی لەسالی(1971) لەکولەجۆی زەنگاباد **لەخیزانیکی نیشتیمان** پەروەر چاوی بەدونیا هەڵدەهێنێ،

- **قۆناغی** سەرەتایی دەخوێنێ،پاشان بە **کشتوکاڵەوە خەریکدەبن...**

- **لە ساڵی1983جاسم برای دەبێتە پیشمەرگە،بەهۆی پەیوەندیان بەپیشمەرگەوە (پینج)جار لەلایەن ڕژیمەوە بەند دەکرێت..**

. **لەسالی1985پەیوەندی دەکات بە (کۆمەلەرەنجدەرانی کوردستان)ەوە.**

**لەسالی 1987 پەیوەندی دەکات بەهیزی پیشمەرگەی کوردستانەوە..**

. **لەسالی 1988لە ئەنفالە بەدناوەکاندا ڕووبەڕووی داگیرکەری بەعس بۆتەوە ..**

. **شەهید ڕەمەزان دوو برا و خوشکیکی بەر شالاوی ئەنفال دەکەون.**

- **ماوەبەك لەگەڵ کاك عوسمانی حاجی مەحمود وەك پارتیزان دەمینێتەوە ..**

. **لە بەهاری 1991ڕۆلی کاریگەری دەبێ لەڕزگارکردنی شار وشارۆچکەکان..**

**یەکەم مەفرەزە بوون لەگەل کاك عوسمانی حاجی محموودچوونە ناو کەلارەوە، .**

. **لەتەمەنی پیشمەرگەیەتی دا (3)جاربریندار کراوە.**

. **لە 23/1/1992هاوسەرگیری پیکهیناوە، نزیکەی (سێ) ساڵ لەگەڵ هاوسەرەکەی تەمەن دەکات تا لەشەری ناوخۆدا لەشەوی 8.9/7/1995 لەشەڕیکی دەسەو یەخەدا خۆی دەکاتە قوربانی کوردستان و شەهید دەکریت.**

. **شەهید لەدوای خۆی تەنها کوڕیك بەناوی هەلۆ بەجی دەهیلێت.**



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## شەهید سـەید جەوهەر

. سەید جەوهەر سەید لەتیف سەید محەمەد

. سالّی ٦٢ لە لە ئاویی لەك دایك بووبوو.

. سالی ٨٢ پەیوەندی دەكات بە هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە لە تیپی ٥١ ی گەرمیان.

. لەسالانی خەباتدا بەشداری وفەرماندەیی دەیان چالاكی دەكات.

. لە شەڕەكانی بەرگری شالاوەكانی ئەنفالدا ڕۆڵی قارەمانانەی بووە.

. دوای ئەنفالی سێ یەكیك بووە لە پارتیزانەكانی دوای ئەنفال.

. لەدوای ڕاپەڕینیش جێگری فەرماندەی فەرماندەیی٣ی كەركوك بووە. . لە سالی ١٩٩١ كراوە بە لێپرسراوی قیادەی سێی ناوچەی كەركوك.

. لە شەوی ١٦.١٠.١٩٩١ لە شاخی شەكرۆك شەهید دەبێ.

# پەیامی شیلانەوشەکرۆك

## بۆ/ شەهید سید جوهر وهەڤاڵەکانی

لەم وەرزی گەڵاڕێزانی هۆزانەدا ،

( سیروان ) ی شیعرێکم وتی:

لەبەهەشتەکەی(گۆران)دا، لەشارەزوور .

لەو هەرێمەی....،

ڕۆحی هەزاران (عەزیز)*ی تیاهەڵوەری،

بوون بەکۆی نوور .

چاوم لێ بوو ..باڵندەکان .

لەسەر مەزاری چاکێکی شیرەمەڕی

پۆل پۆل کەپرۆکەیان دەکرد

دەروێشەکانی خاك وخۆڵ

لەدیوانەکەی (نالی) دا

دەخوولانەوەوەك فڕفڕۆك

عاشقانی ڕێبازەکەی کاکەافازل**

بۆ گەرم کردنی کۆڕەکەی .

وەك دڵسۆزانی( عاشورا

سینەیان کردبوو بەدەف و...

تەپڵی سەریان گرمەی دەهات، لەگەڵ چەپۆك.

لەم پایزی هەڵوەرین وخەزانەدا

(سەفین)ی شیعرێکم وتی:

لەو دەڤەرەی (شوانە)و(ئاکۆ)،

بوون بەدووئەستێرەی سوورو.

چوون بۆ ئاسۆ.

(کانەبی)واستار)وا مەهدی )یش
بوون بەسێ موریدی ( صافی )
چاوم لێ بوو بەرێبازی رەنجدەراندا.
بەرەو (کاوانیان ) رۆیشتن،
بوون بەپۆلێ قارەمانی مێژووی(سۆران)
بوون بەپاڵەوانە ئازاکەی
نێو داستانەکەی (حەمەدۆکێ).
لەم وەرزی پەڵەی خوێنەدا
(هەوری)ی هۆزانێکم وتی:
ئەگەر ئێستا ئێوەیش وەک من،
گوێتان لە زریکەی(خانزاد)و
لەنەواری ئەشکەوتەکەی(خرواتان)و
لەلاوکەکەی ( کاوێس...) دەبوو
ئێوەیش وەک (بەنی هەریر)و،وەک سێدۆڵان...
نەفرەتتان لە خائین دەکرد،
نوێژی رێزتان دادەبەستا....
بو (مەلانەجم) ی فەرماندەو
بۆ شێخە ردێن سوورەکەی ،
(شارباژێر)و (قەڵاچوڵان).
لەم وەرزی گەردەلوول وداستانەدا
لەم گەرمیانە وێرانەدا .
شیعرێکی (ئەنفال)م وتی:
ئەگەر ئێستا ئێوەیش وەک من
گوێتان لەناڵەی(چیمەن)و
چاوتان لەنسکی پیرێکی،دێی ( لەک )دەبوو
جادەتان ووت:داستانی سەوز ..

کالآیەو بەقەدبالآیە.
وا دایکێکی جگەر سووتاو
هاوار دەکات : تەماشا کەن!
بە(دەربەندی بازیان)ەوە.
بەسەر(شاخەسووران)ەوە.
بەسەربەردی (کەڵەکی باڵەیان)ەوە.
شاڵە سەوزەکەی یەکێتی
پشتێنەکەی (سەیدجەوهەر)م .*
با دەی شەکێنێ ... ئالآیە .
لەم وەرزی کوڵ نەدانەدا
لەمەڵبەندەکەی(شیهاب)و(ئارام)ەو.
لە ولآتی... (سەدو هەشتاو دوو هەزار)
غەم و زامەوە.منی دیوانە خەریکم،
حاڵی هوزانێ دەمگرێ.
بۆ (پێشمەرگەو)بۆ (سەید...)و
بۆ(سیامەند)و بۆ(باران)و....
بۆپۆلێ (بانی مارانی)و
بۆ(حەمە عەرەبی)*** برام.
بو ئەو خوێنە خاوێنانەی،
لە سەنگەری بەرگری دا،تنۆک،تنۆک.
رژانە بن داری هیوای کوردایەتی و
بەرسێبەری سنەوبەرو
داری شەکرۆک.

**1997/11/27**

*سەید جەوهەرو عەزیزمامەلیسی و فارق شیرمەمەری و حمەعارەب و چەند هەڤاڵێکیا ن پێکەوە شەهید بوون.



**فەرماندەو پارتیزانی دوای ئەنفال**

**شەهید سەید موحەمەد**

# کورتەیەك لەژیاننامەی شەهید سەید محەمەد

. ناوی تەواوی محەمەد محێدین ئەمین ناسراو بە(سەید محەمەد)ە.

. ساڵی 1947 لەکفری لەدایك دەبێت.

. لەشۆڕشی ئەیلول بەشداری دەکات.

. ساڵی 1973 لەگەڵ خاتو (نێرگز شکور حسین) ژیانی هاوسەری پێکدەهێنێ دەوری کاریگەری هەبووە لەدامەزراندن وگەشەپێدانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەو ی.ن.ك، لەسنووری گەرمیاندا.

. پایزی 1978بووەپێشمەرگە،دواتر بووە لێپرسراوی ناوچەی کفری ی.ن.ك.

. پاش بوونی بەپێشمەرگە،دایك وباوك وهاوسەرومنداڵەکانی زیندانی دەکرێن.

. لەژیانی پێشمەرگایەتیدا، لێپرسراویەتی سیاسیو عەسکەری پێسپێردراوە، کەسێکی خاکیو خۆشەویستو جێگای متمانەی خەڵك بووە. یەکێك لەڕەمزەکانی ڕێکخستنی نهێنیو پێشمەرگایەتیوشۆڕش بوولەگەرمیان.

. پاش ئازادکردنی هاوسەرو منداڵەکانی لەزیندان لەساڵی 1981دا، هێنانی بۆ ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش، لەوماوەیەدا لەچەند گوندێکی جیاجیا دەمێننەوە، دوا جێگەو دوا گوند کە لێی مانەتەوە، گوندی تەپەسپی بووە سەر بەناحیەی سەرقەلا.

. لەشالاوی ئەنفالی سێدا هاوسەرەکەی و هەر 10 منداڵەکەی ئەنفال کراون.

**ناوی منداڵەکانی:**

سامان،شاخەوان،شۆڕش،کارزان،سیروان،سوارە،ئالا،بەهار،کوردستان،چنار.

# لەداوخستنی شەهید سەیدمحەمەد

سەرەتای مانگی ئابی 1988(حەمەرەشیدتوکنی وسەباح وشێخ مەجیدی و شەهیدمەجید،دەچن بۆنزیك(دەواجنی مەلابەنزین)بەمەبەستی بینینی هاوکارەکانی رێکخراوی سلێمانی،لەوێ(هاوڕێ سوپا)دەبینن،هەندێك هاوکارییان پێدەگەینێت و پرساری (سەیدحەمید)یان لێ دەکات..

داوایی ئەوانیش داوای زانیاری نوێی دەکەن..... پێیان دەڵێ: شەوی رابردوو لە رەبیەکانی دەوری کەلاردەنگی تەقەی زۆر بیستراوە،دەنگۆی ئەوەهەیە کاك سەید یاشەهیدبووە.یا بەبرینداری گیراوە، بەدڵنیاییەوە سەید شتێکی بەسەرهاتووە، کەگەڕانەوە ئەم هەواڵە بەکاك عوسمان حاجی مەحموود بگەیەنن..!

پارتیزانەکان هەردەستەومەفرەزەیەك کەلەسنووری خۆی ،پەیوەندیی لەگەڵ شارو کۆمەڵگاکان دروستدەکەن،کاك(سەیدمحەمەد)یش لەرێگای دووکەسەوە بەناوەکانی (جیهان بەخش)و(صباح گردەگۆزینە)وە کە دووپێشمەرگەی تیپی53ی شێروانە بوون ودوای ئەنفال تەسلیم بوونەوە،پەیوەندی بە(جوامێر قالە جاف)ەوە دەکات..

ئەم بەناوجوامێرە کۆنە لێپرسراوی شۆڕشی ئەیلول دەبێت و دوای 1975 تەسلیم رژێم دەبێتەوە و دەبێتە بەعسی و سیخوڕی رژێم... نازانین چۆن کاك سەید ئەومتمانەیەی پێدەکات، بەجۆرێك کەلای وابووە ئەو کەسە گومانی لێناکات و دەتوانێت وەك هاوکارێکی بەهێز بۆ پشتیوانی پارتیزانەکان بەکاری بهێنێ، هەرچەند پێشتر کاك حەمەڕەش وکاك عوسمان وکاك عەدنانی حەمەی مینا پێیان گووتبوو، کەئەوکەسانە جێگای متمانە نین و دەبێت لێیان بەدووربێت..

بەڵام کاك سەیدمحمد داوا لەو جوامێرە دەکات،بۆ دڵنیایی لەدڵسۆزییان چالاکییەك بکات و یەکیك لە پیاوانی رژێم بکوژێت، ئەویش رەزای دەبێت وبەڵێنی پێدەدات..

لەمانگی شوباتی1989 رفیق حزبی وشوفیری بارەگای بەعسییان قادرفەرەج (قالەسایەق) دەکوژرێت ..هەواڵ بۆ کاك سەیدمحەمەد دەنێرێ:

ئەوە ئێمە بۆدڵنیایی ئێوە ئەو چالاکییەمان کردووە..

دوای ئەوە کاك سەید دووجاری تر دەچێتەوە ناوشاری کەلار و لەوێوە بە بێتەل هەواڵ بە دەستەکەی خۆیان دەگەیەنێت. بۆ ماوەی چەند مانگێك پەیوەندی کاك سەیدمحەمەد بەو هێڵەوە درێژەی دەبێت(جیهان بەخش)و(صباح گردەگۆزینە) چەندجارێك دەچن بۆحاشارگەی (گردەبەلەکە)و هاوکاری بۆ پارتیزانەکان دەبەن، بەمە کاك سەید محەمەد متمانەی زیاتر دەبێت..

* شەوی 1989.7.25/24کاك (سەیدمحەمەد)وهاورێیان (کەریم )و(نەوزادکەریم)و (حەسەن ئۆمەربلی)لە گۆرستانی سیدخلیل (جیهان بەخش) و(صباج گردەگۆزینە) دەبینن، کاك(سەیدمحەمەد)لەگەڵ(کەریم رەحیم) لەگەڵ باوەرپێکراوەکان،دەچن بۆماڵی (ج.. ق.. ج ). (حسن )و(نەوزادکریم فارس)یش دەگەرێنەوە بۆ لای هاورێ پارتیزانەکانیان،پێشوو تر کاك سەید کە دەگەیشتنە ناوشار بەبێتەل هاورێکانی لەگەیشتن و سەلامەتی دڵنیا دەکردەوە،بەڵام ئەمجارە هیچ دەنگی نابێت، هەربۆیە هاورێکانی نیگەران دەبن وچەندجار لەکاتی دیاریکراو دەچنەخەت وبانگی دەکەن. هیچ وەڵامێکی ناداتەوە..

* لەرۆژی 28 . 7 . 1989 کەریم دەگەرێتەوە، زۆر شێواو و بێتاقەت دەبێت، هەواڵی کاك سەیدوهۆی پەشۆکانی لێدەپرسن..ئەویش لەوڵامدا دەڵێ شتێك هەیە، دەمەوێ بۆ لێپرسراوان باسی بکەم،دواتر رووداوەکە بۆکاك(مەحموود سەنگاوی) و کاك(کوردۆقاسم)بەم شێوەیە دەگێرێتەوە:

(ئێمە لەماڵی (ج.. ق.. ج ). بووین، منیان بانگ كرد، گوتیان دەبێ تۆ لێرە بڕۆییت.. منیش زۆرهەوڵم دا، گوتم بێ كاك سەید بۆهیچ كوێ ناڕۆم..

بەزۆر دەریانكردم و گوتیان تۆ بڕۆ، دڵنیابە كەسەید ناگەڕێتەوە..

ئیتر تێگەیشتم پیلانەو ئەگەر نەڕۆم منیش كۆتاییم دێت)..

دواتر ئەوە روون دەبێتەوە كە (ج.ب )ی خزمی((ج.. ق.. ج ).) بەهۆی خزمایەتی یەوە(كەریم)ی دەركردبوو،ئەوەیش ئاشكردەبێت كە پیلانەكە لەلایەن(حاج عبد) مامی(صدام)ەوە بەرنامەڕێژی بۆ كرابوو، كوژرانی (قالەسائیق)یش هەر بەبڕیاری (حاجی عەبد) جێبەجێكرابوو..

هەموو ئەو هاوكارو پێشمەرگە دێرینانە و رێكخستنانەی لەماڵی(ج.. ق.. ج) سەردانی سەیدمحەمەدیان كردبوو، دواتر لەلایەن رژێمەوە گیران..

وەك(عەلی شەهید محەمەد، دڵسۆز ئەحمەدكەلاری و چەند كەسێكی تر..

كاك دڵسۆزی ئەحمەد كەلاری بەپارە ئازاد دەكرێ وكاك (عەلی شەهیدمحەمەد)یش دوای راپەرینی 1991 دیل بەدیل بەگۆڕینەوە ئازاد دەكرێ.

*لە17/1/1991 هەڤاڵ (سەیدمحەمەد) لەزیندانەكانی رژێم شەهیددەكرێت.

*(ج.. ق.. ج ) یش دوای راپەڕین لەبەغدا ولەژوورەكەی خۆی دەكوژرێت، دوای كوژرانی هەندێ لەخزمانی تەرمەكەی دێننەوە بۆگەرمیان بەخاكی بسپێرن.. بەڵام لەلایەن كەسوكاری شەهید و خەڵكەوە رێگایان پێنادرێ هەر بۆیە بەناچاری دەیگێڕنەوە و لە عەرەبستان بەخاكی دەسپێرن.

* سەرچاوە : یرەوەری پارتیزانێكی دوای ئەنفال



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## شەهید ئاتیلا سەعدوڵا خەلیل

. ساڵی 1956 لە کفری لەناوکلکی تورکمانی(وەنداوی)ودایکێکی(زەنگنە) بەناوی (گوڵەباخ محەمەدشاسوار) چاوی بۆژیان هەڵدێنێ.

. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لەکفری وخورماتوو تەواو دەکات.

. لەساڵی 1979 پەیمانگای فێرتێرنەری لەبەغدا تەواو دەکات.

. پاشان دەگەڕێتەوە کفری. دواتر دەچێتە گوندی (بنەکە)ی گەرمیان بڕیاری دەدات لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش بژێت..

. هەرچەند (ئاتیلا) دەرچووی پەیمانگاو کۆلیژی پزیشکی نابێت، بەڵام لەناو جەماوەر بە دکتۆر ئاتیلا دەناسرێ.

. لەبەر ئەوەی ناوچەکە هیچ بنکەیەکی تەندروستی نابێت،خەڵك بەناچاری لەنەخۆشی وزامداربووندا رووی تێدەکەن،ئەویش چارەسەری سەرەتاییان بۆدەکات، دایکیشی لەشارەوە دەرزی و دەرمانی پێویستی بۆدێنێ.. چارەسەری سەدان نەخۆشی مرۆڤ و ئاژەڵ دەکات...

. شانبەشانی کاری خزمەتگوزاری ،ئامێری مۆزیك ودەفیشی هەبوو، کۆڕی لاوانی گەرم دەکرد و خۆی کردبوو بەخۆشەویستی خەڵك..

. لەوماوەیەدادەکەوێتەداوی خۆشەویستی کەنیشکێکی(زنگنە)وە بەناوی (فاتێ) خۆشەویستی پاك وبێگەرد هزر وبیریان داگیردەکات.

- کە خوازبێنیشی دەکات جیاوازی کۆمەڵایەتی وا دەکات باوکی فاتێ رازی نابێت.

- لەرۆژی 3 3 / 1991 لە(زەلێ)بارەگاکانمان چەند مەترێکان نێوان بوو، شەوچووم بۆلای تا بە گوێ گرتن لە ناڵەی دەفەکەی کەمێك دڵی خۆم ئاسوودەکەم، لە کاتی گفتوگۆ وگێرانەوەی بیرەوەریەکانی باسی لە عیشق و خۆشەویستی پاك وبێگەردی نێوان خۆی (فاتیلا)بۆکردم...لەوشەوەدا کەبەداخەوە دوا دیدارمان بوو ئاواباسی لە دابران دەکرد :(لە کاتی هێرشی ئەنفالدا لەگەڵ چەندپێشمەرگەیەکی پارتیزاندا بەنیازی کشانەوە بووین بۆ دەرەوەی ناوچەی گەرمیان،بەرێکەوت لەرێگا تووشی(فاتیلا)وباوك وبرایەکی بووین،شێخی باوکی دەیویست بیانبات بۆ (قادرکەرەم) تا خزمەکانیان پەنایان بدەن و بەرشالاوی ئەنفال نەکەون، کەمنیان بینی راوەستان ..فاتیلا وبرایەکی دابەزین..ئەوە یەکەم جار بوو رووبەڕوو قسەی لەگەڵ بکەم..براکەی داوای لێبووردنی کرد، دیاربوو زۆرپەشیمانبوو، کە منیان رەتکردبۆوە.. هەربۆیە لەبەر خاتری ئێمە رووی خۆی وەرگێراو رۆیی ، بەتەنیا جێی هێشتین. تا دوا ماڵئاوایی لەیەکتر بکەین...یەکەم و دا قسەمان ئەوەبوو هەردوکمان بەڵێنمان بەیەکتردا(یا بۆیەك یا بۆخاك)بەداخەوە ئەوە دوا دیداری من و فاتیلا بوو، ئەوان چەندکیلۆمەترێك لەولاتر کەوتنە بۆسەی دڕندەکانی ئەنفال و راپێچی چارەنووسی نادیار کران، منیش بەڵێنی خۆم بردەسەر و لەگەڵ هاورێکانم بڕیارماندا بە پارتیزانی لەگەرمیان بمێنینەوە....)

. بەداخەوەلەرایەرینەکەی 1991دوای رزگارکردنی گەرمیان وشاری (خورماتوو) لەنەبەردیکی قارەمانانەدا بەڵێنی خۆی بردەسەر کە ئەویش(بۆخاك بوو) گەیشتەکاروانی شەهیدان..

دواترچیرۆکی عیشقی (ئاتیلا و فاتیلا)بوو بەهەوێنی دەیان چیرۆك ورۆمان و شیعرو دراماو کاری هونەری ..



# شەهید رەمەزان کوڵەجۆیی پێشمەرگە و پارتیزانێکی گەرمیانی

شەهیدی نەمر(رەمەزان ئەحمەد رەزا) ناسراو بە (**رەمەزان کوڵەجۆیی**)

**- لە ساڵی** 1971 **لە (کوڵەجۆی** زەنگاباد**)ی کفری چاوی بەدونیا هەڵهێناوە.**

**- لە ساڵی** 1985 **پەیوەندیکردووە بە رێکخستنەکانی (کۆمەڵە)وە**

**- لەئەنجامی هەڵسوڕانی سیاسیدا چەندجارێك لەلایەن رژێمەوەدەستگیرکراوە.**

**- لە ساڵی** 1987 بووە بە پێشمەرگە لە تیپی 51ی گەرمیان.

**- لە شاڵاوەکانی ئەونفالدا ڕووبەرووی ڕژێمی داگیرکەری بەعس بۆتەوە.**

**- دایکی و دووبرای و خوشکیکی بەناوی(بەفراو) ئەنفال دەکرێن.**

**- لەدوای** ئەنفال شەهید رەمەزان یەکێك دەبێت لەو پێشمەرگانەی **خەباتی** پارتیزانی لە ناوچەکانی گەرمیان درێژە پێدەدات.

**- بەگشتی بەشداریی زۆربەی** شەڕەکانی **سنووری گەرمیانی کردووەو**

**- لە تەمەنی پیشمەرگایەتیدا** سێ **جار بریندار بووە.**

**- لە ڕاپەڕینی بەهاری** 1991 رۆڵی **کاریگەری هەبووە لە ڕزگارکردنی شارو شارۆچکەکانی کوردستان بەتایبەتی شاری کەلار.**

**- مەخابن، شەوی** 9**ـ** 1995/7/8 **لە شەڕێکی قارەمانانەدا لە گوندی (زیارەت)ی سەر بە پارێزگای هەولێر شەهید دەکرێت.**

* **کوردستانی نوێ / هەڵۆ رەمەزان / کوڕی شەهید** 2020/8/20



# ژیاننامەی شەهیدی فەرماندە
# یاسین عودل محمد (یاسین بچکۆل)

. لە ساڵی ١٩٥٧ لەگەڕەکی(حدیدی) یەکانی کەرکوك چاو هەڵدەهێنێ.

. قۆناغی ناوەندی تەواو دەکات.

. لەبەر هەژاری خێزانەکەی شان دەداتە بەر کرێکاری .

. لە ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە ئەکات

. لە ساڵی ١٩٨٢ دەبێت بە پێشمەرگە لە کەرتی /٤ی جەباری

تیپی /٥٧ سەگرمە لەلای شەهید مامەڕیشە.

. هەر زوو دەبێتە جێی باوەڕی مامە ڕیشە و هاوڕێکانی .

. ساڵی (١٩٨٣) لە شەڕی سەر ڕێگای کەرکوك . قادر کەرەم

بە سەختی بریندار دەبێت ماوەیەك بە برینداری خۆی حەشار دەدات

. پێشمەرگەیەکی ئازاو هێمن،خۆشەویستی خەڵك و هاوڕێکانی دەبێ.

. بەشداری شەڕەکانی گەرمیان و قەرەداغ وسەرکردایەتی دەکات.

. لە ساڵی (١٩٨٥)دایك و باوکی بە هۆی ئەوەی کوڕیان پێشمەرگە یە زیندانی دەکرێن ڕەوانەی خوارووی عیراق دەکرێن ،باوکی بۆ کوت و دایکی بۆ سوق الشیوخ دوای ساڵێك ئازاد دەکرێن و ڕەوانەی ناوچە ئازاد کراوەکان دەکرێن.

. یەکێك بوو لەو پێشمەرگە پارتیزانانەی لە دوای ئەنفالەکان لە ناوچە ڕوخاوو وێرانەکانی گەرمیان بە چەندمەفرەزەیەك مانەوەو دابەش بوون بەسەرناوچەکاندا.

. هەر لەگەڵ چەخماخەی ڕاپەریندا بەشداری لە رزگارکردنی شارەکانی سلێمانی . چەمچەماڵ . قەرە هەنجیر ..دەکات.

. بورهان سەرسپی برای لە (١١/٣/١٩٩١) لە بانی مەقان شەهید دەبێت.

. ئامادە نەبوو لە پرسەی براکەیدا دابنیشێت بۆ رزگار کردنی کەرکوك لە ریزی پێشەوەدەبێ،بۆیە لە ڕۆژی (٢٠/٣/١٩٩١) لەناو شاری کەرکوك لە نزیك خانووە ڕوخاوەکەیان کە ڕژێمی گۆڕبەگۆڕی بەعس لە ساڵی(١٩٨٧)روخاندی شەهید دەبێ گیانی پاکی دەسپێرێ بە خاکی کوردستان خوێنی گەشی لەگەڵ نەورۆزدا دەکات بە گوڵاڵە سوورەی کوردستان

. زیاتر لە ٣٠ شەهید لە بنەماڵەکەیدا هەیە

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی شەهیدیاسین بچکۆل و...

شەهیدانی کوردو کوردستان



## ژیاننامەی شەهید

## جلال محمدئەمین (مام جلال مەسۆیی)

. لەساڵی (١٩٤٥)لەگوندی مەسۆیی لەدایك دەبێت.

. بەشداری شۆڕشی ئەیلول دەكات.

. لەساڵی (١٩٧٧)پەیوەندی دەكات بە كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستانەوە ، ئەندامێكی چالاكیكۆمیتەی ئاگر دەبێت..

. لەساڵی (١٩٧٩)پەیوەندی دەكات بەهێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە.

. لەساڵی (١٩٨٢)بووە بەفەرماندی كەرتی (٢)ی تیپی (٥١)ی گەرمیان.

. بەشداری زۆربەی شەڕوچالاكییەكانی دەكات.

. سێ جاربە سەختی بریندار دەبێت.

. لەئەنفالەكەدا وەك پارتیزان دەمینێتەوە ..

. ساڵی (١٩٩١) دەبێ بەفەرماندەی بەتالیۆنی كفری.

. لەساڵی (١٩٩٢) دەبێت بە نوینەری بەرەی كوردستانی لەگەرمیان.

. لە (١٩٩٣.١٩٩٥)دەبێ بەلێپرسراوی كۆمیتەی پێشمەرگەدێرینەكانی كفری

. دواپلەی جێگری فەرماندەی فەرماندەی یەكان دەبێت.

. مەدالیای ڕێزلێنانی هەڤاڵ مام جەلالی پێ دەبەخشرێ،

. لە 1 6 . 2002) شەهید دەكریت.



## ژیاننامەی شەهید
## کەماڵ سابیر قازی نەوجولی

. لە ساڵی 1961لە شاری دوز خورماتوو چاوی بە دنیا هەڵدەهێنێ.

. لە ساڵی 1983 پە یوە ند ی بە ڕێکخستە کانی یە کێتی نشتیمانی وە دەکات.

. چە ندن جار بەو هۆیەوە لە لاین ڕژێمی بەعسەوە دەسگیر دەکرێ.

پاش ماوەیەك بەبۆنەی ئەنفالەوە بە یوەندی دەپچڕێت بەڵام ورەی پۆڵاینی دیسان هانی دەداتەوە بۆخەبات وخۆڕاگری و پاشان بە نهێنی لە ڕێگای شە هیدی قارەمان مجید دووزیەوە پە یوەندی بەپارتیزانەکانی ناوچەی داوێ وە دەکات،تاکو ڕاپەرینە کەی ساڵی 1991

. لە ڕاپەرینە مەزنەکەی دووز بەشداری دەکات لە ڕۆژی ڕزگارکردنی بریندار‌دەبێت

. لە شە وی 18 / 1991/3/19 لە شەڕێکی دەستەو یەخەدا لەچیای هەنجیرەی پشتی خورماتوو شە هید دەبێت و دەگاتە کاروانی نەمران



## پارتیزانی شەهید ئازاد عبدالله بەرغەش

لە ناوچەی داوێ لە شەڕی ئەشکەوتی پەڵکانە شەهید بوو.

. شەهید ئازاد لە ساڵی ( 1958 ) چاوی بە دونیا هەڵدەهێنێ.

. لە ساڵی ( 1965) دەچێتە قوتابخانە، سەرەتایی و ناوەندی لە شاری خورماتوو تەواو دەکات، لەپەیمانگای پیشەسازی بەغدا وەرئەگیرێت و بە سەرکەوتوویی تەواوی ئەکات ، دوای ئەوەش لە خولێکی خێرادا بۆ شارەزایی لە نەوت ئەچێت بۆ بەسرە و ئەو خولەش تەواو ئەکات .بەڵام دانامەزرێت..

. لە ساڵی ( 1979) پەیوەندی ئەکات بە حیزبی سۆسیالستی کوردستانەوە پاشان لە(حسك) دائەبرێت و لە ساڵی(1985)پەیوەندی ئەکات بە ریزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوەلە(کەرتی 5ی تیپی51)ی گەرمیان..

لە بەر زیرەکی و هۆشیاری سیاسی وەکو کادری رێکخستن ئەرکی رێکخستنی پێشمەرگە ئەگرێتە ئەستۆ، وەکو هاورێی و هاوسەنگەرانی ئەیگێڕنەوە کادرێکی چالاك و پێشمەرگەیەکی چاونەترس و ئازا بووە .

### هاورێکانی چۆن باسی دەکەن؟ :

جەماڵ وارانی هاورێی ئەڵێ:مەحاڵە کەسی وەك شەهید( ئازاد) دروست بێتەوە.

مەجید دووزی ئەڵێ: شەهید ئازادکادرێکی سیاسی بووئەیتوانی کۆنترۆڵی پێشمەرگەکان لەدژوارترین کاتدابکات.

نازم کەرکوکی : شەهید مامۆستا ئازاد شاخێك بوو لە زانیاری لە قسەی نەستەق، زۆر کادرێکی هۆشمەندبوو.

**محمد گەلاوێژ هاوڕێی منداڵی و قوتابخانەی شەهید ئازاد ئەڵێت :**

لە قوتابخانەی تەقەدومی سەرەتایی دەستی بە خوێندنی سەرەتایی کرد تا پۆلی پێنجی سەرەتایی پاشان کە قوتابخانەی هەندرێنی سەرەتایی کوڕان کرایەوە چووینە ئەو قوتابخانەیە لە گەڵ دەیان قوتابی کوردی گەڕەکی (ینگی داملەر) ماڵەتازەکان هەموو ژیانمان لەو گەڕەکە خۆشە بوو کە تێکەڵەیەکی کورد و تورکمان بوو. ئازاد لە منالیەوە کەسێکی خۆشەویست وئاوەدان بوو زۆر قسەخۆش بوو زۆر وریا بوو ، کەسێکی نیشتماز پەروەر بوو کوردستانی خۆش ئەویست . لە دوای تەواوکردنی پۆلی سییەمی ناوەندی بە ناچاری چوو بۆ سەناعەی بەغدا ، کاتێك ڕژێمی بەعسی فاشیست دەرگای قوتابخانە کوردیەکانی داخست ، ئێمە چووینە ئامادیی بە عەرەبی درێژەمان بە خوێندن دا لە یەکتر دابڕاین ، ئاشبەتاڵی ساڵی ۱۹۷٥ کاریگەری زۆری هەبوو لە سەرمان ، هەر زوو لە ڕێکخستنەکانی بزوتنەوەدا هەوڵمان دا ڕوحی شۆڕش بژێنینەوە لە ناوچەکەماندا ئەو کاتە تێکەڵیەك هەبوو لە ناو تەنزیمەکاندا لە خورماتوو. ئەوەبوو ئازاد لە گەل هەندێ برادەریدا پەیوەندییان کردبەسوسیالیستەوە پاشان بوون بەپێشمەرگەو جدی بوون لە پێشمەرگایەتی دا سەرەتا لە سەرکردایەتی بوون ودواتر چوون بۆ شارەزرو بە داخەوە لەوێ ڕووبەڕوی هەندێ کاری قیزەوەن بوونەوە و قبوڵیان نەکرد بەردەوام بن ، بۆیە خۆی و هاوڕییانی گەڕانەوە بۆ گەرمیان ، شەهید ئازاد بەرەدەوامی دا بەخەبات ئەمجارە لە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا دواتر بوو بە پێشمەرگە سەرەڕای ئەوەی زۆر گلەیی هەبوو لە سەرکردایەتی شۆڕسی کوردستان لەو کاتەدا ، بەڵام باشم بە بیرە لەگفتوگۆیەکدا ووتی من بوومەتە پێشمەرگە بۆ بەرگری کردن لە کوردستان و خەڵکی چەوساوە و زەحمەتکێشی ناوچەکەم ناتوانم ئەم هەموو ناهەقییە ببینم و

بیٚ دەنگ بمێنم و دانیشم . هەزار سەڵاو لە ئازادی بەرخۆدان وخۆڕاگری ، شۆڕش بەم ئازانە دروست بوو کە بیٚ تێبینی نەبوون لەسەر گەندەڵی وەهەڵەکان . ببورن من ناتوانم ڕاستبەکان بشارمەوە ، ئازاد یەکێك بوو لە هاوڕیٚ نزیکەکەنم . مەحەمەد گەلاویٚژ .کاك سەلاح عەول ئەڵێت : لە کەرتی (5)ی داویٚ تیپی (51)ی گەرمیان پێشمەرگە بووین پێکەوە ، مامۆستا ئازاد هەرچەندە وەسفی بکەی هێشتا کەمە ، ئەو بە قسە خۆشەکانی وای کرد بوو هەمووومان هۆگری بین

## مامۆستا ئاراس محمد ئەڵێت :

شەهید ئازاد و هاوڕێکانی پێشمەرگەی پارتیزانی بوون لە ناوچەکە ، وەك من بیستوبێتم ئەوان ( 5 ) پێشمەرگە بوون لە ناو دێی قوریچای بوون و بە زۆریش لە ئەشکەوتەکاندا خۆیان حەشار ئەدا ، گوێدرێژێکیان ئەبێت ئاو و خواردنی پیٚ دێنن بۆ خۆیان ڕۆژێك بەرەڵا ئەبێت ئەوانیش ئەیانەوێت بیدۆزنەوە و بیهێننەوە کۆپتەر کە بەردەوام بەو ناوچەیەدا ئەسوڕایەوە کەشفیان ئەکات و هێزێکی زۆر دێتە سەریان شەڕێکی سەخت ڕوو ئەدات سوپای عێراق دەیان کوژراویان لیٚ بە جیٚ ئەمێنێت لە ناو کوژراوەکاندا عەقیدێکی سوپا ئەبێت و لاشەکەیان بردەوە بۆ کەرکوك ئەم شەڕە لە دوای ئەنفال بوو لە ساڵی 1988 .

لە دوای ئەنفال خۆی و دوو هاوڕێی بە پارتیزانی لە ناوچەی داویٚ لە ئەشکەوتی پەڵکانە ( ئەشکەوتی گۆزەشکێن ) ئەمێننەوە بەڵام جاش و سیخورەکان پێیان ئەزانن و دێنە سەریان و لە 1988/10/10 لە داستانێکی قارەمانانەدا لە گەڵ هەردوو هاوڕێی بە ناوەکانی :شەهید جەلال جەبار شیخانی وشەهید تاهیر ناسراو بە ئاسۆ کەرکووکی دەگەنە کاروانی سەروەری

* سەرچاوە : مامۆستا بورهان عادل ڕەشید



# پارتیزان
# شەهید نادر مجید جوامیر
# ناسراو بە (نادر وارانی)

لەسالی ١٩٧٢لە ناوچەی داودە لە گوندی وارانی خوارو چاوی بەدنیا هەڵدەهێنێ.
سالی١٩٨٦ بەیوە ندی بەریکخستنەکانی یەکیتی نیشتمانی کوردستانەوە دەکات.
لە سالی ١٩٨٧ دەبێ بە بیشمەرگە لە کەرتی ٥ی تیبی ٥١ گەرمیان..
لەسالی ١٩٨٨ دوای ئەنفال وەك بیشمەرگەیەکی پارتیزان لە گەرمیان لەگەڵ شەهید سەیدجەوهەر ماوەتەوە شەهید نادر بەشداری زوربەی شەڕەکانی سنوری داوودەی کردوە لە شەرەکانی سە رکردایەتی بەسەختی بریندار بووە، باوك و دایك و دوو براو سی خوشکی بەر شالاوی ئەنفال کەوتوون، حەیف و هەزار مەخابن لەڕاپەڕینەکەی دووز خوورماتوو لە١٧/٣/١٩٩١ لەپردی پشت سایلۆکەی پایتەختی داویێ شەهید دەبێت و دەگاتە کاروانی پڕ لە سەروەری .



## شەهید عوسمان مەجید نەمەڵی *

. لەساڵی 1956 لە گوندی نەمەڵی
بناری شارەزور چاوی بەدنیا هەڵهێنابوو.
. لە ساڵی 1978 پەیوەندی بە (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) ەوە کردبوو.
. لەدوای ئەنفال تێکۆشەرێکی ئازا بووە، نازناوی (نەبەز) ی هەڵگرتوە.
. لە مانگی 11 1988 دا لەتیپی(3)ی سوپای رزگاری کوردستان (سرك) بووە
بە پێشمەرگە لەبەر ئازایەتیی کراوە بە جێگری تیپ و رۆڵی بەرچاوی هەبووە.
لە گەیاندنی پێداویستیەکان بۆ پارتیزانەکانی سنوری قەرەداخ و شارەزوور....
. ساڵی 1991 لەراپەرینەکەدا خەمی پاراستنی بەڵگەنامەو
مومتەلەکاتەکانی دام ودەزگاکانی رژێم بووە .
. دەرچووی خۆلی دووەمی فەرماندەی بووە لە کۆلیژی قەڵاچوالان.
لەژیانی پێشمەرگایەتیدا دوو جار بەسەختی بریندار کراوە.
لە ساڵی 1994 کراوەتە فەرماندەی تیپ لە مەڵبەندی (9) ی شارەزوور.
. ساڵی 1999 کراوەتە جێگری هێزی (3) لە شکری شارەزوور.

ئەوەی شەهید عوسمانی ناسیبێت دەزانێت ناوبراو لەوەتەی هەستی بە بوونی خۆی کردووە بۆساتێکیش خۆی لە بەرپرسیارێتی نەشاردوەتەوە و هەردەم لە ریزی پێشەوەی خەبات و بەرخوداندا بووە.

. لە شەوی 4/5 /2000/10 دا لەشەڕێکی نەخوازراودا شەهید دەکرێت.

---

سەرچاوە: عەبدول قەرەگۆلی . ماڵپەری کوردستان نێت



## شەهیدی پارتیزان
## کامەران هیدایەت مام فارس

. لە ساڵی 1968لە گوندی (دوانزە ئیمام)ی سەربەقەزای کفری لە دایك بووبوو.

. خوێندنی سەرەتایی وئامەدەیی وپیشەسازی لەکفری تەواوکردبوو.

. لە ساڵی 1987 پیوندی دەکات بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە لەکەرتی 6 تیپی51 گەرمیان . بەشداری لە شەڕەکانی سەرکردایەتی وەسەرجەم شەڕەکانی بەرگری ئەنفالدا کردبوو،وەك شەڕەکانی(سەر جادەی دووز و قادرکەرەم، کفری ، کفری سەرقەڵا، لێدانی ڕبایەی زەرداو، جبارە قەرتەپە ..

. لە مانگی 11 ساڵی 1988 لە کاتی پارتیزانیدا لەشەڕێکی بێ وێنەدا لە نێوان گوندەکانی (باوەکروخان)دا دوای کوژرانی زیاتر لە(25)جاش وسەربازی ڕژێم، وەك پارتیزان لە گەرمیان دەمێنێتەوە.... تاڕاپەڕینەکەی ساڵی 1991

. بەداخەوە لە 23/ 12/ 1993 بەدەستی کۆنەپەرستانی کوردستان لەشاری کفری شەهید دەبێت

سڵاو لە ڕوحی پاکی شەهید کامران و تێکڕای شەهیدانی کوردستان .

---

* سەرچاوە : بیرەوەرییەکانی کاك حەمەڕشید توکنی



# شەهیدبوونی
# پارتیزانی دوای ئەنال
# هەڤاڵ حەمەچاوجوان

بەداخ و پەژارەبەکی زۆرەوە ئێوارەی ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ١٨/خەرمانانی/٢٧١٤ بەرامبەر 9/8/2014 لەشارۆچکەی گوڵاڵە(جەلەولا) بۆمبێکی چێنراو بەکاروانی ئۆتۆمبێلەکانی کادری یەکێتیی و پێشمەرگەی دێرین و پارتیزانی دوای ئەنفال و فەرماندە (حەمەجاوجوان) دا تەقیەوەو بووە هۆی شەهیدبوونی.

* (PUK MEDIA)



# پارتیزانی دوای ئەنفال
# شەهید شکور عەلیانی

شکور ڕەحیم عبدالکریم ناسراو بە(شکور عەلیانی)

- لە ساڵی(1968) لەگوندی(عەلیان) لە خێزانێکی کوردپەروەر لەدایک بووبوو.

- لە ساڵی 1983 پەیوەندی بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوەدەکات. ـلە ـ لە ساڵی 1984 دەبێت بە پێشمەرگە لە تیپی (51)ی گەرمیان لە کەرتی (6)ی پ.م بووە، جارێك بەسەختی بریندار بووە ، لە شەڕەکانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەشدار بووە لە شەڕەکانی قەیوان و ماوات.

- یەکێك بووە لە پێشمەرگە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال لە ڕەتڵەکانی گەرمیان.

- مەدالیای ریزلێنانی لەلایەن هەڤاڵ (مام جەلال) وە پێ بەخشراوە .

لە 19 . 3 . 1991 لە شەڕە سەختەکەی دووز خورماتوودا دوای ڕزگارکردنی دووز بە سەختی بریندار دەبێ ، بە برینداری بەجێ دەمێنێ..

- گیانی خۆی بۆ هەتا هەتایی دەبەخشێ بە خاك و نیشتیمان .

- برای شەهید نوری ڕەحیم عەلیانی یە،ماڵەکەیان هەمیشەلانەی پێشمەرگەبوو.



# پارتیزانی دوای ئەنفال
# لەبیرەوەری هەڤاڵ مەحموود سەنگاوی دا

## بیرەوەری یەکەم



١٩٨٩/٦/٢٢

ئەمرۆ لەگەڵ کاك کوردۆ و ئەو مەفرەزەیەی ئامادەکرابوو بۆ دابەزینی گەرمیان چوینە مەریوان و هەرچی پێداویستی پارتیزانی هەبوو کە لە ئەزموونی برادەرەکانی ترمانەوە وەرمان گرتبوو کڕیمان تاکو ئاتاجی هیچ شتیك نەبین لە دابەزینمان بۆ ئەو چۆڵەوانی و دووره پەرێزیەی تێی ئەکەوین ،ئەو مەفرەزەیەی ئامادەکرابوو بۆ دابەزین بۆ گەرمیان بریتیبوون لەم هەڤاڵانە:

کوردۆ قاسم،مەحمودسەنگاوی،مقدادبرای شەهیدشێخ جەمال، حمەئێرانی، حەمەپاریاوڵە،هەژار،شەهاب خانەقینی، ئازادقەرەوڵی،ماجدفەیلی،سوهادداود، حەمە ئاخە،مامۆستا یاسین شێخ ئەحمەد، شەماڵ شێخ لەنگەری، حەمە چاوجوان، د.هاوڕێ،ئەحمەدحەسەن شێخ لەنگەری،هەڵکەوت ئەحمەدخێدان،ئیبراهیم دیسکۆ.

ڕۆژی ١٩٨٩/٦/٢٣ئوتۆمۆبیلێکمان گرت بۆ دزلێ ولەوێشەوە بە لاندکرۆزەرێکی لای برادەرانی خۆمان سەرکەوتین بەرەو چیای سورێن بۆبنکەی ڕەنگین کە پێشمەرگەی خۆمانی لێ بوو.

لە ١٩٨٩/٦/٢٤ لە کانی ڕەنگینەوە بەرەو شارەزوور

دابەزین و بەناو کێڵگەی مینی شارەزووری بێدەنگ و کپدا تێپەڕین ، جاران بە ناو خەڵك و ئاوادنیدا ئەڕۆشتین ئێستاش بە ناو کێڵگەی مین و چۆڵەوانیدا. شارەزاکانمان بریتیبوون لە برادەران فازڵ شیرە مەڕی و ڕەئوف حاجی سابیر و خەلیل سەرکانی و حەمە سیاسی و کەماله خڕە بوون کە ئەمانە هەموویان پێشمەرگەی چالاکی شارەزوور و شارەزایەکی باشی ناو چەکە بوون ئەمانە جگە لە حەمە سیاسی هەتاکوو شارباژێر لەگەڵماندا هاتن و هەر کە لە شاخی سورێنەوە شۆڕ بووینەوە هەستمان بە شادییەك دەکرد کە گەردی خوربەتی ئەسریەوە و شارەزوور ڕەنگی مردووی لێ نیشتبوو هەتا چاو بڕی کردایە هەر ڕەبایە و مۆڵگەی دوژمن بوو، بۆ شەوەکەی لای شیرەمەڕەوە دابەزین و چووینە لای کوڵکینەکان و

بەناو کێڵگەی میندا بە بێدەنگی دامان لە جادەی سەیدصادق هەڵەبجە و گەشتینە کەلاوەکانی تەپەرێزینە . وەختێکمان زانی لە ١٠ مەتری نزیکی ڕەبایەکەی دوژمنین ، نەمان زانی ڕەبایەی لێیە. لەو کاتەدا سەربازە پاسەوانەکە چەکێکی بیکەیسی پێ بوو داینا و ڕۆشت سەربازەکەی دوای خۆی بۆ پاسەوانی هەڵسێنێ،گەر بمان ویستایە چەکەکەمان ئەهێنا وسەربازی داماوپێی نە ئەزانی.بە ئەسپایی تێپەڕ بووین لەوێوە چووینە دێی تەپەسەرقووڵە، لە ناو ئەو زەل و ژاژو قەڕەمەدا ماینەوە،زۆر ماندووبووین تا ئەو ڕادەیەی نانمان پێ نە ئەخورا.

لە ڕۆژی ٢٥/ - ١٩٨٩ بەیانیەکەی لە تەپەسەرقووڵەوە ڕۆشتین و لە ڕاستی دێی گامێش تەپە بە سەر جادەی گشتیدا گەشتینە پشتی دێێ شانەدەری و دڕك و داڵ زۆر بەرز بووبووەوە بە شێوەیەك ئەبووایە هەر جارەی یەکێك ڕچەی دڕکەکەی بشکاندایە و ڕێگەی بکردایەتەوە و زۆر زۆریش تینومان بوو لەوە دەترسیان لە تینوێتیدا بخنکێێن، کە نزیك چەمی چاقان بووینەوە گوێمان لە خوڕەی ئاوەکە بوو وە بە پەلە هوتەرەمان کردە سەری و بینجمان پێوەنا و ئەونەمان ئاو خواردەوە هەناسەمان کورت بوو بوو. دوای پشویەکەی کورت لە چەمی پەریەرەوە بەرەو دۆڵی گەلاڵ ڕۆشتین و بێئاگا بووین لەوەی دوژمن بۆ کێومالکردنی ناوچەکە دەرچووەوە و پێش ئێمە ڕۆشتووە ، کە ڕۆژ بووەوە گەشتینە بەردەم قەلای سرچۆك لە دێی قەویلە ، هیچ جێگایەك نەبوو بۆی بچین و لە پاڵ هەندێ گاشە بەرددا لە چەقی ڕێگاکەدا خۆمان دا بە زەویدا و خەومان لێ کەوت و وەختێ خەبەرم بۆیەوە خۆر لێی دا بووین و قاچ و قولمان ئەوەندە دڕك و داڵێ پیا چەقی بوو خوێناوی ببوون و ئەوەندەش بە ناو سوتاویدا ڕێمان کردبوو ڕەش هەڵگەڕابووین و ڕەنگ لە ڕووماندا نەما بوو. برادەرانم لە خەو هەڵساند و زۆرمان تینوو بوو . لە سەروو خۆمانەوە ئەشکەوتێك بەرامبەر قەلاکە هەبوو کۆتری تێ ئەچوو و هەستم کرد ئاوی هەبێ بە برادەرانم وت :. من ئەچم بۆ ئەو ئەشکەوتە جیهازەکانتان بکەنەوە ئەگەر ئاوی هەبوو بە جیهاز پێتان دەڵێم وەرن بۆ لای من و ئەگەر ئاویشی نەبوو دێمەوە بۆ لاتان ، کە چوومە ئەشکەوتەکە تەماشام کرد حەزوێکی پڕ ئاوی تێدایە بۆیە ئەو کۆترانە لەوێ کۆ دەبوونەوە و ئاهێکم پێدا

هاتو جیهازێکم بۆ برادەران کرد   هەتا ئەوان هاتن من خۆم شۆرد و هەندێك چیلکەو چەواڵم کۆ کردەوە بۆ جێ لێنان. دوای پشوو دان بە دۆڵی گەلاڵدا بەرەو بەرزنجە رۆشتین و لە رێگا لە کانیەك ئاومان خوارد و مەتارەکانیشمان پڕ کرد و مام رەئوف حاجی سابیر کە رێ نشاندەرمان بوو پێی وتین لە بێ ئاوی مەترسن دێی ئەشکەوتان لە پێشمانەوە هەیە ئاوی باش و زۆری هەیە ، کە چووینە ئەوێ بۆ نەگبەتی ئاوەکە وشکی کردبوو بەلام ئەشکەوتێکی فێنکی لێ بوو کەمێك تێیدا حەساینەوە و بەرەو دەشتی زەڵێی خوار فاحیەی بەرزنجە کەوتینە رێ ، و زۆرمان تینوو بوو لە حەیبەتانا هەڵووژەی کاڵمان ئەخستە دەمممان کەچی ئەوەنەی تر دەمم و لێومانی وشك کرد. چووینە دێی گێلەر بۆ ئاو خواردن کەچی بارەگایەکەی سەربازی لێ بوو و لەوێوە بەرەو دێی کاژاو رۆشتین و لەوێش چادر هەڵدرابوو لە ناو چادرەکاندا چرا ئەگرا . لە تینوێتیدا ئەوەندە شپرزە بوو بووین وتمان ئەگەر بشکوژرێین دەبێ ئاو پەیدا بکەین و برادەران فازیڵ شیرە مەڕی و حەمە سیاسیمان نارده سەر کانی دێکە و کە ئاویان هێنا هێندە ئاومان خواردەوە زۆربەمان دڵمان تێك هەڵهاتوو رشاینەوە و ئینجا بەرەو خواروی دێکە کەوتینە رێ و تەماتە چێنرا بوو و وە تێگەشتین ئەمە ماڵی ئەو خەڵکانەیە کە نێردراونەتەوە بۆ کشتوکاڵ بۆ ئەوەی کە پێشمەرگەیان بینی خەبەری لێ بدەن و لەو ناوەدا تا کاتژمێر ٥ ی ئێوارە ماینەوە و لەوێوە برادەران کەمالە خرەو فازڵ شیرە مەڕی و مام رەئوف گەڕانەوە بۆ ئێران وحەمە سیاسیش لەگەڵ ئێمەدا مایەوە.دوای ئەوە بە رێ کەوتین بۆ دێی پوشێن و کە چوینە سەر شاخەکە کاکە حەمەپاریاوڵە پەکی کەوت و ناچار بووین کە بگەڕێینەوە لە ناو دارستانەکەی نزیك پوشێندا میقداد و برایم وسوهاد م نارد بۆ ئاو لە ناو پوشێندا کە وێران کرا بوو کە گەڕانەوەوتیان خەڵکی لێیە وئیتر لەوێ خۆمان شاردەوە وتمان بانەمان بینین.

## بیرەوەری دووەم



١٩٨٩/٦/٢٨

لە پوشێن تا کاتژمێر ٥ی ئێوارە ماینەوە تینوێتی برستی لێبڕین بە برادەرانم وت : وا خەریکە لە تینوانا ئەخنکێین ئەبیٚ بچین بزانین ئەو خەڵکانە کێن کە لە ناو پوشێندان ئەگەر خراپەکاربوون ئەیانگرین ، برادەران ڕۆشتن بۆ سۆراخ کردن و دوای ماوەیەك هاتنەوە، وتیان ئەو خەڵکانە بوون بۆ کوشتوکاڵ دێنە ناوچەکە تا چوینە نزیکیان ئەوان بەرەو عەربەت ڕۆشتبوونەوە. ئیتر ئێمە چووینە سەر کانی و ئاوەکە و شوێنێکی خۆش و ئاوێکی ڕوونی هەبوو . دوو ساڵ بوو چای عەلەممان نە دی بوو. ئەو زەلامانە چای زۆریان دانابوو، لەسەر حسابی ئەوان ناوی خوامان لیٚ هێناو جایمان لێناو کاکە حەمە پارپاوڵەشمان ڕووتکردەوەو خستمانە ناو حەوزەکەوەو ئاومان پیا ئەکرد تا گوج بێتەوە، کە خۆی شۆرد هەستی بە چاك بوونەوە ئەکرد. دوای پشوودان بەرەو چیای پشتی ئەشکەوتە ڕەش ڕۆشتین هێشتا دنیا تاریك نەبوو بوو، خۆمان حەشاردا تا دنیا تاریك دابیٚ و لەوێوە بۆ دۆڵی دوکانبان شۆڕ بینەوە کە زۆر جار بەو دۆڵەدا بە پیادە یان بە تراکتۆر و ئۆتۆمبیل ڕەتبووبووین لە کاتی هاتوو چۆکانماندا لە گەرمیانەوە بەرەو شارباژێر و سەرکردایەتی . کە نزیکی دۆڵەکە بووینەوە گوێم لە دەنگە دەنیٚ بوو ڕووانیم لە بەردەمماندا لەسەر جادەکە ڕەبایە هەیە، ٩ سەربازمان ژمارد، ناچار خۆمان ماتتدا تاکوو تاریکی بە تاواوەتی داهات. ، ئەوسا لە جادەکە پەڕینەوەو و بە شاخەکدا ڕۆشتین بۆ دیوی کەلاوەکانی دێی کۆزە ڕەقە، لەوێشەوە لە جادەی عەربەت سلێمانی پەڕینەوە و چوینە دێی یەخی ماڵی لەویٚ ئاویکمان خواردەوەو دامان لە ئاوی تانجەڕۆ و تێمان تەقاند بۆ بناری باخچە. چوینە بەردەم هەرەسەکانی ڕۆژئاوای دێکە ئەوەندە ماندوو ببووین شلوکول بووبووین هەر کە گەشتینە ئەویٚ و پاڵمان دەبەوە یەکسەر خەومان لێکەوت کە خەبەرم بۆیەوە تەماشام کرد لەو لامانەوە گاگەلێك ئەلەوەڕیٚ و سەرشاخیش پڕە لە سەرباز و جێش و وادیاربوو کێوماڵیان ئەکرد.برادەرانم وریا کردەوەو لەو شووێنەدا ماینەوە تا کاتژمێر ٦ی

ئێوارە ئاومان پێنەما بوو زۆریش تینوو مان بوو هەستام بە دوای ئاودا بگەڕێم هەر لە ٥٠ مەتری دووری خۆمانەوە ئاوێکی پاك و خاوێن هەبوو تێر ئاوم خواردەوەو گەڕامەوە لای برادەران وتیان: ئاوت دۆزیەوە .. ؟ وتم: پەلە مەکەن با تۆزێ درەنگ بکات ئاومان لێوە نزیکە.

میقداد خۆی پێ ڕانەگیرا و بە شوێن پێکەی مندا هەڵسا چووە سەر ئاوەکە بە دوایدا برایم ڕۆشت ئینجا مامۆستا نەجم ، وای لێ هات جاشەکانی سەر شاخ هەستیان کرد کە خەڵکی لێیە. هەندێ هاواریان کرد بەڵام نەهاتنە خوارەوە.

ئێوارەی ١٩٨٦/٦/٢٩بەرەو دێی میریاسی قەرەداخ مەسافەماندا لە سەر شاخ ڕەبایی زۆر دانرا بوو لە سەر چەقی ڕێگاکە چادر هەڵدرابوو ناچار گەڕاینەوە و چووینە هەرەسکەی پشتی دێی شەمە كاك حەمە سیاسی وکاك سوهاد هەرچەندە زۆر ماندوو بوون ناردمانن بۆ ئاو بەڵام زۆر مەردانە و بە هیمەت بوون.لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی لە ئێرانەوە دەرچووبووین پەیوەندیمان لەگەڵ برادەراندا بچرابوو. جیهازێکمان پێبوو لەگەڵ جفرەدا، من ناوم حاجی بوو، ویستم جیهاز بکەم تاکو هەواڵێك بزانم کە جیاهزەکەم کردەوە کاك بەرزانی حەمەی مینا کە بە جیهازێکەوە لە سەر سووریێن بوو بۆ پەیوەندی کردن بانگی حاجی کرد، وەڵامم دایەوە: فەرموو حاجیت لەگەڵە. بۆ ئەوەی یەکتری بناسینەوە نهێنیمان ئەوە بوو من بڵێم سەعیدم لەگەڵدایە. لە جفرەکەدا دێی شەمە ژمارە ٢٥ بوو. ژمارەکەم پێداو دڵنیا بوو لە گەیشتن و مانەوەمان و ئاگاردبشم کردەوە وەزعمان باشە.

١٩٨٩/٦/٣٠.

ئێوارەیەکی درەنگی نزیك خۆر ئاوا بوون بە ڕێکەوتین بۆ دێی نەوتی قەرەداخ، لەسەر شاخ سەربازێکمان بینی مەسینەیەکی پێبوو بۆ سەر ئاو ئەچوو ئەو ئێمەی نەبینی، ئێمەش هەقمان بەسەریەوە نەبوو. ئای کە دیمەنێکی تەماووی بوو، قەرەداخ کە مەڵبەندی قەرەباڵخی و ئاوادانی بوو خوا نەکا وورتەی تیا بێ وەکو پیاوێکی کەشەنگی لێهاتبوو باڵی دابێیتەوە و وەنەوزی خەو بردبێتیەوە. زەردەی

باڵە بەرز دیدە خەمناك و قەرچەوڵ براو بوو ، ئەتووت هێشتاش فرمێسکەکانی بۆ سێوسێنانەکی بە کیمیایی ژاراوی کراو سەر لە ئێوارەیەکی ئارامی ئەو دۆڵەدا هەر لە چاوا قەتیس ماوە لەو ڕاستەوە چووینە خوارەوە بینیمان هەر لە بازینەوە تا دەربەندیخان ئاگر ئەگرێ ئەمە بەڵگەی کێومالکردنی دوژمن بوو کە هەندێ جار هێزەکانی دەر ئەچوون ئاگریان بەر ئەدایە ناوچەکە ، ئەم ئاگر کردنەوەیە بۆ ئێمە زۆر باشبوو ئەمانزانی دوژمن لە کوێدایە. ئێمە بە ناو ئاگر و سەربازدا ئەڕۆشتین ئەمانویست بگەنە چیاکەی پشتی ئەستێڵی سەروو کەچی لە هەموو لایەکی چیاکەوە لایتی دەستی سەربازەکانمان ئەبینی، بۆیە گەڕاینەوە ئەستێڵی خواروو هیچ جیگابەك نەبوو بۆی بچین . دێی چەمی سمۆریش سەربازگەی لێبوو ، چوینە زەل و ژاژەکەی سەرچاوەی ئاوی ئەستێڵی خواروو لە بەیانیەوە تا ئێوارە نە ڕێگەمان هەبوو هەڵبستین نە بوواری ئاو خواردنەوەشمان هەبوو، نەشمهێشت برادەران جگەرە بکێشن ، مەگەر هەر پێشمەرگەی پارتیزان بتوانێ ئەوەندە ئۆقرە بگرێ و گوێرایەڵی فەرمانەکان بێ، چونکە بچووکترین دەرچوون لە ڕێچکەی بڕیارەکان کێشە درووست ئەکاو لەوانەش بە بێهوودە بە هۆی هەڵەیەکەوە گیانی هەمووان بەوکێتە مەترسیەوە. کەدرەنگ داهات ویستمان بچینە پشتی تەکیەو و لەوێەوە بۆ قۆپی سەگرمە بەلاّم دەروازەی هەموو قۆپیەکان گیرا بوو، لە هەموو لایەکەوە فیشەکی گڕدار هەڵئەکرا. من زۆر ئینکاریم کرد بچینە پشتی دێی تەکیە بەلاّم کاك کوردۆ و برادەران قایل نەبوون و چوینە پشتی دێی کۆشکی سەروو. ١٩٨٩/٧/١کە ڕۆژ بووەوە تەماشامان کرد دوژمن بە هێزێکی زۆرەوە بەرەو پشتی تەکیە سەرکەوت ، ئەگەر برادەران بە قسەی منیان بکردایە هەموومان لەو شوێنەدا تووشنەبووین و نەبووینە پاروویەکی ئاسان بۆ ئاگری چەکەکانی دوژمن، ناچار ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە و شەوەکەشی لەوێدا ماینەوە. .



## بیرەوەری سێیەم

١٩٨٩/٧/٢

بۆ خۆرئاوای دێی سێوسێنان ئەڕۆشتین کەچی سەربازی تێدا بوو، لەو دەمانەدا جیهازم کردبووەوە، کاک کەریم چاوڕەش هاتە سەرخەت و پەیوەندی پێوەکردین، هەواڵی باردۆخەکەم لێپرسی ووتی: هیچ ڕێگایەك نەماوە تەنیا ڕێگای کانی مامشەی پشتی دێی بەڵخە . ئەتوانن بۆ ناو قۆپی زەردە لەوێوە سەرکەون. ئیتر ئێمە لەوێوە چووینە دێی بەرزەوانی خوارووی سێوسێنان، لە کانییەکەی ئاومان خواردەوەو مەتارەکانمان پڕ کردوو بەرەو عەلیاواو بەڵخە ڕۆشتین، کە نزیکی سەرچاوەی کانییەکەی بەڵخە بووینەوە تووتڕکی زۆری هەبوو دەنگی هاژەی ئاوەکەش ئەهات، کاک حەمە باریاوڵە چوو ئاوبێنێ ئەوەندەمان زانی خشەیەك هات تومەز کاکە حەمە کەوتووەو خوارەوە، هاواری کرد کە کەووتووەتە ناو ئاوەکەوە و مەتارەکانی بۆ فڕێبدەن تا پڕی بکات ئێمەش مەتارەکانمان دایەو بۆی پڕکردین و دواتر بە پشتوێن هەڵمانکێسەیە سەرەوە. لەوێوە چووینە ناو قۆپیەکە کە دەیان جاریتر بەو ناوەدا ڕۆستبووین. بە تەما بووین لەڕێگەی پیاوە ڕێوە بۆ زەردەلیکاو بچین. دنیا ووردە ووردە ڕووناك بەوەوە و سەرشاخ دەرکەوت ، سەربازەکانی دوژمن دیار بوون ، ئیتر لە ڕۆژئاوای دەربەندەکە خۆمان حەشاردا.

١٩٨٩/٧/٣ لە قۆپی قەرەداخ بووین و لەوە ئەچوو هێزەکەی دوژمن کێومالیان تەواو بووبێ چونکە لەچاو ونبووبوون.دەمەو ئێوارە ووردە ووردە بەرەوزەردە هەڵکشاین. کە گەشتینە سەر شاخ و بشوویەکمان دا هەموو گەرمیانمان لێ دەرکەوت لە ناو تەمی ئازردا ئەتلایەوە و تا بینە قاقای وونبوو بوو ، تاسێکمان پێدا هات. لە کاتی

ئەنفالەکەشدا لەسەر شاخەوە هەموو گەرمیانم دی گڕی تێبەر بووبوو، دووکەڵ وتەپوتۆز وشین وشەپۆڕ بوو،ئەوا ئەمجارە بەچۆڵ وهۆڵی ئەیبینمەوە و قەرەی تیا نەماوە جگە لەو چەند پێشمەرگە عەودالە خۆشەویستانەی خاکی کوردستان نەبێ. کسپەیەك لە قوڵای ناخمەوە هات و کوڵی فرمێشك بەرینی گرتمم . پاڵم دا بە گاشە بەردێکەوە لە بارێکی دەروونی تایبەتیدا بووم بیر و ئەندێشەم بۆ دەیها مەبەست باڵی گرتبووەوە. یادگاری زۆری رۆژانی زووترم ئەهاتەوە یاد، سۆزێکی پڕ خرۆش لە ناخمەوە هەڵئەقولا بۆ خۆشەویستی گەرمیان، حەزم ئەکرد لە سەر شاخەوە بفڕم و خۆم بکەمە بەکە بە یەکەی ماڵە رووخاو و خاپوورەکاندا، ئارەزووم ئەکرد باوەش بکەمە هەموو تل و بەردێکیدا و خەمی دووری و ناسۆرییەکانی ئەنفالی لە بیر خۆم ببمەوە، کە چی هەتا چاو بڕیکات کەس دیار نەبوو. لە ئەندێشەمدا چووبوومەوە ناو ئەو پانتایبە چۆڵەی گەرمیانەوە و هاوارم ئەکرد:

هۆ و خەڵکینە ئەوە لە کوێن؟ بۆ دیار نین..؟

تۆ بڵێی راپێچی توونی مەرگ کرا بن ...؟ کەسێك نەبوو وەڵام بداتەوە...!

چ کارەساتێك قەوماوە..؟ کە سەر لەم هوارە خاڵییانە ئەدەی زیاتر هەست بە پابەند بوون بە خاك و نیشتیمانەوە ئەکەیت. نەك هەر من هەموو برادەران کەوتبوونە هەمان کەڵکەڵەوە هەر یەکە لەگەڵ ئەندێشەی خۆیدا گرمۆڵە بووبوو.لە دوای پشوودان شۆر بووینەوە لە کانییەکەی پشتی زەردەلیکاو چاومان بە کاك کەریم چاورەش و برادەرانی کەوت و کە لە رۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ ەوە نەمان بینیبوون. بە دیداریان شاد بووین و تاسەمان لە یەك شکا و شەوێش لەوێ ماینەوە.

١٩٨٩/٧/٤ بەیانیەکەی چووینە شۆراوەکەی پشتی قەڵای تەپەگەڕووس تا ئێوارە لەوێ بووین. شەوەکەی چووینە چیای ئاژداخ و کاکە حەمە رەش و کاك حەمە ئاخەمان بینی لە جێگایەك دابوون پێی ئەوترێت: بەردەکەی لالە شەریف. لەوێ ٢ رۆژ ماینەوە ئینجا چووینە لای برادەران مەریوان حاجی حسێن و مەلا سعید لە سەرووی ژێی مەلا هۆمەر، بۆ بەیانیەکەی چووینە قەڵۆزێك لە نێوان مەلا هۆمەر و سپێسەردا کە جێگایەکی زۆرخۆشبوو ناو نرابوو بە مەسیفەکە، شەوکەیشی بووینە میوانی کاك ئەحمەدی حاجی رەشید لە نێوان مەلا هۆمەر و تیلەکۆی

زەنگنەدا. ٨/٧/١٩٨٩ چووینە کانی دڕکەی نێوان چیای مازوخ و دێی قەواڵی کە زەوی ماڵی باوکی کاک ڕۆستەمە و لە دوای ئەنفالەکاندا برادەران مەڕێکیان تیا دۆزیبووە بۆیە ئەو شوێنەیان ناو نابوو مەڕەکە. ١٠/٧/١٩١٨٩ لای برادەرانی کاک حوسمان بووین کە شوێنەکەیان ئەکەوێتە خۆرهەڵاتی دێی گۆبان عەرەبی سەرووی کفری. دنیا زۆر گەرمبوو بە ڕادەیەك بوو قەیسیمان ئەکردە ئاو ئەماندا بە لەپماندا تاکو ئاوی ترش بداتە وە و ئینجا ئەمان خواردەوە تا گڕ ە و گەرما نەمان بات و نەخۆش نەکوین.

لە کوردەواریدا نیشانەکانی گڕە بردن ئەمانە بوون:

زەردهەڵگەڕان، گیان گەرمبوون، ڕسانەوە ، زەحیری. لە کوردەواریشدا وا باو بوو ئەو منداڵەی تووشی گەرە ئەبوو ئەیانخستە تویی کونەوە ، ئاوی قەیسی ناوکداریان ئەدایەو و بەیانی زوو بە ئاوی سارد ئەیان شۆرد ، بۆ زەلامی گەورەش ئەبووای ئاوی قەیسی بخواردایە و بە ئاوی سارد مەلەی بکردای و چەوری نەخواردایە. ١١/٧/١٩٨٩ لەگەڵ کاك حەمە ڕەش و کاك عوسماندا ڕۆشتین بۆ بینینی هەڤاڵانی ڕێکخراوی سلێمان کە سەرپەرشتی دابینکردنی پێویستییەکانی پارتیزانەکانیا ئەکرد. لە ٣کم ڕۆژئاوای کفرییەوە چووینە دواجینێك لەوێ پیاوێك هاتە پیریمانەوە ناوی عەزیزی بوو، ئەو منی بە ناو ئەناسی، پرسیای کرد: گوندە چۆنە..؟ منیش وتم: گوندە کێیە..؟ ووتی: کاك شەوکەت . تومەز ئەمە خەڵکی شارەزوورە و تێکەڵی لەگەڵ کاك شەوکەتدا هەیە. دوای زانیم ئەمە کاك ئەحمەدی برای کاك جەلال کوڵکنییە. لەگەڵ کاك عەزیزدا دامانە قسەو باس و دەمەتەقێ لەسەر زۆر شت، چەند نامەیەکم نووسی و بۆ لالە سەرحید ی ڕۆگزایی و کاك حەمەی حاجی مەحموود هارونی و عوسمانی مام کەرمی پورزام، دامنیە دەست کاك ئەحمەد بیگەینێتە شوێنی مەبەست. دوای تەواو کردنی کارەکان گەڕاینەوە حەشارگەکانی سێ قازانەی نزیك باوەشاسوار.

**بیرەوەری چوارەم**

***<u>ڕۆژی جەژنی قوربان</u>***

***١٣/٧/١٩٨٩ ڕۆژی جەژنی قوربان بوو. خەڵکی دنیای ئیسلام ئەکەونە جۆرە خۆشییەکەوە. گەرچی کورد ئیسلامە و جەژن وەکو ڕێوڕەسمێکی ئاینی ئەگێڕێ بەڵام ئێمە لە سای ئەو ڕێوڕەسمە*** **ئیسلامییەدا بێ مافین و بەڵکو لە ژێر پەردەی ئەودا لە ناو ئەبرێن. لەم ڕۆژ و بۆنەیەدا هەستم ئەکرد ئێمە لە دنیایەکی تردایین ، لە کوونە پەناگەیەکدا کات بەسەر ئەبەین، کەچی ئەو ڕژێمەی فەرمانڕەوای عێراقی ئەکرد و یاسا و ڕێسای ئیسلامی پەیڕەو ئەکرد بە ڕەوای نە ئەبینی ئێمەش وەکو گەلێکی موسوڵمان و ڕۆژهەڵاتی مومارەسەی مافەکانمان بکەین. لەوانەشە کەسانێك هەبن بڵێن ئەم ڕژێمە دوورە لە ئیسلامەوە و بۆ مەرامەکانی بەکاری ئەهێنێ کەچی بەشێکی زۆری زانایان و پیاوانی ئاینی ئیسلام داکۆکی لێئەکەن، لە ژێر سایەیا کۆنگرەی ئیسلامی ئەبەستن، لە هەمانکاتدا کۆمەڵێکی تریان دژی ئەوەستن، نە ئەویان ئەتوانێ لە ڕێگەی پشتیوانی کردنیەوە بەرەو ئاقاری باشتری ببەن نە ئەمیان ئەتوانێ بیڕووخێنێ و لە ناوی ببات.**

**ڕۆژی ١٤/٧/١٩٨٩ ئەمڕۆ لە ڕێگەی ڕادیۆکانی جیهانەوە هەواڵی تیرۆرکردنی د.قاسملوما‌ن لەڤێنای پایتەختی نەمسالەلایەن دوژمنانی کوردومرۆڤایەتیەوە بیست. کەسێك نییە بتوانێ لە ئاست ئەم تاوانەدا بێدەنگ بێ و هەستی دەرنەبڕێ چونکە شەهیدکردنی قاسملو داخێکی گەورەیەو بەڵگەی ئەوەشە دوژمنانی کورد ئاشتییان ناوێ. کاتێ کورد ئەچێتە سەر مێزی گفتوگۆ لە جیاتی ئەوەی مافەکانی بسەلمێنێ گوللەی مەرگی پێوە ئەنرێ.د.قاسملو کەسایەتییەکی گەورەی سیاسی و دبلۆماسی ئەم سەردەمەی کورد بوو، نەخشێکی باشی لە ناساندنی گەلی کورد بە جیهان و ئەورووپا هەبوو. سەیر لەوەدایە بکوژەکانی د.قاسملو وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون.**

١٩٨٩/٧/١٥ هەرلەسێ قازانە بووین، ئێوارەکەی چووینە هەمان شووێنی پێشوومان لە دەواجینەکەی خواری کفری بۆ چاوپێکەوتنەوەی کاك عەزیز بۆ وەرگرتنەوەی وەڵامی هەندێ ڕاسپاردەی ئێمە. شەو درەنگانێك گەڕاینەوە سێ قازانە.

١٩٨٩/٧/١٧ لەگەڵ کاك حەمە ڕەشدا کاتژمێر ١٠ ی پێش نیوەڕۆ لە سێ قازانەوە بەرەو سەرەوە بەرێکەوتین تووشی کۆمەڵێك منالی کفری بووین ئەوان ئێمەیان نەدی دیارە بە بۆنەی ١٧ ی تەموزی جەژنی بەعسەوە هاتبوون بەو ناوەدا بە شوێن بەچکە کوڕکوڕدا، ئێمە ڕێڕەوی خۆمان گۆڕی تا نەمان بینن نەکو ئاگاداری دوژمن بکەنەوە لە ماوەیکی کەمدا هێزێکی گەورەیان ئەهێنایە سەرمان و تووش ئەبووین و حەشارگەکەمان ئەدۆزرایەوە چوونکە ئێمە بۆ شووێنە ونکێ ئەو پەنایەمان هەڵبژاردبوو لە نزیك باوەشاسواری کفریەوە کە دوژمن گومانی نە ئەکرد لەو ناوانەدا هەڵبکەین. شەوەکەی چووینە نزیکی دێی هەزار کانی شێخ کاکە حەمە، بۆ بەیانییەکەی هەندێ وێنەمان لەگەڵ کاك حەمە ڕەشدا گرت بە یادی کاکە شێخ حسێنی هەزار کانی کە نەك هەر من بەڵکو زۆربەی برادەرانمان یادەوەری زۆریان لەم دییەدا هەیە و دۆستایەتیمان لەگەڵ کاك شێخ حسێندا هەبوو، هەمیشە بە ڕووە گەشەکەیەوە پێشوازی ئەکردین. لەئەنفالەکاندا هەڵوێستێکی مەردانەی هەبوو، هەندێ لەجاشە خزمەکانی هەوڵیاندابوودەربازی بکەن بەڵام قایل نەبوو بە تەنیا هەر خۆی دەربازبێ . داوای کردبوو لە فەرماندە سەربازیەکانی ڕژێم خەڵکەکەش ئازاد بکرێن . ئەوان بەمە قەڵس بوو بوون و بەیاکجاری بردیان و ئیتر نەهاتەوە.

لەوێشەوە ڕۆشتین بۆ شەوەکەی گەشتینە لای زاوات و چووینە پەناگەکەی هاوڕێ سەید محەمەد کە بە قەد جیای داری خلەوە بوو ، ڕووی لە کەلار بوو لەوێ هەندێ خواردنیان بۆ کردین پڕ لە گوو مشك و مێشولە بوو. تووشی حەساسیەتی کردم خەریك بوو بمرم. شەو سەید هەر خەریکی جیهاز کردن بوو پێم ووت: هاوڕێ سەید ئەوە بەم شەوە درەنگە جیهاز بۆ کێ ئەکەیت...؟ ووتی : بۆ برادەرانی ڕێکخستنی ناو شار ، هەندێ مەوعیدم لەگەڵیانا هەیە و خەبەری هاتنی ئێوەشیان ئەدەمێ کەچی جیهازەکەی ناو شار نەهاتنە سەر مەوعید. دوایی زانیم ئەو جیهازە لە ناو مونەزەمەی کەلاردا دانرابوو، ئەو کابرایەی جیهازەکەی لابوو پەیوەندی بە

یەکێك لەگەڵ دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمەوە هەبوو. لە میانە قسەکردنماندا هاوڕێ سەید وتی؛ چاویلکەکەم شکاوە و بە تەمام سەرێکی ناو شار بدەم، پێم وت: بۆ لەگەل برادەراندا ناڕۆیتەوە ئێران هەم پشوویەك ئەدەیت و هەم چاویلکە دروست ئەکەیت، وتی: هەر ئەچم بۆ ناو شار، وتم: بە شایەتی برادەران من پێشم باش نییە بچیت و خۆشت لە هەر گرفتێك بەرپرسیار ئەبیت، ٣ ڕۆژی لای هاوڕێ سەید محەمەدماینەوە،پاشان بەرەودێی قولیجان ڕۆشتین ولەوێشەوە بۆبنکەکەی خۆمان لەئاژداخ.
١٩٨٩/٧/٢٣ لەم ڕۆژەدا مەفرەزەیی دووەم مان کە لە ئێرانەوە بەرێکەوتبوون بۆ گەرمیان گەشتنە دێی زەردەلیکاو. ١٩٨٩/٧/٢٦ کۆپتەرەکانی ڕژێم بە ئاسمانی چۆلی ناوچەکەدا ئەسووڕانەوە و ڕۆژی دواتر هێزەکانی دوژمن کێومالیان دەستپێکرد. ١٩٨٩/٧/٢٨ کێومالکردن هەر بەردەوامم بوو. ١٩٨٩/٧/٣٠ دوژمن گەیشتە دێی مەسۆی سەرچەم و بناری پێنج ئەنگوست و هەر ئەمرۆش برادەران حەمە ڕەش و سەید جەوهەر و کەریم چاوڕەش بە هێزەکانیانەوە بۆ دیوی ئێران گەڕانەوە کە بەکەمجار بوو لە دوای ئەنفال سەرئەکەوتنە سەرەووە بۆ پشوودان و بینینی کەسووکار ومالّ و مندالّ و دۆست و برادەران. ١٩٨٩/٧/٣١ کێومالّ هەر بەردەوام بوو من هێشتا شارەزای ئەو دۆخە نەبوو بووم وامئەزانی کێومالّ ماوەیەکی کەمی پێ ئەچێ و و ئینجا دوژمن ئەگەڕێتەوە. وام بەچاك زانی بچینە قەڵبەزەکەی ڕەحیم لە خۆرئاوای کۆیك ، گوایە ئەو شووێنە چۆڵە و دوژمن پێی ناگات بەلاّم دوژمن کە دەرئەچوو هەموو شووێنەکانی بە هێزی پیادە ئەتەنی و لە ئاسمانیشەوە کۆپتەر ئەسووڕایەوە. دوواتر گواستمانەوە بۆ قەڵبەزە ڕووخاوەکانی نێوان مەلا هۆمەر و سپێسەر و فەقێ مستەفا، لە دوای ئەنفال دەڵە سەگیکی تیا تەرەکی بوو برادەران ناویان نابوو دەڵەکە. ١٩٨٩/٨/٤ چووینە مەسیفەکە بۆ لای مەلا سەعید و لەوێشەوە ئاخەو هەندێ برادەر چوون بۆ خانووەکەی کاك کەریم چاوڕەش بۆ هێنانی هەندێ ئازووقە .



## بیرەوەری پێنجەم

١٩٨٩/٨/٦

چەن رۆژێك بوو رۆنمان لیٚ بڕابوو ئاخە ووتی: من لە ساڵی ١٩٨٨ لە دەووری مەسۆیی لە شووێنێکدا قووتویەك رۆنم قایم کردووە سەرقاپی نەبووە ئەچم ئەیهێنم . چوو ڕۆنەکەی هێناو هاتەوە . ئەو قووتووە رۆنە یەك ساڵی بەسەرا تێپەڕیبوو پێزی نەمابوو لەبەر خۆر سپی هەڵگەڕا بوو لەبەر نەبوونی و پێویستیش چێشتیکمان لێکرد بۆ ژەمی دووەم کە کەوچکمان لێدا جرجێك دەرکەوت کە کەوتبووە بنیەوە، تووکی پێوە نەما بوو هەر گۆشتە سوورەکەی مابوو، برادەران ئێڵنجیان ئەدا وەزعیان خراپ تێکچوو منیش دڵم دانەوە و پێم ووتن: ئێمە تازە رۆنەکەمان خواردوە و هەزمان کردوە ئیتر ئێڵنجی چیتانە ... ؟ ١٩٨٩/٨/٧ چووینە کانی دڕکەو لەوێوە چووینە سیٚ قازانی لای کاك عوسمان بۆ ئازووقە و کەلوپەلی پێویست کە لە شارەوە بۆمان هاتبوو دوای ٣ رۆژ گەڕاینەوە. ١٩٨٩/٨/١٠ گەیشتینەوە دەڵەکە دوژمن زۆر بە توندی کێومالّی سنوری کۆیکی ئەکرد. هێزەکەی دوژمن زۆر بوو زۆر بە ووردی ئەگەڕان تەنانەت سەگیشیان پێبوو، بە دەیان کۆپتەر ئەسووڕایەوە. ١٩٨٩/٨/١١ هێزەکەی دوژمن نزیك بووەوە لێمان لەوە ئەترساین بە هۆی سەگەکانەوە پەیمان پیٚ ببەن . بە تەما بووین شووێنەکەمان بە جیٚ بهێڵین و رۆژیش هێشتا زۆری مابوو. لە ناکاو ئەو هێزەی دوژمن پاشەکشەی کرد و ناوچەکەی بەجیٚ هێشت، نەشمانزانی بۆچی گەڕانەوە.. دوای ئێمە چووینە خوارەوە بۆ کۆیك لەو شووینانەی کە هێزەکانیان مۆڵیان دابوو خواردنی قووتوکراوی زۆریان لە دوای خۆیان جێهێشتبوو هەموویمان کۆ کردەوە، تەنانەت شووتیشیان بە جیهێشتوو برادەران لێیان خوارد من خۆم لێم نە خوارد نەکوو ژاراوی کرابیٚ. نەممان ئەزانی بۆ ئەو خواردنانەیان بەجیٚ هێشتووە ، لەوانەیە بۆ بار سووکی فڕێیان دابی یان خەڵکێکیان هەبیٚ هەستیان کردبیٚ پارتیزان لە ناوچەکەدا هەبیٚ ووەکو مەسەلەیەکی ویژدانی ئەو خواردنانەیان دانابیٚ تاکو

دەست ئەو پارتیزانانە بکەوێ. ١٩٨٩/٨/١٢ لە دەڵەکەوە گواستمانەوە بۆ هەژاراوا. ئەمەئەشکەوتێکی سەختبوو کاك حەمەڕەش دۆزیبوویەوە هەمووکەس نەیئەتوانی بچێتە ناویەوە و دوژمن پێی نەزانیبوو، لەبەر ئەوەی خەڵکێکی بێنەواو هەژاربووین لە ڕووی سامان و داراییەوە بە بەراوورد لەگەڵ ژیانی هایلاق خەڵکی خواپێداوی ئەم دنیایە لەم هەلو ساتانەدا ئەم ئەشکەتە ناو نرابوو هەژاراوا. ١٩٨٩/٨/١٣ لە دوای ڕۆشتنی کاك حەمە ڕەس و برادەران بە جیهازە گەورەکە پەیوەندیمان بە مەکتەبی سیاسیەوە کردْ. ١٩٨٩/٨/١٤ کاك عوسمان بە جیهازە بچووکەکان هەواڵی دەستگیر کردنی هاوڕێ سەید محەمەدی پێدای لە کەلار ڕۆژی ١٩٨٩/٨/٢ بە پێی پیلانێکی دارێژراو ئەنجامدرابوو. ١٩٨٩/٨/١٦ دوای دڵنیا بوون لە هەواڵەکەی هاوڕێ سەید محەمەد بە جیهازی گەورە ئاگاداری مەکتەبی سیاسیمان کردەوە. ١٩٨٩/٨/١٧ لەگەڵ برادەران میقداد و سوهاد بەرەو شاخەکەی پشتی قەڵای تەپەگەڕوس بەڕێکەوتین ، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینە ناو کەلاوەکانی دێی قەڵاو شەوەکەی سەرکەوتین بۆ شۆراوەکە کە ئەکەوێتە قەد پاڵی شاخەکە. ١٩٨٩/٨/١٨ لەو شاخە بە شوێن ئەشکەوتێکدا ئەگەڕاین کە سەرەتای درووستبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی (ی.ن.ك) لە قەرەداخ و گەرمیاندا کرابووە کتێبخانە، کتێب و بڵاوکراوەکانی کۆمەڵای تیا دانرابوو. لە کاتی گەڕاندا کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ میقداد بانگی کرد: ئەوە زەلامێکی جل ڕەشە. ئیتر ئێمە کەوتینە چاودێریکردنی ئەو زەلامە بینیمان چووە سەر ئاوێك و گەڕایەوە شوێنەکەی خۆی، بۆمان دەرکەوت جاش دەرچوون و خۆیان بۆ چاودێریکردنی ناوچەکە و دۆزینەوەی پێشمەرگە حەشارداوە. ئێمە گوێمان نەدایە ئەو جاشانە و بەردەوام بووین لە کارەکەی خۆماندا لەهەمان کاتیشدا چاودێریمان ئەکردن. میقداد وتی: ئەمە شوێنێکی زۆر باشە. کە چووین تەماشامان کرد شوێنێکی سەختبوو لە هیچ لایەکیشەوە نە ئەبینرا مەگەر بەکێکی شارەزا بیزانیایە ئەمە ئەشکەوتە ئەوەندە فراوان بوو جێگەی ١٠٠ کەسی تیا ئەبووەوە کە تەماشایەکی خوارەوەمان کرد بینیمان جاشێکی تر کەوتە گەڕان و بەرەو لای خوارەوەی دێکە ڕۆیشت، کە شەو ئێمە

لەوێوە سەرکەوتبووین دیار بوو ئەو جاشە شووێن پێی ئێمەی دۆزیبووەوە یەکسەر گەڕایەوە بۆ لای جەماعەتەکەی و یەکێکی تری لەگەڵ خۆیدا هێنا کە جلی سەربازی لە بەردابوو بۆ سەیری شوێن پێکان .لەوە ئەچوو ئەوە ئیستیخبارات بووبێ، بە شووێن پێکاندا ڕۆشتین ماوەیەك لە دێکە دوور کەتنەوە، وا پێئەچوو شوێن پێکانیان لێ ونبووبێ. لەبەر ئەوەی سەرووی دێکە بەردەڵێنی بوو نەیان ئەزانی بەرەو چ لایەك ڕۆشتووین دوای ئەوە ۲ سەربازی تریش هاتن بۆ لایان و پێکەوە چوونە پشتی دێکە کە پێی ئەوترێ سەربانی تەپەگەڕوس، لەوێ بە جیهاز پەیوەندیان ئەکرد و ئاگریشیان کردەوە پوش و پاوانی ئەو ناوەیان سووتان، دوای گەڕانەوە بۆ ناو دێ ڕووخاوەکە و دارێکی زۆریان کۆ کردەوە و ئاگریان پێوەنا تاوا لە پێشمەرگە بگەیەنن هەر ئەو شوێنە هێزی تیایە بەڵام ئەوان وا دیار بوو بەرنامەی بۆسە دانانیان هەبوو ئینجا هەموو کۆبوونەوە کە گەیشتنە ۲۵ کەس. تا ئەمەیان کرد دنیا بەرەو تاریکی ڕۆیشت، ئینجا چاومان پێوەبوو بەرەو دەربەندەکەی پشتی تەپەگەڕووس چوون، دیارە پێیان وابوو پێشمەرگە گەر هەبێ لەو دەربەندەوە هاتوو چۆ ئەکەن. ئێمەش لە خوار بۆسەکەی ئەوانەوە دابەزین و گەڕاینەوە بۆ لای برادەران لە ئاژداخ.



## بیرەوەری شەشەم

۱۹۸۹/۸/۲۱

دوو کۆپتەر هاتن بە نزمی ئەفرین، یەکێکیان زۆر بچووك بوو لاشەکەی زۆربەی لە شووشە دروستکرابوو قەت لەو جۆرەمان نەبینیبوو.

۱۹۸۹/۸/۲۵

کاك ئەحمەدی حاجی ڕەشید برووسکەیەکی بۆ کردین کە شاکری ئامۆزای گەیشتووەتە ناوچە چۆڵەکانی گەرمیان، دیارە لە لایەن ڕژێمەوە زۆری لێکرابوو بۆ سۆسەکردنی پارتیزانەکان. لە لایەن مەفرەزەکەی کاك عوسمانەوە گیراوەو دوای ئەکرد سزای گوللە بارانکردنی بەسارا بدرێ. کەم کەس هەیە لەو ڕوانگە نیشتیمانپەروەرییەوە بەو جۆرە بڕیار بدات و لە سۆزی خزمایەتی و کەسایەتی

دوور بکەوێتەوە مەگەر کەسە شۆڕشگێڕە وشیارەکان.هەرچەندە کاک ئەحمەد خوێندەواری نەبوو بەڵام وەکو تێکۆشەرێکی قاڵبووی بوواری خەبات لە پلەیەکی باشی لە خۆبردویی و تێگەیشتوو لە ئەرکەکانی سەرشانی دابوو ئەمە وای لێکردبوو لە بڕیارداندا جیاوازی نەکات کەسی خۆی بێ یان بێگانە. لەو روانگەشەوە بوو کە دژی ئامۆزاکەی خۆی بوو تۆزقاڵێك بەزەیی پیایا نەهاتەوە.

١٩٨٩/٨/٢٦

بەجیهازە ڕاکاڵەکە خەریکی پەیوەندی کردن بووم لەگەڵ سەرکردایەتیدا لە ناکاو کۆپتەرێك زۆر بە نزمی بەسەر شوێنەکەمانا تێپەڕی. پێش ماوەیەکیش بوو ڕێکخراوی سلێمانای ئاگاداری کردبووینەوەکەوادوژمن بەجیهازی ڕازێت ئەتوانێت شوێنی جیهازەکەمان ئیستیمکان بکات، ئەبێ زۆر ووریای خۆمان بین و لە کاتی پەیوەندی کردندا کەم و کورت قسە بکرێ.

١٩٨٩/٨/٢٧

کاتژمێر ٩ ی سەر لە بەیانی ٤٠ جاشی خۆفرۆش هاتن بۆ دێی پێنج ئەنگوستی شێخ مستەفا. گوێدرێژیان پێبوو یەکێك لە جاشەکان گوێدرێژەکەی بردە پەنایەکی کەلاوە پووخاوەکانی دێکە کە مەرقەدی شیخ مستەفای لێیە......!!

١٩٨٩/٨/٢٩

جارێکی ترمام جەلال کادیرەکانی یەکێتی کۆکردەوەومەسەلەی بەردانی هەڤاڵ مەلابەختیاری خستبووە بەردەمیان......

١٩٨٩/٨/٣٠

دیسانەوە کۆپتەرێك لە کاتی پەیوەندی کردندا بەسەر شووێنی جیهازەکەماندا زۆر بە نزمی ڕەت بوو ناچاربووین پەیوەندیەکەمان بپچڕین.

١٩٨٩/٩/١

ڕادیۆی ئیسرائیل لە هەواڵێکدا باسی پیاوێکی ئێرانی ئەکرد بە ناوی زەینەلی خەڵکی شاری ئەراك لە تەمەنی ١٢٣ساڵیدا ئەیویست ژن بهێنێ کوڕە گەورەکەی تەمەنی ٨٥ ساڵ بوو، ٦٥نەوەی لە کوڕ و کچ و کوڕەزا و کچەزا هەبوو.

١٩٨٩/٩/٢

هەواڵی تەقینەوەی کارگەی تەسنیع عەسکەریمان دایە مەکتەبی سیاسی کە لەلایەن ڕێکخستنەوە هەواڵەکەیان دابووە کاك عوسمان و ئەویش بە جیهازی بچووك ئاگاداریکردینەوە، ئەم هەواڵە لە بەغداوە زۆر بەپەلە گەینرایە ڕێکخستن تاکو ئاگاداری سەرەوە بکرێتەوە.

١٩٨٩/٩/٣

لە قەد شاخی ئاژداخ دانیشتبووم بە دوربین تەماشای ناوچەکەم ئەکرد یەك بە یەك چاوم ئەخستە سەر دێهاتە کاولکراوەکان و کەوتمە ناو گێژاوی ئەندێشەیەکی قووڵ، گەڕامەوە بۆ زەمەنێکی کۆنتر کە دێهاتەکان هەموو پڕ ئاوەدانی بوو،خەڵکی جمەی ئەهات کەچی لەپڕێکا قەلەڕەشەکەی بەعسیان قیراندی وهەمووشووێنێ بوو بەوێرانە خەڵکەکەش کەس نەیزانی چی لێهات..؟کەچی ئێمە لەم کونە ئەشکەوت و بن قەڵبەز و تاشە بەردانەدا هەمیشە ئازاری وونبوونی ئەوان ئەچێژین، لەم چۆڵە وانیەدا ئەمانەوێ بەشێکی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆمان گرتووە و بەڵێنمان بە خەڵکی داوە تا دوا هەناسە خەبات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان بکەین.

1989/9/6

کاتژێمی ٨ی بەیانی بوو ئاخە چووبوو سەری گوێدرێژەکە بدات کە لە دوور قایمی کردبوو نەوەکو کۆپتەر یان جاش و سەربازی دوژمن بیدۆزنەوە کە گەڕایەوە ووتی: گوێدرێژەکە خەریکە ئەزێت. منیش ئازاد قەرەوڵسیم بانگ کرد و پێم ووت: بچۆ ئەگەر گوێدرێژەکە زا بوو جاشەکەی بکوژە. وەنەبێت بەزەیمان بەو ئاژەڵە بەسەزمانەدا نەهاتبێتەوە بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە ئەو جاشە کەرە کێشەی بۆ درووست ئەکردین و بۆمان دابین نە ئەکرا لە شاردنەوە دا کە ئەبووە مایەی ئاشکرا کردنمان بۆ دوژمن. بۆیە ناچار بووین لە ناوی بدەین هەرچەندە کارێکی ناخۆشیش بوو پڕ بە دڵ ئازارم پێگەیشت. ئەوەتا ئێمە بەزەییمان بەم ئاژەڵەدا دێتەوە گەر بە ناچاری و لەبەر هۆکارێکی ڕەواش لەناوی بدەین بەڵام بەعس بە سەدان هەزار مرۆڤ ئەکوژێ و بە زەماوەندی ئەزانێ و دڵی تۆزقاڵێك گەردی خەم نایگرێ.!

٦/٤/١٩٩٠حەسەنە ڕەشی ئامۆزای سەمەدهۆمەرملی کە لەپەناگەی کەلەڕ بوولای کاك کوردۆ بە ڕووتی ڕایکرد بوو چەك و تاقمەکەی و تەنانەت پشتوێنەکەشی بەجێ هێشتبوو و تەسمیلی ڕژێم بووەوە،بەڵام خەمی ئەوەمان نەبوو خەبەرمان لێبدات. کاك کوردۆش هاتبوو بۆ لای کاك عوسمان و برادەران نەیئەتوانی سەرکەوێ زۆر ماندوو بوو بوو. بەهەر حاڵێ بوو سەرمان خستە سەرەوە.

١١/٤/١٩٩٠ سەرما و سوڵە و باو باران هەڵیکرد بوو ئێمەش لای خۆمانەوە دەورەو تەسمیلمان ئەکرد، کاك عوسمان چووە خوارەوە.

١٢/٤/١٩٩٠ ئێمەش لە دەڵەکەوە بەرەو قۆپی ڕۆشتین و شەوەکەی گەیشتینە هەرەسەکەی وێلەکە، وەختبوو گورگ بمانخوات، د.هاوڕێ کۆڵێ کتێبی مارکسی هەڵگرتبوو پەکی کەوتبوو، لەگەڵیدا مابوومەوە، پێم ووت: دکتۆر مارکسیەت لە هەموو دنیادا ڕووخا تۆ تازە ئەم بارە کتێبەت بۆ چیە ...؟ بەیانیەکەی کتێبەکانم لێوەرگرت و لە هەرەسەکەدا قایمم کرد.

١٣/٤/١٩٩٠ هەر لەوێ ماینەوە. دوو کەسمان بە ناوی مام ڕەحیم و مام عەزیز گرت بۆ ڕاوە کەو هاتبوون، سەر لە ئێوارەکەی ئازادمان کردن و هەندێ نان و خواردنمان لەسەر کانیەکە بۆ بەجێ هێشتین.

١٤/٤/١٩٩٠بەرەو پووشێن ڕۆشتین بە جادەی سلێمانی عەربەتدا پەڕینەوە، لە چوارتاقەوە سەرکەوتین بۆ دێیە ڕووخاوەکەی پووشێن، لەوێ بڕیار وابوو کاك دلاوەری حاجی عوسمان پێنجوێنی بێتە پیریمانەوە هەموو لەشمان تەڕ بوو بوو، ئاگرمان کردەوە تادەمەو بەیان ئینجا بەشاخەکەی ڕۆژئاوای دێیەکەدا سەرکەووتین لە ناکاو تووشی مەفرەزەیەك چەکدار بووین ئاگریان کردبووەوە، کە ئێمەیان بینی شڵەژان.. کە سەیرمان کرد کاك دلاوە و برادەرانیەتی ، یەکمان گرت و ووتی:

با هەر بە ڕۆژ بڕۆین. لە نزیکی عازەبان تووشی کابرەیەکی جل ڕەش بووین ڕاوە کەوی ئەکرد، کە ئێمەی بینی ڕایکرد، هەرچی بانگمان کرد هەر نەوەستا. نیوەڕۆ لە شیوەکەی پشتی نودێ لاماندا و پشوویەکماندا، ئینجا بە ناو دێی نودێدا بەرەو کەتوو کەوتینە ڕێ، لە ڕێگادا تەقەم لە کەروێشکێك کرد بۆم نەپێکرا ولەدەستمان

دەرچوو. لە کانی توووەوە دابەزین و دامان لە تەنکە بووار و شەو لە سەربازگەکەی بەری مامە خەلان تاکو کاتژمێر ٣ی شەو خەوتین. دنیاش زۆر سارد بوو.
١٩٩٠/٤/١٥ لە ڕۆژئاوای دێی مامە خەلانەوە چووینە ئەودیوەوە بۆ سەر ئاوی بەوزان کە ڕێگاکەی هەمووی مین بوو، کاك دلاوەر لە پێشمانەوە مینەکەی هەڵئەگرتەوە و ئێمەش بە دوایدا ئەڕۆشتین، لە شوێنێکدا ئەو مینی هەڵئەگرتەوە و منیش تەماشای دەستیم ئەکرد وەختێکم زانی قاڵمارایەکی بەجێ هێشتووە و وەختەپێم لێی بدات. بانگم کرد ئەمە مینێکەو ڕەتی کردووە، یەکسەر هەڵگەڕایەوە و مینەکەی بەرپێمی هەڵگرتەوە و ڕۆشتینە سەر ئاوەکە. کاتژمێر ٦ ی ئێوارە لە ئاوەکە پەڕینەوە و بەرەو سیرین ڕۆشتین ، دونیا زۆر تاریك بوو، گیایەکی زۆر هاتبوو، مەیدانی مینی سوپای عێراق بوو، بەهۆی ئەو گیایەوە ڕێگەکەمان وێڵ کردبوو و کەوتینە ناو مەیدانی مینیشەوە، نەمان ئەوێرا لایت دابگرسێنین . کاك دلاوەر لە پێشمانەوە بوو بە بێ لایت و بەو تاریکییە هەر بە دەست کووتان مینی هەڵئەگرتەوە و ڕێگاکەی پاك ئەکردەوە و ئێمەیش بە دوایدا تاکو لە شووێنەکە ڕزگاری کردین. لەڕۆژئاوای دێی سیرینەوە کە ناودێیەکە سەربازگەیەکی گەورە بوو بەرە وچیای سوورکێو سەرکەوتین کە هێڵی بەرگری عێراق بووبەرامبەر بە ئێران. ئینجا بە ڕووی ئێرانیشدا هەمووی مینی تاکە کەسی (ئەشخاس) بوو ئەبووایە بەسەر بەردا بڕۆشتینایە تاکو دێی بلەکێ. کاتژمێری ٤:٣٠ ی بەرە بەیان گەیشتینە بارەگای ڕێکخراو. دوای خۆر و بان گەرمبوون لێپرسراوێکی سوپای پاسداران هات ووتی: لە کوێوە هاتوون..؟ ئێمەش گەشتەکەی خۆمان بۆ گێڕایەوە..ووتی:
جگەلەمەیدانی مین ئەمشەوکەمینیشمان هەبووە وباش دەربازبوون.
بەم جۆرە ١٠ مانگ لەو هەردە و هەڵەتەی گەرمیاندا لەگەڵ کۆمەڵە پێشمەرگەیەکی دڵسۆز و ئەمەکدار بۆ کوردایەتی لە هەلومەرجی سروشتی و جیاجیادا ماینەوە، کە جگە لەوەی ئەرکێکی نیشتیمانی پیرۆزمان لە ئەستۆ گرتبوو، وەکو پێشمەرگە ئەزمونێکی باشیش بوو بۆ ژیانی خۆمان و ئەوانەی دوای ئێمەش بۆ کاری پارتیزانی دائەبەزن. هەروەها ڕۆڵی ئەو کەڵە مێردانەی ڕێکخستنەکانی ناوشارمان لە یاد نەچێ کە هەمیشە مژۆڵی ئێمەیان ئەخوارد و پێداویستیەکانیان بۆ دابین

ئەکردین لەگەڵ هەندێ خەڵکی تری دڵسۆزی پێشمەرگە کە سەربەخۆ پەیوەندیان پێوەکردبووین و یارمەتیان ئەداین.

١٩٩٠/٤/١٦لە بلەکێ بووین نوسینێکی کاك عەلی بچکۆلم بینی کە ڕەخنە بوو بۆ سەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بە خراپی ناوی هێنابوون. ئەو نووسینە زۆر نیگەرانی کردم ، چونکە مەوزوعیانە بۆ بابەتەکە نەچوو بوو، زۆر لە هەڵچوونێکی دەروونیەوە هەڵقوڵا بوو کەچی ئێمەی پارتیزانەکان و سەدان پێشمەرگەی تر لە هەلومەرجە دژوارەکاندا دوور لە هەموو خۆشیەکانی ژیان هەڵمان کردبوو، گیانی زۆر کەسیشمان لە پێناوی رزگاری گەلەکەماندا بەختکردبوو بێ ئەوەی چاوەڕێی پاداشت بین. ئەگەر هەڵەیەکیش کرابێ یان ئەنجامدرابێ ئەوە مانای خراپی هەموو شۆڕش و هەموو پێشمەرگە نیە. بۆیە یەکسەر نامەیەکم بۆ نووسی: پێم ووت پێم وابوو کە ئێمە بگەینە بلەکێ جەنابت دێیت بە پیرمانەوە و دەست خۆشیمان لێ ئەکەیت، کە ئەوە یەکساڵە دوورین لە هەموو خۆشیەکانی ژیان و ماڵ و منداڵ.. کەچی لە نووسینەکەتدا هێزی پێشمەرگە بە دز و ڕێگر و تەعداکەر ناو ئەبەیت.. ئەو وەڵامێکی خراپی دامەوە، منیش جارێکی تر نامەیەکی ترم بۆ نووسیەوە و ئەم جارەیان وەڵامەکەی باش بوو، وا دیارە بێ ئاگا بووە لەوەی ئێمە بۆ ماوەی ساڵێکە لە خوارەوە بووین، هەڤاڵانی ترمان لە خوارەوە بوون، هی وامان هەبوو هەر سەر نەکەوتە سەرەوە و شەهیدیش بوون، کاك عەلی خۆیشی لە ناوچەی چەمی ڕێزاندا رۆژگارێکی سەختی لە ئەنفالەکاندا بەسەر بردووە لەگەڵ کۆمەڵە تێکۆشەرێکی ماندوو نە ناسدا. ئەو نووسینەی کاك عەلی بچکۆل بووە مایەی ئەوەی لە ناو کۆمەڵەدا گرفتی بۆ درووست بێت و دواتر بەرەو هەندەران بڕوات.

١٩٩٠/٤/١٧لە بلەکێ بووین مامۆستا چەتۆ حەوێزی بە نوێنەرایەتی کاك نەوشیروان هاتە لامان بۆ بەخێر هاتنەوەمان و هەندێ دیاریشی بۆ هێنا بووین. دوای ٣ رۆژ حەسانەوە بەڕێی سەرشیوی سەقزدا بەرە وەمەریوان وکانی دینارکەوتینە ڕێ.

١٩٩٠/٤/١٩برادەرەکانمان لە کانی دینارەوە هاتنە پیریمانەوە، لە ماڵەوە پ.م جەلالی جەبار کە دایکی ئامۆزامە منداڵێکی جوانکیلەی خستە باوەشمەوە، لێم پرسی ئەمە کێیە ووتی : ئەوە شنەیە، شنە کچەکەی خۆم بوو کە بەجێم هێشتبوو

مندالْ بوو، کە گەڕامەوە هەم گەورە و هەم زۆر جوانتریش بوو بوو. چەند ڕۆژێکم لە ماڵی خۆمان و ماڵە برادرەکاندا بەسەر برد. دوو ئوتۆمبێلی مەکتەبی سیاسی هاتنە دوامانداا ڕۆژی ٢٩/٤/١٩٩٠ چووینە مەکتەبی سیاسی و لە قاسمەڕەش لەلایەن کاك نەوشیروانەوە پێشوازیەکی گەرم کراین. تاوتوێیەکی ئەو هەلومەرجەی پارتیزانی کراو هەندێ قسە و گفتوگۆ لەسەر خەبات و ئاییندەی کورد و دواڕۆژی ڕژێمی عێراق کرا. دوای دوو ڕۆژ لە قاسمە ڕەشەوە بەرە و مەریوان گەڕاینەوە، لە سنە لە لایەن دژبانی شاری سنەوە بۆ ماوەی هەشت کاتژمێر گیراین و شەوەکەی ئازادیان کردین. چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە بووین.



## وێنەیەکی سەردەمی پارتیزانی

**ساڵی ١٩٨٩ گەرمیان**

لە ڕاستەوە (شەهید حەمە ئاخە، شەهید سەید محەمەد،بەندە (مەحمود سەنگاوی) (شەهیدحەمەڕەش) ساتەوەختەکانی پارتیزانی لەئەشکەوتێکدا کۆی کردبووینەوە. ئەو سێ پارتیزانە لە سێ قۆناغی جیاوازدا گیانیان بە کورد وکوردستان بە خشی :

*شەهید سەید محەمەد / لە ساڵی ١٩٩٠ بە پلانێك شەهیدبوو.

*شەهید حەمە ڕەش/ لە ڕزگارکردنی شاری دووزدا ساڵی ١٩٩١ شەهیدبوو.

*شەهید حەمە ئاخە/ لە شەڕەکانی بانی مەقان ساڵی ١٩٩١ شەهیدبوو.

هەزار دوورد بۆ یادی پیرۆزتان هاوڕێیانی هەمیشە لە یاد نەچووم.

## تەشکیلات / مانگی 6 ـ 1990

دیار بوو لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەلومەرجەی خەباتی نوێی گەلەکەماندا ئەبووایە هەندێك هەنگاوی کاری پێشمەرگانە و ڕێکخراوەی بنرێت کە لە ئاستی پێداویستی قۆناغەکەدا بێت و تەشکیلاتێك بکرێت واقیعانە بێت و ئامادەکاری بۆ بکرێ. بۆ ئەم مەبەستە کاك نەوشیروان لەگەڵ هێزەکانی سنووری مەڵبەندی یەکدا کۆبووەوە، هێزەکان کرا بە سێ بەشەوە:

١.هێزی تایبەت یان فیدای گەرمیان کە پارتیزانەکانی ئەگرتەوە.

٢.هێزی بەتالیۆنەکان،بۆسنوورەکان دانرابوون وجێگرەوەی پارتیزانەکان بوون.

٣.هێزی یەدەك:لەماڵەکانی خۆیاندا ئەبن و یارمەتی ئەدرێن بۆکاتی پێویست. ئێمە بووین بە بەتالیۆنی یەك،بارەگاکەمان لەمیری سوور بوو، تەشکیلاتەکان تەواو بوو.

ڕۆژی ١٩٩٠/٦/٢٠ هەندێك پاسدار لە پاسگای مەرکەزی مەریوانەوە هاتنە سەرمان لە دێی کاڵ، داواین کرد بەبەلە چۆڵی بکەین یان دەستووری تۆپبارانمان ئەدەن، منیش پێم ووتن: ئێمە بە بڕیار هاتووینەتە ئێرە و چۆڵیشی ناکەین هەر کارێك بکەن خۆتان بەرپرسیارن. ئەمانە بیانوویان پێئەگرتین بۆ هەندێ کاری سۆسەکردن بۆ دیوی عێراق و زانیاری کۆکردنەوە لەسەر ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی، کە ئێمە بەو کارانە قایل نە ئەبووین. جۆری مامەڵە کردنیان توونت بوو، بەڵام ئێمە سارد بووین، ئیتر کە زانیان هیچمان لێ هەڵناکرێنن، وازیان لێهێنایین.

لەو کاتانەدا لە ناو کانی دیناردا هەندێ زەلامی سەرسەری شەڕیان پێ ئەفرۆشتین، یەکێك لەوانە کەریم قەیاس بوو،کەسێکی تلیاکی وهیچ و پووچ بوو، ڕقی لە کوردی عێراقی بوو، بە فیتنەی هەندێ لە دەزگا ئەمنیەکان کێشەیان بەرپا ئەکرد، بەرامبەر

بە ئەمە ئێمەش ناچار لێیان هاتینە دەست و تەمبێیەکی باش کران،ئەمە بوو بە پەندێکی باش کەس نەوێرێ ڕووبەڕووی خەڵکی ئێمە ببنەوە و لێشمان بترسن.

لەم ماوەیدا گەدەم زۆر ئازاری ئەدام، بە باشم زانی سەردانی تاران بکەم بۆ چارەسەرکردن. ئەو ماوەیەی کە لە خوارەوە بووین بە هۆی نەبوونی خواردنی باش و چۆڵەوانی و ئاو و هەوای ناوچەکەوە کاریگەرێتی لەسەر تەندروستیمان دانا. چوومە تاران و نازوورێکم کرد و گەڕامەوە کانی دینار.

ڕۆژی ١٥/٧/١٩٩٠ لە بارەگای بەتالیۆن کۆبوونەوەمان کرد و ئەرکەکانمان دابەشکرد و تەشکیلاتمان ئەنجام دا بەم جۆرە:

١/ تەشکیلەی بەتالیۆنی ١:

*هەیئەتی بەتالیۆن٣ کەس(ل.بەتالیۆن،جێگری ل.بەتالیۆن،ڕابەرسیاسی بەتالیۆن)

*ل.بارەگای بەتالیۆن

*ئیدارە (٥کەس) : ل.ئیدارە ، نانەوا ٢ کەس، ئاشپەز ٢ کەس

*ئیسناد : ٢ کەس *زانیاری : ٣ کەس

*جیهاز : ٢ کەس *پزیشکی : ٢ کەس

*دارای : ١ کەس *کیمیای : ١ کەس

*هەندەسە: ٢ کەس *سایەق : 1 کەس

٢/ تەشکیلەی تیپەکانی بەتالیۆنی ١:

*فەرماندەی تیپ : ١ کەس

*جێگری فەرماندەی تیپ :١ کەس

* هەر تیپێك لە ٣ کەرت پێك هاتبوو (هەر کەرتێك ٢ مەفرەزە)

٣/ تەشکیلاتی مەفرەزەکان :

*هەر مەفرەزەیەك بریتی بوو لە ٧ پێشمەرگە

( فەرماندەی مەفرەزە + جێگری فەرماندەی مەفرەزە+ ٥ پێشمەرگە)

فەرماندەی بەتالیۆن: مەحمود سەنگاوی

جێگری فەرماندەی بەتالیۆین : م.علی عبدولا

رابەر سیاسی بەتالیۆن : سەلاحی کوێخا

لێپرسراوی بارەگای بەتالیۆن: مەنسووری ئەنوەر بەگ

لێپرسراوی دارای : مامۆستا جوامێر

لێپرسراوی جیهاز: سەید نووری گەرمکی + شەهید حەمە چاوشین

ئیسناد : برایم مەدحەت جومعە + یوسف عەزیز عەلی (دڵشاد)

زانیاری:بەرزان محەمەد+حەمەیوسف نەجمەدین ڕەشیدوحسێن حسن مەحمود

کیمیایی: ڕۆستەم مەحمود نادر

هەندەسە : حەقی محەمەد ئەحمەد + مەجید محەمەد مەحموود

پزیشك : قاسم محەمەد وەهاب + فارس محەمەد عەبدوولا

سایەق : حسێن یوسف ئەحمەد

لێپرسراوی ئیدارە : خالّد ئەحمەد حەمە ئەمین

ئاشپەز: سەعید سالّەح کەریم + شکور حەمە مەحمود

نانەوە : جەلال جەبار عەباس + حەسەن شەریف فەرهاد

** تەشکیلەی تیپەکانی بەتالیۆن بەم شێوەیە بوو :

تیپی ١١: ف.ت.١/ حەمەی حەمە سەعید

ف.ت.٢/ ئەکبەری سان ئەحمەد

کەرتەکانی تیپ :

کەرتی ١ : ف.ك.١/عەبدولکەریم عەبدولڕەحمان

ف.ك.٢/ مەهدی حەمە سەعید

**کەرتی ٢: ف.ك.١/ ئەبەرز حسێن**

**ف.ك.٢/ خەلیل مەحمود کەریم**

**کەرتی ٣ : ف.ك.١/ کەیکاوس حەمە ڕەشید**

**ف.ك.٢/ ڕەفعەت جەعفەر**

**ئەم فەرماندەی کارتانەش هەبوون :**

**ئەکرەم ئەحوەل،ئەنوەر حاجی عوسمان، خالید مۆریاسی**

**تیپی ١٢: ف.ت.١/ مەحمود مامە عەزە**

**ف.ت.٢/ سەلام ڕەسول**

**کەرتەکانی تیپ : کەرتی ١: ف.ك.١/ سدیق عەلی تۆفیق**

**ف.ك.٢/ عادل پیرەمۆنی**

**کەرتی ٢: ف.ك١/ئەحمەد چاوشین**

**ف.ك.٢/مەحمود مامەلی**

**کەرتی ٣: ف.ك.١/حەمە دووزی ، ف.ك.٢/ عەلی وریێلە**

**ئەم فەرماندەی کەرتانەش هەبوون :**

**حسینی حامی، مام وریا برایم، جەلال شۆڕاوەی**

**تیپی ١٤: ف.ت.١/سەلام کوێخا عەزیز**

**ف.ت.٢/ ئەحمەد جەبیران**

**کەرتەکانی تیپ:**

**کەرتی١: ف.ك.١/ سدیق سۆدی مەجید**

**ف.ك.٢/ئەوزاد چاوشین ، کەرتی ٢: ف.ك.١/حاجی فایق**

**ف.ك.٢/حەمە پاریاوڵە ، کەرتی ٣: ف.ك.١/ هاپۆ سمایل**

**ف.ك.٢/ سەعیدی لالە سەن**

لە سنووری بەتالیۆنەکەماندا:

*کۆمەڵێك خەڵك یارمەتیان وەرئەگرت و ئیجازە درابوون، هەریەکەیان بە هۆیەکەوە.

*کۆمەڵێك خەڵك یەدەك بوون و یارمەتی براوەیان بۆ دیاری کرا بوو.

*کۆمەڵێك لێپرسراو و فەرماندە ئیجازە درابوون و یارمەتی ئەدران.

*کۆمەڵێك پێشمەرگەی کەم ئەندام کە لە ژێر چاودێری خۆماندا یارمەتی ئەدران.

*کۆمەڵێك خەڵکی ڕیش سپی یارمەتی ئەدران.دوای ئەو تەشکیلانە

لەگەڵ م.عەلیدا سەردانێکی ئۆردوگاکانی سەریاس و کەچەڵاوا و تازاوا و باوەجانیمان کرد و لەگەڵ پێشمەرگەکانمان و هەڤاڵانی ڕێکخستندا دانیشتین و لە سەر هەلو مەرجی کاری پێشمەرگانە و گەشەپێدانی ڕێکخستن و خۆسازدان بۆ هەر ئەگەرێکی نویێ لە گۆڕەپانی خەباتدا قسەمان بۆ ئەکردن، بە ڕاستی هەموو برادەرەکانمان لە ئاستی پێویستدا بوون و ئامەدەییان بۆ هەر ئەرك و فەرمانێك هەبوو پێیان بسپێردرێ. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە گیانی شۆڕشگێری سەرەڕای هەڵەتفت وتاڵەکان هێشتا بوونێکی هەیەوخەڵکی بیری ڕزگاری نیشتیمانەکەیەتی و ڕۆژگارە سەختەکان هێشتا خەڵکی خۆی هەیە تیا هەڵبسووڕێ و

کەس دەستبەرداری گەل و نیشتیمان نابێ.

لەو ڕۆژانەدا کۆمەڵە ماڵە فەیلی یەکی عێراق دەرکردابوون و بە ڕووت و قووتی، هیچیان پێ نەبوو، هەندێکیان ئەگەڕان بۆ سواڵکردنی نان و خواردن، ئەمەیە دادپەروەری ڕژێمی فاشیستی کە خەڵکی وڵاتەکەی خۆی بە سونگەی جیاجیا دەرئەکات بۆ دەست بەسەردا گرتنی سەروەت و سامانیان،کەئەم فەیلییانە نیشتەجێی بەغداد بوون و سەرەڕای ئەوەیش بە هۆی ئەوەی ساڵانێکی زۆرە و هەر لە کۆنەوە نیشتەجیی بەغداد بوون ببوونە خاوەن دەسەڵاتێکی ئابووری و هێزی بازاڕ، لەم هەلومەرجی شەڕ و شۆڕە سەپێندراوەدا سەدام لە چەند لایەکەوە گوڵی

خۆی ئەکرد: لەگەڵ دەرودراوسێدا بەو ناوەی کە پارێزەری دەروازەی ڕۆژهەڵاتی نیشتیمانی عەرەبە، لەگەڵ ناوەوەش دەرکردنی فەیلیەکان بە چەند هۆیەکەوە : یەکەمیان کوردن، دووەمیان تەبەعیەی ئێرانین، سێیەمیان چاپاو کردنی پارە وسامانیان. ئەمەش بەڵگەی داڕووخانی ناوەڕۆکی کۆنپەرستانەی ڕژێمێکی دژی مرۆڤایەتییە کە بەئاگرُ وئاسن تەحکوم لە ژیانی خەڵکیدا ئەکات،درەنگ بێ و زوو خەڵك تۆڵەی خۆیانی لێ ئەکەنەوە،مەگەرئەم ڕۆژگارە هەمووڕژێمە دیکتاتۆرەکانی جیهان هەرس ناهێنی.؟دوای تەواوکردنی گەشتەکەمان،گەڕاینەوەپاوە وسەردانێکی دێی شمشێرمان کرد و چووینە خانەگاو لەوێوە چووینە ئۆردووگای وەرمەهەنگ وپاشان گەڕاینەوە کانی دینار.

ڕۆژی ٢٧/٧/١٩٩٠ گەڕامەوە بارەگای بەتالیۆن، بارودۆخی عێراق لەتەقینوەدا بوو، بە پێی هەواڵەکان چ لەناوخۆو چ لە ئاستی دنیادا وایان نیشان ئەدا کە ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو لە ناوچەکەدا ڕووئەدات، جموجۆڵەکانی عێراق لە ڕووی سیاسی و سەربازیەوە بەڵگەیەك بوون هەندێ لایەنی ئەوەی دەرئەخست.

## شەڕی کەنداو و داگیرکردنی کوێت

هەموو خەڵکی دنیا لە جەژنی سەری ساڵدا خەونی ڕاستەقینە دەبینن، ئێمە خەونیشمان لێ حەرامە، نەتەوەیەك لەسەر زەویدا جێگای نەبێتەوە، دەسەڵاتەکان لێیبدەن،قڕی تێبخەن، چۆن بۆی هەیە خەونی خۆش ببینێ، بۆنی بوونی خۆی بکات. ئێمە ئەگەر خەونیش ببینین ئەوە بە هەشتێکی پڕ لە دووپشك و مار و جاندرمە و سوپا و ڕەبایە و هێزی سەربازی و کیمیایی و کپتەر و تانك و ئاوارەی دەبینین.. ژیان دۆزەخە، بەڵام مرۆڤی شۆڕشگێڕ لە ناو بۆسەی ئەم هەموو ئازارەدا خۆی ئەبینێتەوە و ڕێگا نادا ناخۆشیەکان بە تەنیا بیخۆنەوە، لە ناو ئەو هەموو ناسۆرییەدا ئاسۆیەکی ڕووناك قوتیلەکەی لە ناخیا دائەگیرسێنێ و ئومێدێکی

گەش سەرەپای هەست و هەڵوێستی ئەگرێتەوە، ساڵی ۱۹۹۰ بۆ هەندێ گەلانی دنیا ساڵی یەکگرتنەوە بوو بە تایبەتی هەردوو ئەڵمانیا، ئەگەرچی بۆ ئێمەش هەندێ لاپەڕەمان هەڵدایەوە ، بەڵام هێشتا کەم بوو ، ئەبێ ساڵی تازە چی تێدا بێت، بە تایبەتی هەلومەرجی ناوچەکە پڕ لە گرێو گۆڵ و ئاڵۆزی و مەترسی شەڕ و هەرا و بگرە و بەردە بوو، خەونی ئێمەش تەنیا ئەوە بوو خێر و بێرێکی بۆ کورد تێدا بێت.بەو ئاواتانەوە ڕۆژانە چاوەڕوانی ئەوە بووین وەرچەرخانێك ڕووبدات، کەس ناتوانێ خەونەکانمان لێبستێنێ، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە دنیا ئاوسە بە دەیاها ڕووداوی وا کە خەونەکانمانی خۆشتر ئەکرد، هەتا ئەهات دۆخەکە گرژی زیاتری بەخۆوە ئەدی،جموجۆڵێکی سیاسی ودیبلۆماسی فراوان دەستی پێکردبوو بۆ ئەوەی خراپتر نەقەومێ و عێراق لە هەنگاوە سەرشێتەکانی پاشگەز بێتەوە. بۆیە جیمس بیکەر و تاریق عەزیز ڕۆژی ۱۹۹۱/۱/۹ بەرەسمی کۆبوونەوە، دوای گفتوگۆیەکی تێر و تەسەل هەرچیان کرد نەگەیشتنە سەرئەنجامێکی ئەوتۆ ناوچەکە لە سووتانی شەڕێکی مسۆگەر ڕزگار بکەن و شکستیان هێنا، بەپەلە دیکۆیلاری سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان باڵی گرتەوە و بەپەلە گەیشتە عێراق، بەڵام هیچ بەرنامەیەکی داڕێژراوی پێ نەبوو، تەنها هەر ئەوەندەی پێ بوو کار لە عێراق بکات لە کوێت بە سەلامەتی بکشێتەوە، عێراق بە قسەی ئەو ڕیستپییەیان نەکرد، کەتبوونە هەڵەیەکی سیاسی واوە وایان ئەزانی دنیا لێیان ئەترسێ، نەیان ئەزانی خۆیان ئەکەونە تەڵەیەکەوە چارەنووسی ئایەندەیان تەماوی ئەبێ ولەبەرامبەر ئیرادەی نێودەوڵەتیدا خۆیان پێڕاناگیرێ و هیچیان پێناکرێ،ئەوان لەقسە و ڕاگەیاندنیشێتانەی خۆیان نەئەکەوتن.

ڕۆژی ١٩٩١/١/١٢ لەتیف نسەیف جاسم وەزیری ڕاگەیاندنی ڕژێمی عێراق ڕایگەیاند کوێت پارێزگای ژمارە ١٩ یە. هەروەها ڕۆژی ١٩٩١/١/١٤ ئەنجوومەنی بە ناو نیشتیمانی عێراق سەدامی سەرپشك کرد بۆ شەڕکردن لەسەر کوێت.

ئەمە سەدامی هەڵنا بۆئەوەی لە ١٩٩١/١/١٥ سەردانێکی کوێت بکات و لەودۆخە تەماویەدا وورەیەك بە هێزەکانی ببەخشێ و خۆشی وانیشان بدات کە پاڵەوانێکی سەرکەوتووی شەرە و گوێ ناداتە ئەو چاوڕاوەی لە دژی ئەکرێ، هەر ئەم ڕۆژەش دوا مۆڵەتی ئەنجومەنی ئاسایش بوو بۆ دەرچوونی هێزەکانی عێراق لە کوێت.

ئێمە زۆر بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هەلومەرجەکە بووین، بەرچاو ڕوونیش بووین کە ڕژێمی سەدام لە ڕۆخ کارەساتێکی گورچك بڕدایە، چوونکە لێی قبووڵ ناکرێ وا بە ئاسانی سەروەری وولاتێکی سەربەخۆی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشل بکات، بە تایبەتی کە کوێت خاوەنی سامانێکی زۆری نەوتە و دەورێکی گرنگ ئەگێرێ ، بە نیسبەت دەوڵەتە پیشە سازییە زلهێزەکانەوە، ڕژێمی عێراق وایزانی بەقسەی خۆی (فەرع) بۆ (ئەسڵ) دەگێڕێتەوە ، یان هەر هیچ نەبێت دەوڵەتۆکەیەکی بچووکی عەرەبی ئەخاتەوە سەر نەخشەکەی خۆی و بەمەش ئەتوانێ بەشێکی زیانەکانی جەنگی خۆی قەرەبوو بکاتەوە و کەسیش دەنگ نەکات، کەچی بۆ ڕیش چوو سمێڵیشی خستە سەری، نەك هەر خەونەکەی نەهاتە دی،بەڵکو شەریعیەتی دایەئەمریکا وهاوپەیمانەکانی بە هێزی سەربازیان ڕاستەوخۆ بێنە ناوچەکە و جێگیر بن و دوای ئەوەی ئەمە خەون بوو بە لایانەوە و لە دوای نەمانی شەڕی سارد و ڕووخانی کەمپی کۆمۆنیستی لەوەها بیانوویەك ئەگەڕان بەم کارە هەڵستن تا خواوڕاستان عێراق ئەمەی بۆ ئاسان کردن.

لە نزیکبوونەوەی ڕۆژە ڕەشەکانی عێراق، ئێمەش باشتر خۆمان ئامادە دەکر، بۆ هەرئەگەرێکی چاوەڕوان کراوی نوێ. سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

هەندێك پرۆژەی دارشتبوو بۆ کار کردن لە کاتێکدا ئەمریکا و هاوپەیمانان لە عێراق بدەن و ئێمەش دەست بەکار بین: . ڕزگارکردنی شار و شارۆچکەکان.

. دەستبەسەرداگرتنی دام و دەزگاکانی بەعس و پاراستنی بەڵگەنامەکان.

. وەلانانی ڕق و دوژمنابەتی کە بەهۆی مەسەلە کۆمەلایەتی یان سیاسیەکانەوە دروست بوو بوو بە تایبەت لەگەڵ چەکدارەکانی ڕژێمدا.

١٩٩١/١/١٣ کۆبوونەوەی ئەتالیۆنمان کرد و بە پێی بەرنامەیەکی سەربازی ڕێك و پێك ناوچەکانمان دابەشکرد تاکو لەگەڵ هەر ئەگەرێکی پەلاماری عێراقدا ئێمەش دەستبەکار بین و دەوری خۆمان بگێڕین و سنوورەکان کۆنترۆڵ بکەین. چوونکە ئەمانزانی ڕژێمی عێراق بەرگەی ئەو پەلامارە ناگرێ، سوپاکەی زۆر ماندووە و شەڕی پێناکرێ، ئەو سوپایەی بە دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق هەمیشە لە شەڕدا بووە بە تایبەتی شەڕی کوردستان ڕژێم وە هەروەها هەمیشە لە کودەتا کردندا بووە، کەمجار بۆی هەڵکەوتووە ماوەی پشوودان بە خۆیەوە ببینێ، بۆیە ئەو شەڕی ٨ ساڵەی ئێران و پەلاماردان و داگیرکردنی کوێت زیاتر کەشەنگی کردبوو، هێزێکیش لە ژێر تەپ و تۆزی شەڕدا هیلاك بوو بێ مەحاڵە بتوانێ بەرگە بگرێ.هەموو ڕۆژێك کە بەسەر عێراقدا تێدەپەڕی لە هەناویدا شتێکی ترسناکی هەڵگرتبوو، ئەگەری لێدانی لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانەوە زۆر نزیك بوو، بە تایبەتی عێراق بە تاقی تەنیا کەوتبووە بەرەیەکەوە، دنیاش لەبەرەکەی تردا، تەنانەت ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی تا دوێنێ کۆمەکی سەربازی و ئابووری عێراقیان ئەکرد لە شەڕی هەشت ساڵەی بەرامبەر بە ئێران هەموویان دژی وەستان و هێزیان کۆکردوە لەگەڵ ئەمریکادا هاودەنگ بوون، عێراق خۆشی ئەترسا کە کەوتبێتە ناو تەڵەیەکەوە دەرباز بوونی نەبێ.

١٩٩١/١/١٧ ڕۆژێکی گرنگە لە مێژووی ناوچەی کەنداو و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە کاتژمێر ١ ی شەو بە سەرکردایەتی ئەمریکا و ٣٠ دەوڵەتی جیهان بەهێزی سەربازی و ئاسمانی هێرشی بەربڵاو و کتوپڕیان کردە سەر سوپای داگیرکەری عێراق لەناوکوێتدا،هێرشەکە ئەوەندە توندو تیژ وسەخت بوو بوواری بە هێزەکانی عێراق نەدا چاوبکەنەوە، سەدام ئەوەندە مێشکی دنیای سوتاند وگاڵتەی بە هەموو لایەك کرد تا بە گورزێکی کوشندە وەڵامیان دایەوە، نەیانهێشت بیرلەهیچ بکەنەوە تەنانەت نەیانتوانی بەرگریش بکەن.ئەودرەنگانەی شەو کەهەواڵەکە بڵاوبووەوە بۆ ئێمەزۆرخۆش بوو.هەموو پێشمەرگەکانمان ئاگادارکردەوە،بە تەلەفۆن پەیوەندیمان بە زۆر شوێنەوە کرد ، ڕادیۆ زۆر گرنگ بوو بۆ گواستنەوەی دەنگوباسی بەرەکانی شەڕ، هیچ هێزێکی پێشکەوتوو خواز نەبوو لە خۆشیا نەبێت، هەر تەنیا ئەوانەی لە سەنگەری کۆنەپەرستی و دژایەتی مرۆڤایەتیدا بوون دڵتەنگ بوون بۆ ڕژێمی عێراقی، سەیر لەوەدا بوو خەڵکە سونەکەی ئێران زۆر خەمبار بوون کەوا لە عێراق درا، مەلووی پێغەمبەریان ئەکرد کە وا سەدام نەشکێ، چوونکە بەلایانەوە وایان ئەزانی تەنیا سەرکردەیەکی ئیسلام کە بەرگری لە سوونە بکات هەر سەدامە، وایان ئەزانی کە ئەوشەڕی هەشت ساڵەیە شەڕی سوونەوشیعە بووە.نەك هەر ئەمە بەڵکو پێشتریش بەرەخنەوە دەیان گووت بۆچی شەڕ لەگەڵ سەدام دەکەن ؟ لەچیتان کەم بوو..؟

ئێمە خۆمان لەو سەخڵەتیەی ئەوان هەڵنەئەقورتاند، بەڵام ئەوان زیاتر سەخڵەت ئەبوون و ئەمەش گەیشتە کاربەدەستانی شاری پاوە و پەیوەندیان پێوەکردن کە هەندێك دۆخەکە ڕابگرین و کارێك نەکەین کێشە و ڕووداو بەرپا ببێت. لێدانەکە ئەمەندە گرنگ بوو پێشمەرگەکان شیرینیان بەسەر خۆیاندا ئەبەخشیەوە، ئەوەی ڕادیۆی پێبوو کەلەکەیان ئەکرد بۆ بیستنی دوا هەواڵەکانی بەرەکانی جەنگ و

تێکشکانەکانی سەدام. ئەمەش کاری لە دەروونی خەڵکی ئەکرد، ئەوەی سەرنج ڕائەکێشێ نەك هەر لە پاوە بەڵکو لەسەر تاسەری کوردستانی ئێراندا ئەم هەڵوێستە هەبوو، بگرە خەڵکیان هەبوو مەولووی کردبوو کە کچێکی نەزری سەدام بێت هیچی لێنەیەت. ئەم هەموو ئازارەی خەڵکی کوردی عێراقن هیچی لە ئازارەکانی سەردام کەم نەکردەوە. سەرەڕای ئەوەی کە ڕژێمی عێراق ڕۆژی ١٩٩١/١/٢٠ بە ڕۆکێتی سکۆد دای لە ئیسرائیل و سعودیە، بەهۆی ڕۆکێتی باتریۆتی بەرگریەوە لە ئاسماندا پووچەڵ ئەکرانەوە بێ ئەوەی ئامانجەکانی خۆیان بپێکن. ئەمە عێراقی زۆر شڵەژاند، ئەو وای دانا بوو بە چەند ڕۆکێتێك ئیسرائیل بسوتێنێ، نیشانەی شکستەکانی عێراق دەرئەکەوت کە ٧ فڕۆکەی جەنگی عێراق گەیشتنە ئێران و لە فڕۆکەخانەکانی دا نیشتنەوە،لەناو ئەم ساتەوەختە خۆشانەدا خورپەی هەواڵێکی دڵتەزێن ناخی گوشین.

ڕۆژی ١٩٩١/٢/٣ هەواڵی شەهید بوونی کادیری خۆشەویستی گەرمیان سەید محەمەد مان پێگەیشت، بە یەکجاری ئازاری دڵی داین، ئەو کەڵە کادیرە کە لە ناو دار و پەردووی وێرانەی ئەنفالدا گیانی ئەکردە بەر پێشمەرگەکان، هەڵپەی کیانەوەی ئەکرد، دژی دوورکەوتنەوە بوو لە خاك، ئەو ئازارەکانی ڕام ئەکرد، نەیئەهێشت کەوشەنی ڕۆح بتەنن و نائومێدی بچنن. سەرەڕای ئەوەی ژن و منداڵە چاوگەشەکانی کەوتبوونە ژێر ساتورە کولەکەی ڕژێمی ئەنفالەوە و نا ئومێد بوو لە گەڕانەوەیان، ڕژێم ئەوەندە داخ لە دڵ بوو گرتنی سەید محەمەدی لە داوێکدا بەهۆی کۆمەڵە کورد فرۆشێکەوە بە لاوە گرنگ بوو زۆر بەپەلە شەهیدیان کرد. سەید محەمەد بۆ خۆی داستانێك بوو هێشتا کەس نەیتوانیوە هۆنراوەکەی بهۆنێتەوە ئەگەر لە بیرنەچێ. وەکو چۆن ژن ومنداڵەکانی چوونەتە خانەی لە بیر چوونەوە لەگەڵ هەزارەها کەسی تری ئەنفالکراودا.



## ساڵی ١٩٩١ گەڕانەوەمان بۆ گەرمیان

### بۆ جاری دووەم به مەبەستی خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین

لەگەڵ برادەران هەریەکە لە( حەمە پارياوڵە، حەمەی مالیە، شەهید حەمە چاوشین، جومعەی مەجید داودە، مام جەبار عەلی قازی، شەریف خەلیفە سدیق، برایم ئەحمەدی ئامۆزام، حەمە ئێرانی و چەند کەسێکی تر)

ڕۆژی ٢/١٩٩١ لە بارەگای بەتالیۆن بووم لە پاوە، کاک دانای ئەحمەد مەجید نوێنەری یەکێتی لە کرماشان تەلەفۆنێکی بۆ کردم، کە چوومە سەر خەت کاک نەوشیروان قسەی کرد، داوای لێ کردم کە یەکسەر بچمە کرماشان، کە گەیشتمە ئەوێ کاک نەوشیروان پێی ووتم: کە خۆم کۆ بکەمەوە و دابەزمە خوارەوە بۆ گەرمیان و هەندێ پێویستیش هەیە بیگەیەنمە برادەران و تێی گەیاندم کە چۆن پەیوەندی بە دەستەکانەوە بکەین و خەڵکی ئامەدەی ڕاپەڕین بکەین، لەو کاتانەدا پێشمەرگەکان ووتیان : کاک نەوشیروان کاک مەسعود بارزانی هات. کاک نەوشیروان

چووە پیریەوە و پێشوازی لێ کردن کە چەند کەسێکی تری لەگەڵ دا بوو یەکێکیان عومەر ئاغای دۆڵەمەڕی بوو. دوای بەخێر هاتن کەوتنە قسە کردنەوە، گفتوگۆ لەسەر لێبووردنەکەی بەرەی کوردستانی کرا، کاک نەوشیروان ووتی: ئێمە ئەبێت وەفامان هەبێت بۆ لێبووردنەکەی خۆمان و ئەبێ ڕێگە نەدەین کەس تاوان بارەکان بکوژێ، ئەگەر ئەوانە عەفوو نەکەین ئەبێ بچن لە خوارووی عێراق بژین و پاش قەرنێکی تر نەوەکانیان ئاوارەی کورد ئەبن، کە ئێستا عەفوویان بکەین ناهێڵین جارێکی تر میللەتەکەمان ئاوەرەی هەبێ، کاک مەسعود هەڵیدایە ووتی: من ڕام وانیە، بە ڕای من ئەم جاشانە هەرچی ماڵیان کۆکردۆتەوە لەسەر خوێنی میللەت و خوێنی شەهید و عارەقەی پێشمەرگە کۆیان کردووەتەوە و ئەبێت هەموو ماڵ و سەروەتەکانیان لێوەربگرینەوە و بیدەینە ئەو پێشمەرگە تێکۆشەرانەی چەند ساڵە عەزیەتیان ئەبێ. دوای قسەکردن و دەمە تەقێ ئەوان هەڵسان و لێیاندا ڕۆیشتن، من ئەمە یەکەم جارم بوو مەسعود بارزانی لە نزیکەوە ببینم، لە قسەکانیدا هەندێ نا واقعیەتم بینی کە داوای سزادانی جاشی ئەکرد، کەچی هەندێ زانیاریمان لایە کە زۆربەی جاشە دڕندەکانی کوردستان لە لایەن پارتیەوە ئاڕاستە ئەکران بۆ دژایەتیکردنی شۆڕشی نوێی کوردستان، وا ئێستا بە پێچەوانەی ڕای یەکێتیەوە داوای سزادانی جاش ئەکات، من وای بۆ ئەچووم گەر یەکێتی داوای سزادانی خۆفرۆشانی بکردایە ئەوان پێیان لەسەر لێبووردن دائەگرت. ئەم جیاوازی بیروڕایە لەسەر دیاردەیەک ئەنجامەکەی بۆ بەرژەوەندی ئایندەی کورد شتێکی خراپە و لە ڕوانگەی بیر تەسکی حیزبایەتیەوە خۆی ئەنواند. ئەبووایە هەردوو بە گیانی پڕ لە پەرۆشیەوە بۆ خزمەتی گەلەکەمان هەنگاویان هەڵبگرتایە و کۆنە قین و ناکۆکییەکان لە قۆناغێکی وا ناسکدا شەن و کەو نەکرێ و لە هەڵوێستەکاندا تۆڵە نەکرێتەوە و هەردوولا وەک یەک خۆشەویستی میللەتیان دەستە بەر بکردایە.ئیتر

من خۆم کۆ کردەوە و ڕۆژی ١٦/٢/١٩٩١ لەگەڵ هەریەکە لە برادەران( حەمە پاریاوڵە، حەمە ی مالیە، شەهید حەمە چاوشین، جومعەی مەجید داودە، مام جەبار عەلی قازی، شەریف خەلیفە سدیق، برایم ئەحمەدی ئامۆزام، حەمە ئێرانی و چەند کەسێکی تر، لە کرماشانەوە بەڕێ کەوتین بۆ تەپەڕەش لەگەڵ پاسدارێکدا بۆ ئەوەی لە ڕێگا نەمانگرن، لە ڕێگە سەرمان لە دێی ڕێژاو دا کە ئەکەوێتە بەردەم چیایەکی بەرز و ئاوی ئەڵوەند لەو چیایەوە دێتە خوارەوە، ڕێژاو هەمووی باخاتە ، ئەوەندە خۆشە ئەڵێی بەهەشتە، لەوێ چووینە ماڵی خزمەکانی کاك حەمە پاریاوڵە. دوای ئەوە ڕۆشتین و گەیشتینە تەپە ڕەش نزیکی سنووری عێراق و شەوەکەی لەوێ ماینەوە، ڕۆژی ١٧/٢/١٩٩١ سەردانێکی سەرپێڵی زەهاومان کرد، لەسەر شۆستەی جادەکەی ناوبازاڕی سەرپێڵدا ڕاوەستا بووین لەو کاتەدا هەندێ ئۆتۆمبێل دایان بەلاماندا زانیم کە ئەوە تاریق عەزیزی وەزیری دەرەوەی عێراق و بەرەو تاران ئەڕۆشت تاکو لەوێوە سەردانی ڕوسیا بکات، چونکە ڕێگای ئاسمانی نەبوو ناچار بە ڕێگەی زەمینی و لە ئێرانەوە بڕوات. دوای ئەوە هەندێ پێداویستی وەکو ڕۆنی کوردی، و شتی ترم بۆ برادەران کڕی و گەڕاینەوە تەپەڕەش، کاتژمێ ٦ی ئێوارە لە نزیك دێی گردەنوو هەندێ گوێدرێژی قەلغانییەکانمان هێنا بۆ گواستنەوەی کەل و پەلەکانمان بۆ لای پارتیزانەکان.

شەوی ٢١/٢/١٩٩١ کەوتینە ڕێ بەرەو ڕۆهەڵاتی دێسووتك و سەرووی حاجی لەر و لە خوارووی گۆمە بەحرییەوە خۆمان کردە ناو زەل و قامیشەکانی خوڕ خوڕدا کە هەموو ناوچەکە پڕبوو لە عەرەبی تەعریب، لە ڕێگادا حەمە چاوشین ئاگاداری کردمەوە کە مام جەبار و مام شەریف پەکیان کەوتوە... منیش تووڕە بووم و ووتم ئەم دوو مام گووە بۆچی پەکیان کەوتووە...؟ چاوەڕێمان کردن تاگەیشن و لەو ناوەدا خۆمان حەشاردا. بۆ ڕۆژەکەی چووینە خوڕخوڕ و ئێوارەکەی چووینە سەر

سیروان و لەو قەراغ چەمەدا کەڵەکمان شاردبووەوە و لە ڕاستی دێی لەوواوان کەڵەکەکانمان دۆزیەوە و بە هیمەتی کاک حەمە پاریاوڵە و حەمە چاوشین و جومعەی مەجید کەڵەکەکانمان ئامەدەکرد کە هەرچەندە باران بوو، بارەکان و پاشان وڵاخەکانمان پەڕاندەوە و بەرەو پاریاوڵە ڕۆشتین، شەو لەبەر باران و تاریکی وماندوویەتی لەناوقامیشەکانی سەرووی پاریاوڵەدا ماینەوە، ڕۆژەکەی چووینە ئەشکەوتێك و ئاگرمان کردەوە و خۆمان گەرم کردەوە.

ڕۆژی٢٧/٢/١٩٩١عێرق ڕایگەیاند کەهەموو هێزەکانی لەکوێت کشاندووەتەوە. لێدانەکان ئەمەندە توونـد بوو خۆبەدەستەوەدان و تێکشکانەکانیش ئەوەندە سەختبوون ناچار سەدام بریاری پاشەکشەی لە کوێت دا، بەڵام ئەمریکا هەر بەو بڕیارە ڕازی نەبوو، بەڵکو جێبەجێکردنی ١٢ خاڵەکەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە مەڕ کشانەوە لە کوێتی سەپاند بۆ پابەند بوونی سەدام پێوەی، وە هەروەها ئەمریکا بڵاوی کردەوە کە ٧١ فیرقەی سوپای عێراق تیاچووە و پەنجا تانك بە ساغی گیراوە و فڕۆکەخانەی ناسریە گیراوە و ڕێگەی کشانەوەی عێراق لە پشتەوە گیراوە.

ڕۆژی ٢٨/٢/١٩٩١ کاتژمێر ٨ی سەر لە بەیانی شەڕ وەستا بەومەرجەی عێراق لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا هەرچی لاشەی کوژراو هەیە بیداتەوە بە ئەمریکا، دیلەکان ئازاد بکات، هەرچی مەیدانی مین لە ووشکانیدا هەیە نیشانی هێزەکانی ئەمریکا بدات، هەروەها نیشاندانی هەموو مینی ناو دەریاش، بە هیچ شێوەیەك تەقە لە سووپای ئەمریکا نەکرێت. هەرچی زیانەکانی کوێت هەیە بیبژێرێت، مووشەك بەرەو هیچ ووڵاتێکی ناوچەکە نەهاوێژێت. هەر ئەمڕۆش ژمارەی دیلەکانی عێراق گەیشتە ١٧٥ هەزار سەرباز. ژمارەی کوژراویش ١٠٠ هەزار کە ئەکاتە لە ناوچوونی زیاتر لە ٤٢ لەشکری سوپای عێراق.

ئێمە لەگەڵ ئەو هەموو هەواڵانەدا لە ناخەوە شاگەشکە ئەبووین، لەو چۆڵەوانیەدا هەستما بە سەرکەوتنی خۆمان ئەکرد، زۆرمان پێ خۆشبوو کە ئەم دووژمنە دیکتاتۆرە، ئەم رژێمە خوێن ڕێژە لەو بەرزییەوە غلۆر بێتەوە و تۆڵەی ئەو دەیان ساڵەی زوڵم و ستەمەی لێبکەینەوە.

ڕۆژی ١/٣/١٩٩١ لە ئەشکەوتی هۆمەری نزیکی پاریاوڵەوە چووینە پەناگەکانی کاك حەمە پاریاوڵە و پاشان شۆڕبووینەوە بەرەو تەنیا ماڵەکەی حەمەی ئەولکەریمە سوور و شەوەکەی لە هەردەیی خەوتین، ڕۆژی دوایی چووینە مارف سەیدە و کوردەمیرەکان و قەڵوەز لوقمان، پاش نیوەڕۆکەی چووینە مەسۆی مامران و ئینجا بۆ دێی کۆیکی زێدی خۆم کە لە شوێنێکی چەپەکدایە و لای خەڵکی زۆر خۆش نییە، بەڵام هەموو بەرد وداریکی لە دڵمدا جوان ورەنگینە،شەوەکەی لە ئەشکەوتی هێلانە پلیسیرگەکەداماینەوە و وێنەی ئەم دێیە وێرانەیەم بۆ یادگاری گرت.

ڕۆژی ٣/٣/١٩٩١ لە ئاوەسپی ڕاوە ماسییەکمان کرد و ماسییەکانمان برد بۆ وێرانەکەی زستانە. کە لە ژیانی پێشمەرگایەتییدا زۆر ڕێزیان لێگرتبووم و یارمەتیان دابووم. کچێکی تیا بوو بە ناوی بەدیعە عەبدولکەریم خدر زۆر ئازا بوو، هەرچی کەل و پەل و تەقەمەنییەکمان هەبوو لای ئەو دامان ئەناو بە باشی بۆی ئەپاراستین، ئەم ئەزانی لە ئەنفالدا چی بەسەر هاتووە، بۆ یادکردنەوەی چوومە سەر وێرانەکەیان و وێنەی ماڵە پووخاوەکەیانم گرت، ئینجا ماسیەکانمان برژاند و دوای نان خواردن بەرەو چیای ئاژداخ و بنکەکەی جاری پێشوومان چووینەوە.

شایەنی باسکردنە کاتی خۆی جولەکە لە کوردستاندا هەبوون بەڵام ژمارەیان کەم بوو، بەشێکیان لە شارەکاندا دەژیان و بەشێکیشیان لە دێهاتەکاندا..

ئەمانە خەڵکێکی بێوەی و کاسب بوون بە تایبەتی دێهاتییەکانیان .. باوەڕیان بە ئاینەکەی خۆیان زۆر قایم بوو، خۆڕاگر بوون و بەرگەی زوڵم و ستەمی خەڵکی

تریان گرتووە و بەتایبەتی ئەوانەی گەریان پێکردوون و شەریان پێ فرۆشتوون... جارێکیان لەم دێی زستانەیە جولەکەیەك ئەبێتە میوانی هەسەنە شەل کە کابرایەکی خاوەن دەسەلآت بووە لە دێیەکەدا.. هەسەنە شەل ئەیەوێ گەرێك بەو جولەکەیە بگێرێ چوونکە پارە و زێرێکی زۆری پێبووە، هەسەن ڕوو ئەکاتە جولەکەکە و ئەڵێ : جمێنی جوولەکانە زۆر خۆشە بۆ مەنێ جمێنم نادەیتێ..؟ جوولەکەی بەستەزمانیش ئەڵێ:خوا نەکات،چۆن هەڵەی وا ئەکەم جمێن بە جەنابتان بدەم، هەسەنە شەل زۆری لێئەکا و وازی لێناهێنی و جولەکەکەش ناچار ئەبێ و جمێنکێ پێ ئەدا و ئەڵێت : هەسەنی سەگباب و...! ئیتر هەسەن بانگی کورانی خێڵ ئەکات و ئەلی:پیاوئەگەر نەگبەتی بیگرێت جولەکەش جمێنی ئەداتێ. ئیتر بەو بیانووەوە جولوکەی داماو ڕووت ئەکەنەوە و دەستبەسەری دەکەن.

ڕۆژی ٤/٣/١٩٩١ لەوێوە بەرەو مەسۆی بەرگەچ گەراینەوە و لەوێشەوە چووینە چیا چەرموو کە لە ٥٠٠ مەتری دووری دێیەکەوە فڕۆکەیەکی عێراقی کەوتبووە خوارەوە لە لایەن فڕۆکەکانی ئەمریکاوە کە ڕۆژانە ڕاویان ئەکردن، بە جوانی وێنەی ئەو فڕۆکەیەم گرت، ئاخۆ ئەبێ ئەم فڕۆکەیەی ئێستا ئەم هەردە چۆڵە بووەتە گۆڕستانی چەندین جار پەلاماری کوردستانی دابێ و زیانی زۆری بە خەڵکی و دێهاتەکان گەیاندبێ.. کێ ئەڵێ ئەمەیەکێك لەوفڕۆکانە نییەکە بۆمبەژاراوییەکانی کیمیایی نەرشاندووەتە سەرهەڵەبجە دا.؟چەند خۆشە دوژمنە دڕندە بێ بەزەییەکەی خۆت وا بە زەلیلی ببینی..! ئەو دوژمنە کە سوپایەکی شەڕەنگێزی بە هەموو جۆرە چەك و تەکنیکێکی سەربازی سەردەمەوە ساز و تەییار کردبوو بۆ تەفر و تونا کردنی کورد و هەڕەشەی پێ لە دەوڵەتانی ناوچەکە ئەکرد.



١٥/٧/١٩٨٩. شارباژێڕ.
لە راستەوە بۆ چەپ: حسام، شەهید سەید جەوهەر، نازم کەرکوکی، حەمە سیاسی، شێخ کەریم

## خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین

گەلانی عێراق هەموویان وەکو مەنجەڵێکی پەستێنراو لەسەر ئاگر جۆشیان ئەخوارد و هەمیشە لە بیری ئەوەدا بوون ڕووبەڕووی یەکجارەکی ئەو ڕژێمە ستەمکارە ببێتەوە. ئەو کەرایەتییەی سەدام لە پەلاماردانی کوێتدا کردی و ئەو لێدانەی لەلایەن ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی کرایە سەری و ئەو شکستەی تووشی هات، زەمینەی زیاتری خۆشکرد بۆ هەڵچوونی کەفوکوڵی خەڵکی و ڕاپەڕینی سەرتاسەری. چوونکە بەعس خۆی لە ڕێگەی کودەتایەکی شوومەوە هاتە سەر حوکم و نەیئەزانی گورزی ڕاپەڕین چەندە قورسە و ئازاری پێئەگەیەنێ. هەستی بەوە نەئەکرد کە ئەو هەموو ساڵە پڕ لە زوڵم و ئەشکەنجە و توند و تیژییە ئەبێتە چەقۆیەکی تیژ و گەردنی ئەستووری ئەبڕێتەوە. ئەو لێدانەی ئەمریکا و هاوپەیمانان باری ناوخۆیی عێراقی تێکدا، لە خوارووداجموجووڵ پەیدا بوو. خەڵکی هەستان. ڕژێم شڵەژا بوو، ئەو هەموو شکستەی لە کوێتدا تووش بوو.. لە ناو خۆشیدا خەڵکی ڕاپەڕی، هەڵوێستێکە تەحەمول ناکرێ. لە کوردستانیشدا

دۆخەکە لە تەقینەوەدا بوو . هێزەکانی بەرەی کوردستانی بەرەو ناوەوە ئەهاتن، بە تایبەت هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هەموویان کەوتبوونە ڕێ کە بە پێی نەخشەیەکی گشتی کارەکانی داڕێژرابوو هەموو کوردستان کرابووە چەند میحوەرێکەوە هەر میحوەرێکیش ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی سەرپەرشتی ئەکرد بە هاوکاری لیژنەیەك کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و کارەکان درووست کرابوون، هەر میحوەرێکیش بریتبوو لە چەند یەکەیەك :.

١/ میحوەری سلێمانی.. کە سنوورەکەی بریتی بوو لە :

سلێمانی،پێنجوێن،هەورامان، شارەزاوور، دەربەندیخان، باوەنوور، کەلار، خانقەین، سمود، کفری، دووز، زەنگابات.

ئەم میحوەرە دوو یەکەی هەبوو:

ا/یەکەی گەرمیان:کە لەسنووری تەپەڕشی ئێرانەوە کارەکانی بۆ ناوەوە ڕائەپەڕاند.

ب/ یەکەی شارەزوور/ لە دۆڵە ناوەوە بۆ ناوەوە خۆیان ئامادە و ساز ئەکرد.

ئەم میحوەرە کاك فەرەیدون عبدالقادر سەرپەرشتی ئەکرد بە هاوکاری هەڤاڵان شێخ جەعفەر، حامی حاجی غالی، شێخ عەلی شێخ حەمە ساڵەح.

٢/ میحوەری کەرکوك .. سنوورەکەی بریتی بوو لە :.

کەرکوك، چەمچەماڵ، دووکان، ئۆردووگاکانی: ئەلایی، بازیانەکان، شۆڕش.

٣/ میحوەری هەولێر.. سنوورەکەی بریتی بوو لە:.

هەولێر،کۆیە، هەموو ئەو ئۆردوگایانەی کەوتبوونە ئەو دەڤەرەوە.

٤/ میحوەری ڕاپەڕین سنوورەکەی بریتی بوو لە:قەڵادزێ،ڕانیە، چوارقووڕنە، سەروچاوە. خۆشناوەتی، هەموو ئۆردوگاکانی ئەو دەورووبەرە .

٥/ میحوەری بادینان..سنوورەکەی بریتی بوو لە :.

بادینان، باڵەکایەتی. هەموو شار و شارۆچکە و ئۆردوگاکانی ئەو دەورووبەرە.

سنووری گەرمیان لەمیحوەری یەکدا بوو ئەم میحوەرەش کرابووە چەند یەکەیەکەوە بە پێی ئەو شارۆچکە و ئۆردووگایانەی سنوورەکە، هەر یەکەیەکیش هەڤاڵێك لێپرسراوی بوو لەگەڵ هێزێکی بەردەستدا بەم شێوەیەی لای خوارەوە:.

١.یەکەی دەربەندیخان: مەحمود سەنگاوی

٢.یەکەی باوەنوور: کوردۆ قاسم

٣.یەکەی کەلار: عەدنانی حەمەی مینا

٤.یەکەی سمود: م عەلی عەبدولا

٥.یەکەی کفری: حەمە ڕەش شێخ کەریم

٦.یەکەی دووز: عوسمانی حاجی مەحمود

٧.یەکەی زەنگاباد: عادل شکور

٨.یەکەی خانەقین: عەلی شامار

هەر یەکێك لەم یەکانە چەندین کادیری جیا جیا لەگەڵ لێپرسراوی یەکەکاندا هاوکار بوون بۆ بەڕێوە بردن و جێبەجێکردنی ئەرکەکان. بەڵام دواتر بە هۆی هەندێ گللەیی گوازندەوە گۆڕانێك لە یەکەی دەربەندیخاندا کرا و من چوومە میحوەر و برادەران سەلامی کوێخا عەزیز و مەحمودی مامە عەزە لەوێ دانران.

هەر لە پێش دەستپێکردنی ڕاپەڕینەوە یەکێتی هەندێ هەنگاوی گرنگی نا بۆ کۆنترۆڵکردنی دۆخەکە و سەرکەوتنی بەرنامەکان بەوەی لە ڕێگەی پارتیزان و ڕێکخراوی ناو شارەکان و هەڤاڵانەوە نووسراوی مۆرداری مەکتەبی سیاسی بۆ خەڵکی تێکۆشەر و پیاوەکانی سەر بە ڕژێم نێردرابوو بۆ هاوکاریکردن و پشتیوانی ڕاپەڕین. ئینجا کۆمەڵێك ڕێنمایی بۆ لێپرسراو و کادیرەکان دابەزێنرا بۆ پەیڕەوکردنی :.

١.ڕزگارکردنی کوردستان لە سووپای داگیرکەری بەعس.

٢.ڕێزگرتن لە دیل و ناردنیان بۆ شووێنی پارێزراو.

٣.ڕێزگرتن لەو چەکدارانەی هاوکاری هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەکەن و ڕێکخستنیان بۆ بەرژەوەندی گشتی.

٤.خۆ دوور خستنەوە لە شەڕی زیانبەخش کە دوژمن ئەیسەپێنێ.

٥.نواندنی ڕفتاری جوان بەرامبەر بە خەڵکی.

٦.کۆنترۆڵکردنی هێزەکان و ڕێگەنەدان بە خراپکردنی.

٧.دەستکاری مەکردنی کەرەستە و کەلوپەلی دامودەزگا گشتی و حکومییەکان.

٨.دەستگرتن بەسەرهەموو بەڵگەنامەکانی ناو دامودەزگا حیزبی و جاسوسییەکان و پاراستنیان و گەیاندنیان بە شووێنی مەبەست.

٩.ڕێگەنەدان بە تۆڵەسەندنەوەی عەشایەری.

بەداخەوە هەندێ لەو ڕێنماییانە جێبەجێ نەکراو شاڕۆییەك بەرپا بوو. جا لە خۆسازدانمان بۆ ڕاپەڕین ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان بەردوام بەرنامەکانی بەو پەڕی حەماسەتەوە پەخش ئەکردەوە. هەموو هێزەکانی پارتیزانی خستبووە ئینزارەوە. شانە چەکدارەکان ئامادەباش بوون لە ڕێگەی برووسکەی جفرەدارەوە هەموو زانیاری و ڕاسپاردەیەکیان پێئەگەیشت و دەستبەکاربوون. دامودەزگاکانی ڕژێم لە بارێکی ناهەمواردا بوون، سات بەسات وورده وورده دەستیان ئەکردە کشانەوە و چۆڵکردنی کوردستان بەتایبەت کاربەدەستە زلەکانیان، بۆیە ڕۆژی ٣/٥ ئاگادار کراینەوە بگەینە نزیك باوەنوور ، چووینە دێی وێرانکراوی گلاڵکەوە، ئینجا گەڕاینەوە ئەسحاب. جارێکی تر گەڕاینەوە لای نزیکی باوەنوور و لەوێ لەگەڵ برادەرانی ڕێکخستندا یەکمان بینی کە یەکێکیان جووتیاری برای شەهید جەلال بێکەس بوو، دوای ئەوە ڕۆشتینەوە بۆ ئەشکەوتی هۆمەر لەگەڵ کاك سەلاّحی کوێخادا ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە بارانی بەخوڕ لێیداین.

هەر ئەمڕۆ کە یەکەم پریشکی ڕاپەڕین لە سەروچاوە و ڕانیەوە هەڵگیرسا و کۆمەڵانی خەڵکی شۆڕشگێری کوردستان و ڕێکخستنەکان و شانە چەکدارەکان و هێزی پێشمەرگە پەلاماری ڕژێمی فاشییاندا و لە ماوەیەکی کەمدا ئەو دەسەڵاتە زەبەلاحەیان ڕاپێچی توونی مەرگ کرد و هەموو دام و دەزگا تۆقێنەرەکانی و سوپا دڕندەکانی و جاش و چەکدارەکانی وەکو بەفری ئەو بەهارە توانەوە و ئاسەواریان نەما. بەمەش ڕانیە بووە دەروازەی ڕاپەڕین و پریشکی بە هەموو شوێنێکی تری ئەم کوردستانەدا پەخش بووەوە.

لەملاشەوە شەوی ٥/٣ چووینە سەر چەمی سیروان بۆ پێشوازی کاک فەرەیدون و لێپرسراوی وەحدەکان بە هێزەکانیانەوە، بەڵام ئەوەندە بارەنەکە بەخوڕ بوو. ئاوی سیروان زیادیکرد، نەمانتوانی بە کەڵەکیش بپەڕینەوە، هەموو لەشمان تەڕ بوو بوو و ووشکی تیانەمابوو، لە ئاستی دێی لەواوانماینەوە کە نزیکی جادەی کەلاردەربەندیخان، ئۆتۆمبێلێکی زۆر بە جادەکەدا لە دەربەندیخانەوە بەرەو کەلار ڕەت ئەبوو، نەمانئەزانی ئەوانە پیاوەکانی ڕژێم بوون و لە ترسی ڕاپەڕینی خەڵکی سلێمانی هەڵئەهاتن. گەر پێمان بزانیبایەن ڕەنگبێ دەیان کەسمان بە دیل بگرتایە لەوانەی کە دەستیان بە خوێنی ڕۆڵەکانی میللەتەکەمان سوور بوو.

ڕۆژی ٧/٣ شاری سلێمانی ڕاپەڕی، ئەو هەموو دام و دەزگا تۆقێنەرەی بەعس لە ماوەی ٢٣ ساڵدا بە خوێنی خەڵکی دروستی کردبوو هەرەسی هێنا. بەعس لە دوای خۆی جگە لە تۆماری تاوان و جینۆساید و خراپەکاری هیچی تری بە جێنەهێشت، هەندێك کەش و هەوا خۆشتر بوو، باران و سەرماکەی نەمابوو، شەوی ٧/٣ کاك فەرەیدون و کاك عەدنان بە هێزێکەوە لە ئەشکەوتی هۆمەرگەیشتنە لامان. پێکەوە دانیشتین و لەسەر چۆنیەتی پەلاماردان و ڕزگارکردنی شارۆچکەکانی

سنووری میحوەری یەك گفتوگۆمان کردو ئاگاداری برادەرەکانمان کردەوە کە ڕێکخستنەکان بە باشی خۆیان سازداوەو دوژمن ورەی نەماوە.

ڕۆژی ۸/۳ بە تەواوی شاری سلێمانی لە داگیرکەرانی کورد پاککرایەوە و کۆنترۆڵکرا، پریشکی ئەم ڕاپەرینە گەیشتە نەسر و باریکە و عەربەت و هەڵەبجەی تازە و هەموو سەربازگە و ڕەبایە و مۆڵگەکانی ڕژێمی گرتەوە.

شەوی ۸/۳ هێزەکەی تری گەرمیان کە لە هەردەکانی خوڕ خوڕ و زەلکەدا خۆیان حەشاردابوو لە سیروان پەڕینەوە، بە سەرپەرشتی کاك کوردۆ و م.عەلی و کاك عادل شکور داواکران هەر ئەوشەوە بگەنە پەناگەی سەلاجەکەو هێزەکەشیان لە پشتی باوەنورەوە بن. ئەم شەوەش دنیا سارد و ئینجا بارانێکی زۆر دایکرد، ووشکای لە لەشی کەسدا نەمابوو. بەڵام لەبەر ئەوەی دنیا بەهار بوو، کەس سەرمای نە ئەبوو. ئەو شەوە بۆمان نەکرا بچینە ناو باوەنوورەوە، برادەرانی ڕێکخستن هاتن و قسەی خۆیان کرد، ئیتر بە پێی ئەو نەخشەیەی دانرابوو ڕۆژی ۹/۳ کاتژمێر ۱۱ لەیەك کاتدا دەربەندیخان و باوەنووریش لە چنگی ڕژێمی کوردکوژ ڕزگاریان بوو، ئێمە یەکەم مەفرەزە بووین: میقدادی برای شەهید شێخ جەمال و فازڵی برای کەریم چاوڕەش و کۆمەڵێك قارەمانی تر بوون کە گەیشتینە ناو شارۆچکەکە هەموو سەرباز و پیاوەکانی ڕژێم ڕایانکردبوو، خەڵکەکە هەموو ڕاپەڕیبوون، ئێمە تەنها دوو ڕیز تەقەی بیکەیسیمان وەکو نیشانەی سەرکەوتن بەسەر شاردا کرد، ئیتر هەموو شتێك تەواو بوو بوو هەموو هێزی پێشمەرگە گەیشتینە ناوەوە، تەنانەت هێزەکانی کاك شێخ جەعفەر و کاك عەلی شامار و ئەوانیش بە ئاوی سیرواندا بەو نیوەڕۆیە گەیشتن.

# هەلومەرجێکی نوێ

دوای ئەوەی ڕژێمی لەخۆبایی بووی صدام حسین پەلاماری کوێتی داو شەڕێکی گەورەی نایەوە. ئیتر هەلومەرجی نوێ ،بەقازانجی شۆڕشی کورد و پارتیزان بەتایبەتی شکایەوە...ئیتر لێکدانەوە وپێشبینییەکان هەمووی دواڕۆژێکی پڕشنگداری لێ چاوەڕوان دەکرا، لەمانگی تشرینی دووەمی ساڵی1990 دا هەڤاڵ عوسمانی حاجی محمود وچەند پێشمەرگەیەکی پارتیزان بۆماوەیەکی کورت و بەپەلەسەردانی بارەگاکانی سەرکردایەتی(ی.ن.ك)دەکەن لە(قاسمەڕەش)و(زەڵێ). پاش دیدار وگفتوگۆ لەبارەی پێشها تەکان و داڕشتنی بەرنامەی ئەرکەکانی داهاتوو بۆ ڕاپەرین.هەر بەپەلە دەگەڕێنەوە گەرمیان...

. نیسانی ساڵی1990 ئەم (9) پارتیزانە

لەگەڵ عوسمانی حاجی محمود گەڕانەوە گەرمیان:.

1 . مەلا سعید احمد خدر
2. علی فەقێ مستەفا
2 . ملازم عباس
4. نەوشیروان حاجی احمد
5. صباح عمر وەلی
6. حسێن حمید ئۆمەربلی
7. شەهیدمجید دووزی
8. حەمە رشید توکنی
9. عوسمان مەلا جمیل

تێبینی: ا.

1. شەهیدحەمە ئاخە
2. شەهید کاکە توکنی
3. شەهید هەڵکەوت احمد غێدان*

---

ئەم سێ هەڤاڵە لەدەستەکانی کاك محمود سەنگاوی وکاك کوردۆ قاسم بوون لە گەرمیان مابوونەوە.



# هەڤاڵ عوسمانی حاجی محمود
# بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە

کاك عوسمانی حاجی مەحموود لە چەندین گۆڤار ورۆژنامەو ماڵپەڕ و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بیرەوەری خۆی دەربارەی ( بڕیاری مانەوە و خۆڕاگری ) بڵاوکردۆتەوە، ئێمە پوختەی سێ لەوبابەتانە دەخەینە بەردیدی خوێنەرانی ( پارتیزانەکانی دوای ئەنفال )



# بریاری مانەوەو خۆڕاگری

قۆناغەکانی هێرش‌وشاڵاوەکانی ئەنفال لەبەهاری ساڵی1988دا،کە لەلایەن سوپای داگیرکەری عێراقەوە بەهەشت قۆناغ ئەنجامدرا،بووە هۆی شکستێکی گەورەی سەربازی بۆهێزی پێشمەرگەی کوردستان‌و جوڵانەوەی سیاسی کوردستان، گوندەکانی کوردستان لە هەموو شۆڕشەکاندا هەمیشە سەرچاوەو پێگەو پاڵپشتیکی گەورە و کاریگەربوون بۆ شۆڕش‌و بۆ هێزی پێشمەرگە، هەربۆیە چۆڵکردن‌و نەهێشتن‌و بنەبڕکردنی ژیان‌و ئاوەدانی لەلادێکاندا، شۆڕشی کوردستان بەگشتی‌وخەباتی چەکداریی‌وپێشمەرگانەی دوچاری قۆناغێکی سەخت‌ودژوارکرد، بەڵام سەرەڕای ئەوقۆناغەدژوارەیش لەچەندناوچەیەکی جیاجیای کوردستاندا، پێشمەرگە بڕیاری مانەوەو بەردەوامی داو خۆی لەگەڵ ئەو قۆناغەیش ڕاهێنا بەداهێنانی شێوازێکی نوێ و بەدەستەو گروپی بچوك بچوکی چەندکەسی، کە بەمەفرەزە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال ناسراون.

گەرمیان یەکێك بوو لەو ناوچانەی کە لەپاش ئەنفالی سێ تا ڕاپەڕینی 1991 پێشمەرگەی بەبەردەوامی لێ مایەوە، ئەگەرچی نووسینەکەی من پەیوەندی بەقۆناغی ئەنفالی سێیەمەوەهەیە،بەڵام پێویست بەوەدەکات بۆڕوونترکردنەوەی دیمەنەکان بەکورتی باسی بەشێك لەقۆناغەکانی ئەنفال بکەین، کە هەر قۆناغیکیان لەکات و سنورێکی جوگرافی دیاریکراودا ئەنجامدەدرا، بەم شێوەیە:ئەنفالی یەك: بۆ ناوچەکانی سەرکردایەتی ی.ن.ك بوو لەسنوری دوکاڵ کارێزە لە1988/2/22 دەستیپێکردو لە19/3/1988 کۆتایی هات.

ئەنفالی دوو: بۆ سنووری ناحیەکانی بازیانو قەرەداغو بەشێك لەسنوری هەردو قەزای دەربەندیخانو شارەزور بوو، لە1988/3/28 دەستیپێکردو پاش چەند ڕۆژێك کۆتاییهات.

ئەنفالی سێ: بۆ سنوری قەزاکانی خورماتو، کفری، کەلارو بەشێك لەسنووری قەزای چەمچەماڵ بوو، لە7 /4 /1988 دەستیپێکردو لە1988/4/15 کۆتاییهات.

کۆتایی ئەنفالی سێو بڕیاری مانەوە:

بەو پێیەی یەکێك بووم لەو پێشمەرگانەی پاش کۆتاییهاتنی ئەنفالی 3، لەگەرمیان مامەوە، ئاگاداری وردەکاری چۆنیەتی بڕیاری مانەوەم بۆ بەشێك لەو فەرماندەو کادرو پێشمەرگانەی کە پێکەوە بووین. ئەم نووسینە تایبەتە بەو وێستگەیەو هەوڵم داوە ئەوەی خۆم ئاگاداریمو شاهیدی بوومو دیومە، بەبێ زیادکردنو کەمکردنەوە، بەدروستی بیخەمە بەرچاوی خەڵکی کوردستان.

باسی بابەتو ڕوداوو بەسەرهاتەکانی تر بمێنێتەوە بۆ کاتێکی تر، ئەکرێت منو پێشمەرگە پارتیزانەکانی تریش، لەداهاتودا باسیان بکەینو لەسەریان بنوسین. بەپشتبەستن بەهەندێ زانیاری دیاریکراو کە لەو کاتانەدا ڕۆژانە نوسیومەتەوەو بوونی چەند بەڵگەیەك لەلام، ناوی ئەو پێشمەرگەو دەستانە بڵاودەکەمەوە کە بەشداربوون لەقۆناغی پارتیزانی پاش ئەنفالەکاندا،بەتایبەت ناوی ئەو پێشمەرگەو کادرو فەرماندانەی کە لەپاش کۆتاییهاتنی لێبووردنەکەی مانگی 1988/9/6 . 1988/10/6 مانەوەو بەردەوام بوون. هەروەها ئەو ئاڵوگۆڕو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر دەستەکانو پێشمەرگەکاندا هاتووە تا کۆتایی مانگی 1990/12، وەکو هاتنەوەو ڕۆیشتنی دەستەکان بۆ ئێرانو ماوەی مانەوەی دەستەو پێشمەرگەکان. بۆ ڕونکردنەوەی ئەم وردەکاریانە پاشکۆیەکم بۆ ئەم نووسینە ئامادە کردووە.

سنوری جوگرافی ئەنفالی سێ:

ئەنفالی سێ سنووری بەشیك لەمەڵبەندی 1ی "ی.ن.ك"ی ئەو کاتەی گرتەوە. (حزبوو هێزە سیاسیەکانی تریش وەکو پارتی، سۆشیالستو حزبی شیوعیش لەم سنوورەدا بارەگاو هێزیان هەبوو، بەڵام هێزی گەورەو خاوەن دەسەڵات لەم سنوورەدا هێزی ی.ن.ك بوو). بۆ ئەوەی بەرچاوڕوونتر بین بەپێویستی دەزانم بەشێوەیەکی گشتی باسی هەیکەلی ڕێکخستنی مەڵبەندوسنووره جوگرافیەکەی و ئەو تیپانە بکەم کەئەکەوتنە سنووری بازنەی شاڵاوەکانی ئەنفالی3.مەڵبەندی یەك، لەڕووی جوگرافییەوە سنووری قەزاکانی خورماتو،کەلار، کفری، دەربەندیخان، هەڵەبجەو بەشێك لەسنووری قەزاکانی پێنجوینو قەزای مەرکەزی سلێمانیو بەشێك لەچەمچەماڵی دەگرتەوە. لەساڵەکانی پاش 1985 سنوری پێنجوێنو بەشێك لەهەڵەبجە بووە مەیدانی شەڕی عێراق ئێرانو وێرانکرا.

<u>پێکهاتەی مەڵبەند:</u>

. کاك قادری حاجی عەلی: لێپرسراوی مەڵبەند

. کاك عمر فتاح: لێپرسراوی دارایی مەڵبەند

. کاك شێخ جەعفەر: کاروباری پێشمەرگە

. کاك ئاوات قارەمانی: کاروباری پێشمەرگە

. کاك ڕۆستەم: کاروباری پێشمەرگە

. کاك شێخ علی شێخ حەمەسالح: لیپرسراوی ڕابەرە سیاسیەکانی مەڵبەند

. مامۆستا سالح ژاژڵەیی: لێپرسراوی کۆمەڵایەتی مەڵبەند

بارەگای مەڵبەندی یەك لەقۆپی قەرەداغ بوو، ئەو تیپانەی کە سنورەکەیان ئەکەوتە چوارچێوەی قۆناغی ئەنفالی سێ، بریتی بوون لە:

* تیپی 51ی گەرمیان بارەگاکەی لەدێی بانی مۆردبوو لەسنوری ناحیەی سەنگاو

* تیپی 53ی شیروانە . بارەگاکەی لەنزیك دێی چرچەقەڵا بوو
* تیپی 59ی حەمرین . بارەگاکەی لەدێی گوڵباخقادرکەرەم بوو
* بەشێکی بچوك لەسنوری تیپی 17ی زمناکۆ

سەرەڕای ئەو سێ تیپە، بارەگای مەڵبەندو تیپی بارەگای مەڵبەندو تیپی 55ی قەرەداغو تیپی ١٧ی زمناکۆو بەشێك لەتیپی 57ی سەگرمە کە بەهۆی شاڵاوەکانی ئەنفالی دوو، ناوچەکەیان لەلایەن سوپاو جاش داگیرکرا بوو هاتبوونە سنوری گەرمیان. بارەگای مەڵبەند پاش داگیرکردنی قۆپی قەرەداغ گواسترابووەوە بۆ دێی تیلەکۆی قەلەندەر لەسنوری ناحیەی سەنگاو.

ئەنفالی 3، ڕۆژی 7 1988/4 بەهێرشی جاشو سوپای عێراق، بەپاڵپشتی تۆپخانەو هەلیکۆپتەر. لەچەند قۆڵیکەوە دەستیپێکردو پلانی هێرشەکە وا دانرا بوو هەموو قۆڵەکان پاش تەواو کردنی ئامانجی شاڵاوەکە لەسنوری ناحیەی سەنگاوو بناری زنجیرە چیای نێوان سەنگاوو دەربەندیخان یەکبگرنەوە، تا ڕۆژی 14و1988/4/15زۆربەی ئامانجەکەیان جێبەجێکرد.زۆرترین ژمارەی پێشمەرگەو ئەو هاوڵاتیانەی کە تا ئەو کاتە مابوونەوە بەئاراستەی سنوری دێهاتەکانی ناحیەی سەنگاو، پاشەکشەمان کرد.

تا ڕۆژی 1988/4/14 بەشێکی زۆر لەهێزی پێشمەرگەو پێکهاتەکانی تری ئەو کاتەی هێزی پێشمەرگە، لەگوندی مەسۆیی بەرگەچو چەند گوندێکی تری نزیکەو دەوروبەری مەسۆیی لای کاك قادری حاجی عەلیو برادەرانی مەڵبەند کۆبووینەوە. زۆربەی لێپرسراوەکانی ئەو کاتەی سنووری مەڵبەندو ئەو تیپانەی کە پێشتر باسمان کردن لەوێ بوون. هێرشی سوپاو جاشیش بەردەوام لەزیادبووندا بوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گوندو شوێنی زیاتریان داگیردەکردو بازنەی هێرشو گەمارۆیان لەسەرمان تەسکتر دەکردەوە، بۆیە بڕیار درا پاشەکشە بەهێزەکان بکرێت بۆ

سنووری تیپی 25ی خاڵخالانو تیپی 21ی کەرکوك، کە سنورەکەیان دەکەوتە سەروی ڕێگای سەرەکی نێوان بازیانچەمچەماڵ قەرەهەنجیر. کەرکوك.بەرنامەی چۆنیەتی پاشەکشەش دانرا، بەچەند ڕەتڵو لەچەند ڕێگایەکی جیاوازەوە بێت بەئاراستەی جێگای مەبەست. ئەو بڕیارە ناچارییە شەوی 14 لەسەر 15ی 1988/4/ درا. هەموو ڕۆژەکانی پرۆسەی ئەنفالو بەتایبەت هەردو ڕۆژی 14و 4/15 لەرۆژە هەرە ناخۆشو پڕ لەژانو ئازارەکانی هەر یەکێکمان بوو. هەر کەسەو دەیان پرسیاری بێوەلامو بیری ئاڵۆزکاو لەمێشکیدا بوو دەربارەی قۆناغی داهاتو، چارەنووسی خەڵکو پێشمەرگەو شۆڕش، چونکە ئەو بارودۆخە ئەوەندە دژوار بوو، ئاسان نەبوو پێشبینییەکی دروست بۆداهاتو بکرێتو هەموو شتێك ئاڵۆزو نادیارو تەمومژاوی بوو

لەو ڕۆژانەدا کۆی دیمەنەکە بریتی بوو لەوێرانیو سوتماکو دێهاتی ڕەش داگەڕاو کە مایەی خەمێکی قوڵ بوو بۆ هەمومان، بەڵام سەرەڕای ئەو دۆخە نالەبارە پێویستمان بەپشودرێژیو ئیرادەی بەهێزو چاوەڕوانی خوڕاگرانە هەبوو، بۆیە هەر ئەوەمان هەڵبژاردو لەسەری بەردەوام بووین. لەو کاتەدا هەستم بەوە دەکرد کە ئەرکێکی قورس کەوتوەتە سەرشانی هەمومانو پێویست بوو بەرامبەر بەو ئەرکە شتێك بکەین. لەو سۆنگەیەوە ئەوەم بەبیرداهاتو لەخۆم پرسی: "ئایا ناکرێت لەناوچە چۆڵکراوەکاندا بمێنینەوەو درێژە بەشۆڕشو پێشمەرگایەتی بدەین؟" (دیارە من تەنها کەس نەبووم کە بەو شێوەیە بیرم دەکردەوە)، بەڵام لەو ساتەوەختەدا، هیچ کەس بیرۆکەی لەو بابەتەی بۆ باس نەکردم، لای خۆمەوە بڕیارمدا دەستپێشخەری بکەمو ئەو بیرۆکەیە بۆ چەند کەسێك باس بکەم، هەمان شەوی 14 لەسەر 15 1988/4 قسەم لەگەڵ شەهید حەمە ڕەش کردو بیرۆکەکەم بۆی باس کرد، ئەویش وتی (منیش هەمان بیرۆکەم هەیەو پێمباشە بمێنینەوە) وا

ڕێککەوتین قسە لەگەڵ چەند کەسێکی تریش بکەین‌و شەهید حەمە ڕەش وتی: لەگەڵ هێزەکەدا دەڕۆم تا لەڕێگای سلێمانیبازیانچەمچەماڵ دەپەڕنەوە بەری ئەوبەرو دواتر دەگەڕێمەوە. هەرواشی کردو پاش پەڕینەوەی هێزەکە گەڕایەوە بۆ لامان، دوای ئەو قسەکردن‌و ڕێککەوتن‌و بڕیارەمان لەگەڵ شەهید حەمەڕەش دڵخۆشبووم، چونکە شەهید حەمەڕەش یەکێك بوو لەفەرماندە هەرە ئازاو بوێرو خاوەن هیمەت‌و مشورخۆرەکان. بۆ ڕۆژی 1988/4/15قسەم لەگەڵ مام جەلال ئەمین کاکە کرد (یەکێك لە پێشمەرگەو فەرماندەکانی گەرمیان)، ئەویش پێیباش بوو، وتی قسە لەگەڵ کاك حەمە ئاخەو کاك کەریم حسێن دەکات. دواتر ئاگاداری کردم کە هەردوکیان ڕازین بەمانەوە، منیش قسەم لەگەڵ چەند کەسێکی تر کردو ئەوانیش بڕیاری مانەوەیان داو لەئەنجامدا بووین بە12 کەس،پاش ئەوەلەگەڵ کاك قادری حاجی عەلی قسەم کردو بۆم باسکرد کە بڕیارمانداوە بمێنینەوە، ئەویش پێیباش بوو،پشتیوانی بریارەکەمانی کردو هەندێ پێداویستیشی بۆ دابین کردین. ئەوەی بیرم مابێت پاش ئەویش لەگەڵ کاك عومەر فەتاح‌و کاك شێخ جەعفەرو کاك ئاوات قارەمانی‌و کاك مەحمود سەنگاوی‌و کاك عادل شکورو چەند کەسێکی تر بۆ هەمان مەبەست قسەم کرد. ئەوانیش پشتیوانی بڕیارەکەیان کردین. لەو هێزەی کە لەگەڵ کاك قادری حاجی عەلی‌و برادەرانی تر لەگوندی مەسۆی بەرگەچ کۆبووبووینەوە، ئەو چەند کەسە بڕیاری مانەوەمان دا، بەڵام وەکو پێشتر باسم کرد لەو ڕۆژەدا تەواوی هێزەکان لەوێ نەبوون بەڵکو زۆربەی هێزەکان لەوێ بوون، چونکە بەهۆی فراوانی بەرەکانی شەڕو قورسی هێرشەکان‌و نەبوونی هۆیەکانی گواستنەوەو هاتوچۆ بەشێك لەهێزەکە نەگەیشتبوون‌و هێشتا لەشوێنی تر بوون.

کەسەکان بریتی بووین لە:

1. عوسمان مەحمود محمد (عوسمانی حاجی مەحمود)

2. کاك محەمەد حسێن سلێمان (حەمەئاخە) سەنگاو، لەمانگی 12ی 1991 لەهێرشی سوپای عێراق بۆ سنوری چەمچەماڵ لەبان جەباری شەهید بوو.

3. مام جەلال ئەمین کاکە (مام جەلال) کفری، لەساڵی 2001 کۆچی دوایی کرد.

4. کاك کەریم حسێن، پاش ماوەیەك تەسلیم بۆوە (لەڕاپەڕینی 1991 بەسەختی لەخورماتو بریندار بوو).

5. کاك شکور رەشید نەجم (شکور12ئیمامی) کفری، لەڕاپەڕین لە1991/3/11 لەسێڕیانی سلێمان بەگ لەنێوان خورماتو. کفری لەلایەن هێزەکانی موجاهدینی خەلقی ئێران کە لەڕاپەڕیندا هاوکارو پشتیوانی سوپای عێراق بوون شەهیدکرا.

6. کاك جەمال مەدحەت (جەماله سور) هۆمەر بلی، مانگی 7ی 1988 بەهۆی بۆسەی جاشەوە لەناو باخەکانی دێی هۆمەربل شەهید کرا.

7. کاك بوورهان عەلی ڕۆستەم (بوورهان 12 ئیمامی)، کفری، لە1991/3/11 لەمەفرەقی سلێمان بەگ لەنێوان خورماتوکفری لەلایەن موجاهدین شەهیدکرا.

8. کاك عوسمان عەلی سەمین (عوسمان تلیشانی) کفری، لەڕۆژی 1991/10/7 لەهێرشی سوپا بۆ سەر کفری‌و سەرقەڵا بەسەختی بریندار بوو.

9.کاك شکورمحەمەدسلێمان (شکورقەرەبلاغی)

ئەفسەرلەئاسایشی گەرمیان بەپلەی (عەمید).

10. کاك جەمال رەشید سالح (جەمال شێخ حەمیدی) پێشمەرگەی خانەنشینە.

11. سەباح عومەر وەلی (سەباح شێخ حەمیدی) پێشمەرگەی خانەنشینە.

12.کاك رەفیق ئەحمەدرەشید،کارێزە ناحیەی ڕزگاری.دواتر تەسلیم بووەوە. جگە لەئێمە چەند مەفرەزەو پێشمەرگەو فەرماندەو کادرێکی تریش مانەوە، کە ڕۆژی 4/15 پێکەوە نەبووین‌و ئەوان لەجێگای تر بوون، بەلام من ئاگاداری شێوازی بڕیاری مانەوەیان نیم. هەروەها لەچەند ناوچەیەکی تری کوردستانیش لەپاش

تەواوبوونی قۆناغەکانی ئەنفال پێشمەرگە مانەوەو لەهەندێ ناوچەیش پاش چۆڵکردنو پاشەکشە، پێشمەرگە هاتنەوە، وردەکاری بڕیاری مانەوە یان هاتنەوەیان لای خۆیانە. ئەو ناوچانەش بریتی بوون لەسنوری دۆڵی جافایەتیو پیرەمەگرون، دەشتی هەولێر،خاڵخاڵانو چەمی ڕێزان، شارباژێڕ، شاخی بەمۆو خۆشك، سنووری کۆیە، شاخی کاروخو ناوچەی ڕواندز...هتد بەلأم لەگەرمیاندا لەپاش کۆتاییهاتنی شاڵاوی ئەنفالی سێ کە ڕۆژی 1988/4/15 بوو، ناوچەکەمان چۆڵنەکردو ماینەوە،ئەو ناوچانەی کە پێش گەرمیان بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتن، پێشمەرگەی لێنەمایەوە، بەڵکو پاش چەند مانگێك لەپاشەکشە، ئینجا هاتنەوە. پێویستە ئەو ڕاستی یە تۆمار بکەین، کە ئەو شێوازە نوێ یە لەخەباتی پارتیزانی، لەگەرمیانەوە دەستپێکردو گەرمیان بوو بەیەکەمین وێستگەی ئەوجۆرە لەداهێنانو خۆڕاگریو بەرەنگاربوونەوەو کۆڵنەدان.

هەر لەبەشێکی تری گەرمیان، لەسنووری تیپی 21ی کەرکوكو 25 خاڵخاڵان، دوای تەواوبوونی ئەنفالی چوارەم کە لە1988/5/3 دەستپێکردو پاش چەند ڕۆژێك کۆتاییهات. ژمارەیەك فەرماندەو کادر لەگەڵ چەند دەستەیەك پێشمەرگە مانەوە. دواتریش لەمانگی 1988/10دا دەستەیەك پێشمەرگە بەسەرپەرشتی شەهید غەریب هەڵەدنی هاتنەوە بۆ سنووری دۆڵی جافایەتیو ئەو سنوورەش بوو بەیەکێکی تر لەو ناوچانەی کە تا ڕاپەڕین پێشمەرگەی لێمایەوە. پێش ئەنفالی یەك ئەم ناوچەیە جێگای بارەگاکانی مام جەلالو کاك نەوشیروانو مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتیو مەکتەبی عەسکەریو ڕاگەیاندنو مەڵبەندی دو بوو، لەئەنفالی یەکدا وێرانکراو چۆڵکرا.

ڕۆژی 1988/4/15 هێزی پێشمەرگەی سنوورەکە بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە دانرابوو دەستیان بەکشانەوە کرد. ئێمەش 12 پێشمەرگەکە لەگوندی مەسۆیی

بەرگەچ ماینەوە. هەندی خواردەمەنیو پێداویستیمان دابینکردو بەرنامەمان بۆ ڕۆژەکانی داهاتودانا چیبکەین.هەرلەیەکەم ڕۆژەوەئەم خالانەمان لەبەرچاو گرت:

. خۆمان لەهێزەکانی دوژمن بپارێزین.

. سۆراخی دەنگوباسی خەڵك بکەینو بزانین دوژمن چیان بەسەردێنێت.

. ئەوپێشمەرگەومەفرەزانەی ترکەبەهۆی هێرش و پەلاماری دوژمنەوە دابڕابوون و بڕیاری مانەوەیان دابوو، یەکتر ببینینەوەو پەیوەندی لەگەڵ یەکتر بکەین.

- ئەو ئازوقەو پێداویستیانەی کە لەناو گوندە ڕوخاوەکانو دەوروبەری گوندەکان مابوون، لەجێگای باشدا بیانشارینەوە.

پاش چەند ڕۆژێك کە سوپاو جاش دێهاتەکانیان سووتاندنو ڕوخاند، لەزۆربەی جێگاکان کشانەوە. لەکاتی پرۆسەی شالاوەکەدا خەڵکی دێهاتەکان سەرباری تالانکردنی ماڵوسەروەتو سامانیان سەرگەردان بوونوبوون بەچەند بەشێکەوە:

* هەندێکیان چونە ئۆردوگاو شارۆچکەکانو لای خزمو دۆستو کەسوکاریانو کەسانی نیشتمانپەروەر خۆیان شاردەوە.

* بەشێکیان کە لەروی ژمارەوە زۆرترین بەش بوو، بەرەو ئۆردوگاو شارۆچکەکان ڕۆیشتن، لەڕێگادا لەلایەن سوپاو جاشەوە گیرانو لەگەڵ ئەوانەی تر کە سوپا لەکاتی هێرشەکەدا گرتبوونی لەچەند جێگایەك کۆکرانەوەو بە سەربازو جاشی کورد دەورگیران. ئەو جێگایانەی کە خەڵکی دێهاتەکانیان تیا کۆکردەوە بریتی بوو لەگوندی ملەسوورە لەناحیەی سەرقەڵاکفری، لەڕۆژی 1988/4/14دالەم جێگایەدا زۆرترین ژمارەی خەڵکی گوندەکان کە کۆکرابوونەوە ڕاگوێزران بەرەو چارەنووسی نادیار، دواتر زانرا بۆ کۆمەڵکوشتنو زیندەبەچاڵکردن ڕاپێچیان کردون. لەبەر هەمان هۆ لەکۆنفرانسی دامەزراندنی کۆمەڵەی ڕوناکبیریو کۆمەلایەتی پارێزگای

کەرکوکدا پێشنیارێك درایە حکومەتی هەرێمی کوردستان تاڕۆژی1988/4/14 بکرێتە ڕۆژی یادی ئەنفال

جگەلەوشوێنەبەرزای یە کانی ئیمام شاسوار لەنزیك ناحیەی سەنگاوو ناو ناحیەی قادر کەرەم... هتد جێگەی کۆکردنەوەی خەڵکی دێهاتەکان بوو، دواتریش گواستنەوەیان بۆ ناحیەی قۆرەتو (خانەقین) لەوێشەوە بۆ تۆپزاوا (دوبز)و پاشان ڕەوانەکردنیان بۆ کوشتنی بەکۆمەڵو زیندە بەچاڵکردن. هەندێك پیرو بەساڵاچوو ژنو منداڵیش ڕەوانەی گرتوخانەی نوگرەسەلمان کران لە باشووری عێراق.

* ژمارەیەکی کەم بەشێوەی تاك وتەرا لەدەوروبەری گوندە ویرانکراوەکان مانەوەوخۆیان پەنادا.

* ژمارەیەکیش کە زۆربەیان کەسوکاری پێشمەرگە بوون لەگەڵ هیزی پێشمەرگە ڕۆیشتنو قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵ پاشەکشەی پێشمەرگە بەردەوام بوون تا سنووری ئێرانو دواتریش بۆ ناو ئێران.

پاش کشانەوەی زۆربەی هێزەکانی دوژمن، کەوتینە گەڕانو سوڕانەوە لەگوندە وێرانکراوەکان، جگە لەوەی هەندێ خەڵکمان بینی کە مابوونەوە، هەواڵی ئەو پێشمەرگەوەفرەزانەشمان زانی کەبەهۆی هێرشەکانی پێش 1988/4/15لەیەکتر دابڕابووین یان بڕیاری مانەوەیان دابوو. ڕێوشوینی یەکتر بینینمان لەگەڵیان داناو ماوەیەك سەرقاڵی یەکتربینین و ئاگادارکردنەوەی یەکتر بووین.

ئەوانەی مابوونەوە،جگە لەشەهید حەمە ڕەشو دەستەکەی بریتی بوون لە:

* کاك شێخ کەریمو شەهید سەید جەوهەرو چەند فەرماندەو پێشمەرگەیەك.

* شەهید مەلا ئەحمەد کەلاریو چەند پێشمەرگەیەك

* شەهید مەحمود مامە عەزەو کاك سدیق عەلی تۆفیقو چەند پێشمەرگەیەك.

* شەهید سەید محەمەدو کاك موکەڕەم ڕەشیدو چەند پێشمەرگەیەك.

* كاك عەدنان حەمەی میناو چەند پێشمەرگەیەك.

* شەهید ئەحمەد حاجی ڕەشیدو چەند پێشمەرگەیەك

* كاك مەلا سەعیدو چەند پێشمەرگەیەك

لەگەڵ شەهید ئەحمەد حاجی ڕەشیدو كاك مەلا سەعیدو ئەو پێشمەرگانەی كە لەگەڵیان بوون، یەكمان گرتەوەو بووین بەیەك دەستە. كاك مەلا سەعید لەهێرشی ئەنفالی سێدا لەدێی باوەكر بریندار ببوو، هێشتا چاك نەببووەوە.

* شەهید حەمە دوزیو چەند پێشمەرگەیەك

* شەهید ئازاد بەرغەشو شەهید جەلال حاجی جەبارو ئاسۆ

* شەهید ئەحمەد جوارشاخیو ماموستا عەلی زەنگەنە لەگەڵ ژمارەیەك پێشمەرگە لەحزبی شیوعی عێراق.

* مەفرەزەیەكی ئالای شۆڕش.

* چەند پێشمەرگەیەكی تاكو تەرای حزبەكانی تر.

* ژمارەیەكی زۆر پێشمەرگەی تری ی.ن.ك بەشێوەی دەستە پێكەوە بوون.

ئەودەستەو پێشمەرگانەش ناوم هێناون یان نەهێناون ببوون بەچەند بەشێك:

. هەندێكیان بەشێوازو ڕێگای جیاجیا ڕۆیشتن بۆ سنوری ناوچەكانی مەڵبەندی سێ (پاریزگای هەولێر)و بناری قەندیل كە هێشتا شالاوی ئەنفالی پێنەگەیشتبوو. وەكو شەهید حەمە دوزیو كاك ئەنوەر دۆلانیو كاك سالار عەبدولا، كاك شێخ تەهای سەنگاو، كاك عادل نادرو كاك ئەحمەدی برای، كاك رزگاری حاجی كائیل. كاك جەلال كەریم عیسی (م.جەلال)و كاك ئەكرەم كەریم عیسیو زۆری تریش.

. هەندێك لەناوچەچۆڵەكان یان شارو ئۆردوگاكان خۆیان شاردەوەوخۆیان پەنادا. تالێبووردنەگشتیەكەی1988/10/6.1988/9/6لەوكاتەداتەسلیم بوونەوە. ئەو پێشمەرگانەی كە بەناچاری تەسلیمی عێراق بوونەوە، چەند كەسێك نەبێت، ئەوانی

تر هیچ هاوکاریەکی دوژمنیاز نەکردو ئامادە نەبوون مل بۆ داواو فشارەکانیان کەچ بکەن،تەسلیم بوونەوەشیان بەهۆی تێکچوونی بارودۆخی شۆڕش‌و پێشمەرگایەتی پاش ئەنفالەکان بوو،حەزیان نەدەکرد تەسلیم ببنەوە . هەندێکیان بەپرس‌و ڕاو بڕیاری خۆمان تەسلیم بوونەوەو دواتر لەشارەوە پەیوەندییان لەگەڵ کردین. هەندێکیشیان لەپاش تەسلیم بوونەوە پەیوەندیان پێوەکردین‌و دواتر بەپێی توانا هاوکارمان بوون تا ڕاپەڕین.

. پاش کۆتاییهاتنی شاڵاوی ئەنفالی سێ ژمارەیەك پێشمەرگە ڕاستەوخۆ تەسلیم بوونەوە. بەشێکیان شەهیدو بێسەروشوێن کران، وەکو شەهید عەسکەر شێخانی‌و هاوڕێکانی، هەروەها کاك عومەرو کاك غەریب، هەردووکیان برای شەهید سیروان تاڵەبانی بوون، لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵیان بوون.

. هەندێکیشمان ماینەوە، ئەوانەش کە ماینەوە لەڕووی ماوەی مانەوە وەکو یەك نەبووین، چونکە دەستەو پێشمەرگەی وا هەبوو ساڵو دوو ساڵ یان زیاتر مایەوە، هی واش هەبوو چەند مانگێك مانەوە، لەپاشکۆکەدا ناوی دەستەو پێشمەرگەکان‌و ماوەی مانەوەو ڕۆیشتنیان بۆ ئێران یان کاتی هاتنەوەو ماوەی مانەوەیان‌و دوبارە گەڕانەوەیان بۆ ئێران‌و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە دروستبوون ڕوندەکەمەوە،ئەو ماوەیەی پاش ئەنفال تا ڕاپەڕینی بەهاری 1991 کە دەکاتە نزیکەی سێ ساڵ دەکریت پۆلینی بکەین بۆ 3 قۆناغ:

## قۆناغی یەکەم:



ئەم قۆناغە لە1988/4/15 دەستپێدەکات تا ڕۆژی 1988/10/6. لەم قۆناغەدا کە نزیکەی شەش مانگی خایاند ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە مابووینەوە، هەروەها

ژمارەیەکی تریش لەناوچەکانی ترەوە هاتنەوە بۆ لامان، جگە لەمەش کاك ئازادی سەگرمە لەگەڵ ژمارەیەك فەرماندەو کادرو پێشمەرگە،

لەڕۆژی1988/8/22داگەیشتنە سنووری گەرمیان.لەهەمانکاتدا کاك رۆستەمیش گەڕایەوە بۆسنوری کەرکوك. کاك ئازادی سەگرمەو کاك ڕۆستەم لەبناری قەندیلەوە بەئاگاداری‌و بڕیاری کاك نەوشیروان مستەفاو کاك ملازم عومەر هاتبوونەوە بۆ سنووری گەرمیان‌و کەرکوك بۆ سەرپەرشتی دەستەو پێشمەرگەکان. کاك ڕۆستەم پاش ماوەیەك مانەوە لەسنوری کەرکوك هات بۆ گەرمیان تا کاتی گەڕانەوەو ڕۆیشتنی بۆ ئێران لەگەڵ شەهیدحەمە ڕەش‌و کاك ئازادی سەگرمە پێکەوە بوون.

. لەم قۆناغەدا هێرش‌و گەڕان‌و کێومالکردنی دوژمن بۆ ناوچەکە زۆر بەرفراوان‌و گەورەو کاریگەر نەبوو. هەرچەندە لەو ماوەیەشدا چەند جارێك هێرش‌و کێوماڵ کردنیان ئەنجامداو لەچەند جێگایەك پێشمەرگەیان شەهیدکرد، وەك:

. لەمانگی 1988/7 لەناو باخەکانی چەمی هۆمەربل بەهۆی کەمینی جاشەوە جەمال حاجی مەدحەت (جەماله سور) شەهیدکرا

. لەدوو ڕووداوی جیاوازدا هەریەك لە کاك ئەحمەد حاجی محەمەد بەلەگەیی‌و کاك حەسیب گۆبانی (هەردوکیان کادری ڕیکخستن بوون) بەهۆی چەند خۆفرۆشیکی کوردەوە، لەداوخران‌و شەهید کران.

. لەنزیك هەردو گوندی خانی رۆستەم ئاغاو تاوسانە لەسەر چەمی ئاوەسپی ژمارەیەك پێشمەرگەی حزبی شیوعی عێراق شەهید کران.

پێش هاتنەوەی کاك ئازادی سەگرمە لەگەڵ شەهید حەمەڕەش ، شەهید مەلا ئەحمەد، شەهید مەحمود مامە عەزە،شەهید سەید جەوهەر،کاك عەدنان حەمەی مینا،کاك شێخ کەریم، کاك مەلا سەعیدو ....هتد

چەند جارێك كۆبوونەوەمان دەكرد، بەمەبەستی ڕێكخستنی ئیش‌و كارەكانی ئەو قۆناغەمان.یەك لەوكۆبوونەوانە 1988/6/8بوو،بڕیارو ڕاسپاردەی كۆبوونەوەكەمان بەبروسكەبەجیهازی ڕاكاڵ دایەكاك نەوشیروان مستەفاو وەڵامەكەشمان وەرگرتەوە، بەڕێز مام جەلال ئەوكاتە لەسەفەری ئەورووپا بوو. دەستەكان ڕۆژانە بەهۆی ئامێری بێسیمی بچووك پەیوەندیمان لەگەڵ یەكتر دەكرد. لەگەڵ سەركردایەتیش بەهۆی جیهازی ڕاكاڵەوە پەیوەندیمان دەكرد.

پاش هاتنەوەی كاك ئازادیش چەند جارێكیتر كۆبوونەوەمان كرد بۆ بڕیاردان‌و ئاگادار بوون لەكێشەو گیروگرفتە جیاجیاكانمان و چۆنیەتی چارەسەركردنیان. ئەو پێشمەرگانەی كە مابووینەوە پێشتر بەشێوەی ئارەزومەندانە بەسەر چەند دەستەیەكدا دابەش ببووین، بڕیارماندا ئەو شێوەیە وەكو خۆی بمێنیتەوە، هەر دەستەیەكیش لەسنورێكی دیاریكراودا بەپێی كەم‌و زۆری ژمارەی دەستەكە چەند جێگایەك بۆ خۆشاردنەوەو حەوانەوە بۆ هەموو وەرزەكانی ساڵ دروستبكات. هەروەها هەر دەستەیەك هەوڵی پەیدا كردنی چەند سەرچاوەیەك بدات بۆ دابینكردنی پێداویستیبە جۆراوجۆرەكانی ئەو سەردەمە

لەو كاتەدا كە ئێمە خەریكی خۆڕێكخستنەوەو ئامادەكاری بووین دەزگاو فەرمانگە ئەمنی‌و هەواڵگریەكانی عێراق پێیان وابوو ئەگەر لێبووردنێكی گشتی دەربكرێت، ئەوا هەموویان زۆرترین ئەو پێشمەرگانەی كە مابووینەوە، بەهۆی قورسی‌و سەختی ئەركەكانی ئەو قۆناغە، بەردەوام نابین‌و تەسلیم دەبینەوە، بۆیە لەڕۆژی 1988/9/6 بەبڕیاری ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆڕش لێبووردنی گشتییان دەركردو بۆ ماوەی یەك مانگ بەردەوام بوو تا ڕۆژی 1988/10/6. بەهۆی ئەو لێبووردنەوە ژمارەیەكی زۆر لەپێشمەرگەو ئەو خەڵكە تاك‌و تەرایانەش كە مابوونەوە تەسلیم بوونەوە.

پاش کۆتاییهاتنی ماوەی لێبووردنەکە بەهەمومان92پێشمەرگە ماینەوە.

لەدوای 1988/10/6 سوپای عێراقو ئەمنو ئیستخباراتو جاش بەپێی پلانێك بەپاڵپشتی هەلیکۆپتەر، چاودێریو سوسەکردن بەهۆی دەستەی زۆر بچوکەوە گەڕانو کێومالکردنی فراوانو بەردەوامیان دەستپێکرد.لەسەرەتایی هەڵمەتەکەیاندا ڕۆژی 1988/10/11 لەقولایی گەرمیان بەهۆی ژمارەیەك هەلیکۆپتەرەوە، پەلاماری شەهید حەمە ڕەشو کاك ئازادی سەگرمەو کاك ڕۆستەمو کۆمەڵی پێشمەرگەیاندا کە لەکاتی ڕۆیشتنو جوڵەدا بوون، ئەنجامی پەلامارەکە بووە هۆی شەهید کردنی سێ پێشمەرگە(شێرکۆ جدی، مهندس هەڵکەوت، شێرزاد عەریف رەمەزان)، کاك ئازادی سەگرمە بەسەختی بریندار بوو قاچێکیشی شکا، کاك تەهای برایوکاك سەرکەوتی یورزایوکاك سامال ڕەحیم کاکەولا بریندار بوون.

هەروەها ڕۆژی 1988/10/12 لە هردەی دوڕاجیخورماتو بەهۆی پەلاماری هەلیکۆپتەرەوە سێ پێشمەرگە شەهید بوون، کە ئەمانە بوون:

1. شەهید ئازاد عەبدولا برغش

2.شەهید جەلال جەبار ساڵح

3.شەهید تاهر عیبدولقادر محەمەد (ئاسۆ)

## قۆناغی دووەم: 

لەڕۆژی 1988 10/6 تا ڕۆژی 1990/8/2 ڕۆژی داگیرکردنی کوەیت لەلایەن لەشکری عێراقەوە. ئەم قۆناغە نزیکەی دو ساڵی خایاند، هەموو رویەکەوە قورسترینو دژوارترینو ناخۆشترین قۆناغی پارتیزانەکانی پاش ئەنفال بوو. هەموو ئەرکەکان لەبارودۆخێکی قورسو نالەبارو تاقەتپڕوکێندا ئەنجامدەدران، ڕۆژانە دوژمن لەگەڕانو پشکنینو سوڕانو کێومالکردندا بوو. بۆ هەموو شتێك ئاستەنگی

قورسمان لەبەردەمدا بوو تەنانەت بۆ پەیوەندی نێوان ئەو مەفرەزەو پێشمەرگانەش کە پێکەوە بووین، بۆیە زۆربەی کارو چالاکی و جوڵەمان بەشەوان بوو.ئەگەر وردەکارییەکانی باس بکرێت دەشێ بەچەند کتێبێك تەواو نەبێت. لەسەرەتای ئەم قۆناغەدا سەرەرای فشارو پەلاماری بەردەوامو کێومالکردنی رۆژانەو ئەو زیانە گەورەیەی کە رۆژانی 11و1988/10/12 لێیاندایین، بەشیکی تری کێشەکانمان بریتیبوون لە: . نەبوونی شارەزاییو تەجروبەی تەواو بۆ ئەو قۆناغە، کە پێویستی بەمیکانیزمی نویو ریۆشوێنی نویێ هەبوو، چونکە پێشتر تاقیکردنەوەیەکی لەو بابەتە لەمێژووی شۆرشی کوردو هیچ گەلێکی تردا نەبووە کە لەناوچەیەکی وێرانکراوو چۆلکراوی بێخەڵکدا خەباتی پارتیزانی بەرێوەببرێت.

. راهاتنوگوزەرانکردن لەچۆڵەوانیو دابران لەزۆربەی پێداویستییە سەرەکیەکانی ژیانی مرۆڤ ئەومرۆڤەش پێشمەرگەی پارتیزان بێت،دۆخیکی قورسوسەختی بۆمان دروستکردبوو.

. چۆنیەتی پەیوەندی گرتن لەگەڵ خەڵك،بەشیوەیەکی گشتی لەشارو ئۆردوگاکانو بەتایبەت لەگەڵ کەسانی سەر بەرێکخستنو ئەو کەسانەی کە ئەکرا هاوکارمان بن.

چۆنیەتی خۆشاردنەوەوخۆلادان لەهێزی دژمن وئەنجامدانی چالاکی سەربازی.

. چۆنیەتی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر بەرنامەو پلانو پەلاماری دوژمن.

. چۆنیەتی دابینکردنی پێداویستیە جۆراوجۆرەکانمان.

. چۆنیەتی جێگای شاردنەوەو حەوانەوەی بریندارو نەخۆش.

. هەڵگرتن و شاردنەوەی ئازوقەو چەكو فیشەك و كەلوپەل و پێداویستی تر.

چۆنیەتی بەکارهێنانی جیهازی بێتەلو دابینکردنی پاتری و پێداویستیەکانی.

. چۆنیەتی دابینکردنی دەرمان وکەرەستەی پزیشکی و پزیشك وچەندینی تر، بەڵام بەردەوام بووین وهەوڵماندا بەسەرکۆسپ و لەمپەرو ئاستەنگەکاندا زاڵ بین.



## قۆناغی سییەم

لەداگیرکردنی کوەیت لە1990/8/2 دەستپێدەکات تا راپەرینی بەهاری 1991. ئەم قۆناغە سەرەتای کەمبوونەوەی فشاری دوژمن‌و رەوینەوەی تەمومژو کرانەوەی گرێو ئاڵۆزیەکان بوو. دەکرێ ناوی بنێین قۆناغی ژیانەوەی هیواو چرۆکردنەوەی خەونەکانمان، خەونی رزگارکردنی خەڵك‌و خاکی کوردستان لەدوژمنی داگیرکەر.

چەند زانیارییەکی پێویست:

. ئەم نووسینە تەرخان کراوە بۆ باسکردنی چەند رۆژێك لەژیانی پارتیزانەکانی گەرمیان، کە بریتیە لەباسکردنی چۆنیەتی بڕیاری مانەوەو بەردەوامی، هەروەها تۆمارکردنی ناوی ئەو دەستەو پێشمەرگانەی کە بەشداری ئەو قۆناغەیان کرد.

تەنها باسی ئەو هەڵوێست‌و بڕیارانەم کردوە کە خۆم تێیدا بووم‌و ئاگادارم لێیان، ئەوەندەی بەڵگەو بیرەوەری یارمەتیان دابم هەوڵم داوە وەکو خۆی بیانگێڕمەوە. نوسین لەسەررۆژەکانی شاڵاوی ئەنفال و مانەوەی پێشمەرگە پارتیزانەکان‌و رۆڵ‌و دەوری رێکخستنی شارەکان‌و ئەو کەسانەی کە بەشێوازی جیاجیا هاوکاری دەستە پارتیزانەکانی پاش ئەنفال بوون،بابەتی وردو تێروتەسەل‌و هەمەلایەنەی پێویستە. چونکە ئەو قۆناغە تایبەتمەندێتی زۆری هەیەو سەدان کەس لەپێشمەرگەو ریکخستنی شارەکان و کەسانی تر بەشداریان تێدا کردوەو روداوو بەسەرهاتەکانی گرنگ و بایەخدارن. بۆ تەنها روداوێك لەتەنها یەك سەعات یان یەك رۆژدا رویداوە پێویستی بەباس‌و بابەتی تایبەتە بۆ نمونە:

1. روداوی هاوسەرو براو کوڕو پێشمەرگەیەکی شەهید مەحمودی مامە عەزە کە لەلایەن یەکێك لەپێشمەرگەکانی دەستەکەی شەهید مەحمودەوە خیانەتیان لێکراو لەیەکێك لەرۆژەکانی مانگی 1988/4 کە کاك مەحمودو کاك سدیق عەلی تۆفیق

لەو جێگایە نابن، ئەو خۆفرۆشە بەچەك پەلاماری خێزانەکەی کاك مەحمود دەداتو کوڕێكو برایەكو پێشمەرگەیەکی دەستەکەی شەهید مەحمود شەهید دەکات، هاوسەرەکەیو برازایەکیشی بەناوی کاك محەمەد حاجی فایەق بریندار دەکات. پاش ئەو خیانەتو کارەساتە، تاوانبارەکە تەسلیم بەدوژمن دەبێتو چاوساغی هێزی دوژمن دەکات بۆ جێگای ڕوداوەکە، دواتر کە شەهید مەحمودو کاك سدیق عەلی تۆفیقو هاوڕێکانی تریان دێنەوە بۆ جێگای ڕوداوەکە، بەهەزار دەردەسەری تەرمی شەهیدەکان دەشارنەوەو هەردو بریندارەکەش دەردەکەنو دواتر ڕەوانەی شاری دەربەندیخانیان دەکەن.

2. شەهیدبوونی سێ پێشمەرگەو بریندار بوونی کاك ئازادی سەگرمە بەسەختیو شکانی قاچێکی، بریندار بوونی سێ پێشمەرگەی تر لەڕۆژی 1988/10/11. دوای ئەوە نزیکەی 25 ڕۆژ کاك ئازادمان لەکونێکی بچوکدا بەناوی(کونە سوچەڕەکە) لەنزیك دێی مراوە (باوەنوور)، پێشتر کاك حەمە پاریاوڵە ئەو جێگایەی چاك کردبوو، شاردەوەو دواتریش لەسە ڕێگای کەلاردەربەندیخان لەدەواجنەکەی کاك حەمە وەلی، بەهۆی برادەرانی ڕێکخستنەوە بردرا بۆ سلێمانیو دواتریش بۆ بەغداد بۆچارەسەرکردنوناردنوبەڕێکردنی بۆ قاسمەڕەش.

3. روخانی ئەشکەوتی داری خلەو شەهید بوونی مەلا ئەحمەد کەلاریو 6 پێشمەرگەی تر لەئێوارەی 19لەسەر1989/2/20دا. پاش ئاگادارکردنەوەمان لەگەڵ شەهید حەمە ڕەشو کاك شێخ کەریم توانیمان دوای دو ڕۆژ بگەینە لای شەهید سەید محەمەدو پێشمەرگەکانی تری ئەو دەستەیەی کەروداوەکەیان بەسەرهاتبوو. لەکاتی گەیشتنمان بۆ لای ئەشکەوتەکە، نەماندەزانیو دڵنیا نەبووین ئایا شەهید مەلا ئەحمەدو هاوڕێکانی لەکاتی روخانی ئەشکەوتەکەدا یەکسەر شەهید بوون یان هێشتا هەمویان یان چەند کەسێکیان زیندون؟ ئەم

گومانەش کارەساتێکی تر بوو! ئەمانویست شتێك بکەین، بەهۆی نەبوونی بچوکترین کەرەستەو پێداویستیەوە نەماندەزانی چی لەو سەدان تەن گڵو خۆڵو بەردە بکەین کە ژیانو جەستەی هاوڕێکانمانی داپۆشیبوو؟

4. پلانی لەداوخستن و گیرانی شەهید سەیدمحەمەد لەشەوی7/31 لەسەر 1989/8/1 لەناو شاری کەلاردا لەلایەن ئەمنی عێراقەوە بەهاوکاری چەند خۆفرۆشێکی کوردو پاشان لە سێدارەدانی، لەڕۆژی 1991/1/17دا. سەید محەمەد یەکێك بووە لەڕەمزە ناسراوو دیارەکانی تێکۆشان، لەئەنفالی سێشدا هاوسەرەکەیو هەموو منداڵەکانی ئەنفال کران.

5. لەپایزی 1990دا منو کاك ڕەئیسی قەرەداغ لەنێوان هەردو گوندی کاکە براو عەلیانی کۆن (تەنها هەردوکمان بووینو لەهاوڕێکانمان دور بووین)، سەر لەئێوارە بوو بەڕێگادا دەڕۆیشتین، کاك ڕەئیس مارێك پێوەی دا، دەبوو بەناچاری من دەوری برینپێچ ببینم. لەکاتیکدا دەرزی لێدانیشم نەدەزانی، بەڵام ئەو ڕۆژە بەناچاری بووم بەبرینپێچو کاری برینپێچیم ئەنجامدا.ئەمانەو چەندین ڕوداوو بەسەرهاتی ناخۆشو یادەوەری تفتو تاڵ! بەڵام لەو سەردەمەدا سەرەڕای ئەو ناخۆشیو مەترسیانەی کە لەسەر ژیانمان بوو، دڵخۆشو ورەبەرزو هاوڕێی ڕاستەقینەی یەکتر بووین، نەك وەکو ئێستا!لەم نوسینەکورتەداناکرێت بچینە ناو ئەو هەموو بابەتو بەسەرهاتو وردەکاریانەوە، لەو سۆنگەیەوە خۆم لەقەرەی ئەو بابەتانەو زۆر بابەتی تر نەداوە.

. کە باسی مانەوەی دەستە پارتیزانەکانی پاش ئەنفال دەکەین، کەسانیك هەبوون ماوەیەکی زۆر کورت مانەوەو دواتر زۆربەیان بەهۆی ناچاریەوە تەسلیم بوونەوەو ژمارەیەکیشیان بەڕێگای جیاجیا ڕۆیشتن بۆ ئەو ناوچانەی کە هێشتا ئەنفال نەکرابوون، ژمارەی هەردوو بەشەکە زۆرنو ناوەکانیش لەبەردەستدا نین، بۆیە

تەنها ناوی ئەو دەستەو پێشمەرگانە دەنووسین کە پاش تەواو بوونی لێبووردنی گشتی لە1988/10/6دا مانەوە، ئەوانەش کە مانەوە، ماوەی مانەوەیان وەکو یەك نییەو ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دەهات، لەپاشکۆکەدا بەوردی رونی دەکەمەوە.

. ئەرکی پەیوەندیو دابینکردنی پێداویستی دەستە پارتیزانەکان بەبڕیاری کاك نەوشیروان مستەفا روبەڕوی ڕێکخراوی شاری کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کرایەوە، ڕێکخراویش بۆ ئەو جێگایانەی کە پێویست بوو، ئەرکی ڕاپەڕاندنی ئەو کارەی بەژمارەیەك کادروئەندامی ڕێکخستن سپارد.ئەوهاوڕێیانەش کەئەم ئەرکەیان کەوتە ئەستۆ زۆر جوامێرانەو نەترسانە شانیان دایە بەرو لەو دۆخە دژوارەی ساڵەکانی 1990.1989.1988دا کە دوژمنی داگیرکەر لەوپەڕی مەغروریدا بوو، لەلایەن دائیرەکانی ئەمنو ئیستخباراتو هی ترەوە بەهۆی دەیانو سەدان جاسوسەوە چاودێری خەباتکەرو تێکۆشەرەکانی شار دەکرا، بەڵام سەرەڕای ئەو دۆخە قورسە ئەو هاوڕێیانە کاری بێوێنەیان ئەنجامداو لەسلێمانی، شارەزور، دەربەندیخان، کەلار و کفری و چەند جێگایەکی تریش......ڕێوشوێنی چۆنیەتی پەیوەندی و یەکتربینینمان لەگەڵیان ڕێکخست، ئەمەش بابەتێکی تایبەتە لەم نوسینەدا کورتەدا ناتوانین بچینە ناو وردەکاریەکانی ئەم بابەتەو باسکردنی ناوەکان، هەروەها لەدەرەوەی هاوڕێیانی ڕێکخستن، چەندین کەسی تر لەو جێگایانەی کە باسمان کردنو جێگای تری وەکو چەمچەماڵ، خورماتو، ناحیەی سەرقەڵا، ئۆردوگای صمود (ڕزگاری)، باوەنوور...هتد،بەهۆی هەستی نەتەوایەتیو پەیوەندی ناسیاویو دۆستایەتیو خزمایەتی لەپێشمەرگەکۆنەکان ، ڕێکخستنە دابڕاوەکان ، کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان و کەسانی تریش بوون بەهاوکارو پشتیوانی دەستە پارتیزانەکان. لەناو ئەمانەدا چەند کەسێکیان لەلایەن

دوژمنەوە ئاشکرا کرانو دوچاری راوەدونانو خۆشاردنەوە کران، دو کەسیشیان گیرانو شەهید کران.

1. شەهید سەعید وەلی رەشید

2. شەهید جەبار محەمەد رەسوڵ

هەردووکیان سەر لەئێوارەی 1989/2/9 لە لایەن ئیستخباراتەوە گیرانو پاشان شەهیدو بێسەروشوێن کران. پێشتریش چەند کادرو ئەندامێکی رێکخستن لە کفریو کەلار کەوتنە بەردەم مەترسیو حاڵەتی خۆشاردنەوەو ناسنامە گۆڕین.

لەچەمچەماڵیش چەند کەسێك کە پەیوەندیان لەگەڵ شەهید سەید جەوهەر هەبوو، بەهۆی ئەنجامدانی چالاکییەکەوە لەمانگی 1990/10دا ئاشکرا بوونو دوچاری گرتنو راوەدونان بوون:

1. کاك حەمە تەپەدبێ (لەرۆژی 1990/10/28 گیراو دواتر حوکمی ئەبەدی درا)

2. کاك شێرزادخاڵۆبازیانیو کاك رەشیدمۆفەری،بەرێگای شاردا رۆیشتن بۆ ئێران

3. کاك مستەفا حاجی مەولود، رۆیشتە لای دەستەکەی شەهید سەید جەوهەر

لەکۆتایی 1989دا بریار درا لەشارو ئۆردوگاکان هێزێکی چەکدار دروستبکرێت بەناوی سوپای رزگاری کوردستان (سرك) لەپێشمەرگەی دێرینو رێکخسنەکانو کەسانی تر. بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی لەگەڵ ژمارەیەك کەسی گونجاو کرا، ئامادە بوونو بەشداریان تێدا کرد (ئەمەش بابەتێکی تایبەتی تری پاش ئەنفالەکانە

* لە کۆتایی تەمموزی 2015 لەچەند بەشێکدا لەرۆژنامەی ئاوێنە



# ژاراوی کردنی کانیاوەکان

ڕژێمی بەعس دوابەدوای وێرانکردنی سەرجەم گوندو شارەدێیەکانی گەرمیان بەمەبەستی بەتەواوی بنەبڕکردنی سەرجەم بنەماکانی ژیان شالاَوێکی بەرفراوانی نامرۆیانەی بەرپاکرد. بۆئەو مەبەستە بەشێك لەکانیاو و سەرچاوەکانی ئاوی لەڕێگەی بەکرێگیراوەکانیەوە ژەهراویکرد،دەرئەنجام بەهۆی ئەو ژەهرەوە نەك تەنیا چەند پێشمەرگەیەك لەدەستەی پارتیزانەکان کە لەو ناوچانەدا مابونەوەو لەڕێگەی بەکارهێنانی ئاوی کانیاوەکانەوە ژەهرخوارد بون،بەڵکو بەهەزاران پەلەوەرو ئاژەڵو دارو درەختو ڕوەکەکانیش کەوتنە بەر شالاَوی ئەو ژەهرەوەو لەناوچوون.

کاك ڕەیسودەستەکەی پاش ئەوەی لەئێرانەوە لە مانگی ٧. ١٩٩٠ دا،بەڕێکەوتبون تا بەرێگای شاربازێڕدا بگەنە قەرەداغ، لەساتەوەختی تێپەڕبونو گەیشتنیان بۆ بناری شارەزور، لەنێوان هەردو دێی شەممەو وێڵەکە، لەسەر کارێزێك پشو دەدەنو لەئاوی کارێزەکە دەخۆنەوە، بەلاَم بەهۆی ئەوەی کە ئەو کارێزە یەکێك بو لەو سەرچاوانەی کە ژەهراوی کرابو، بۆیە پاش خواردنەوەی ئاوی کارێزەکە کاك ڕەیسو سێ پێشمەرگەی تر ژەهراوی دەبن. دەرئەنجام یەکێك لەپێشمەرگەکان بەناوی سدیق قڕگەبی پاش چەند کاتژمێرێك شەهید دەبێت، ئەوانی تریش بەتەواوی تەندروستیان تێکدەچێت، ئەوەش بو بەهۆی ئەوەی بەناچاری ماوەیەك لەیەکتر دابڕێنو پەیوەندیشیان لەگەڵ ئێمە بپچرێت.

دەستەکەی کاك ڕەیس بریتی بون لەم ناوانەی خوارەوە:

١. سامان سەعید عەلی. ناسراو بە(ڕەیس) یەکێك لەژەهراوی بوەکان.

٢. شەهید سدیق عبدالکریم مستەفا(سدیق قڕگەیی) پاش ژەهراوی بون شەهیدبو.

٣. بەهادین مەجید محەمەد،دوای ژەهراوی بونی توانای ڕۆیشتنی نامێنێو بەناچاری لەجێگایەکی پەنا دایدەنێن، دوای ئەوەی کاك ڕەیسو شەهید فەریق بەنهێنیو بەئامانجی چارەسەر خۆیان دەگەیەننە شاری سلێمانی، کەسو کاری بەهادین ئاگادار دەکەنەوە، پاشان ئەوانیش دەچن بەهادین دەبەنەوە بۆ سلێمانیو

چارەسەری بۆ دەکەن بەڵام سەرەڕای ئەوەش کاك بەهادین بەهۆی کاریگەری ژەهرەکەوە کەمئەندام بوو.

٤. شەهید فەریق ئەحمەد ئەحمەد، ناسراو بە(فەریقە سوور).

٥. عەدالەت رەفعەت عەبدولقادر،بەڕیوەبەری بەڕیوەبەرایەتی کەمئەندامانی سەنگەرە لەسەر میلاکی وەزارەتی پێشمەرگە.

٦. عوسمان حەسەن محەمەد، ناسراو بە(عوسمان بێرەشکەیی)

لەوکاتەدا دەڕوات بۆ شارو لەوێ مابووەوە، پێشمەرگەی خانەنشینە.

لەگەڵ دەستەکەی کاك رەیس پێنج پێشمەرگە هاتبونەوە بۆ ئەوەی بێنە لای دەستەکەی ئێمە، کە بریتی بون لەم ناوانەی خوارەوە:

١. ئەحمەدساڵح گورجی،ناسراو بە(ئەحمەد زەرداوی) یەکێك بو لەژەهراویبوەکان، کاك ڕەیس لەگەڵ شوانێك دەینێرێت بۆ ئۆردوگای باریکەو پاشان دەچێت بۆ سمود(ناحیەی رزگاری) سەر بەقەزای کەلار. کاك ئەحمەد زەرداوی دوای وەرگرتنی چارەسەرو چاکبونەوەی باری تەندروستی لەشار مایەوە، (ئەوکاتە نامەیەکی بۆ ناردم کە تێیدا باسی چۆنیەتی ژەهراویبونو چونە شارو هۆکاری مانەوەکەی دەکات، نامەکەم لای خۆم پاراستوە).

٢. ئەحمەدحەسەن نوری،ناسراوبە(ئەحمەدەسور)بەهۆی ڕوداوی ژەهراویبونەکەوە چوبوە شارو دوای ئاگادار کردنەوەمان لەشار مایەوە. ئەفسەرە لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ بەپلەی مقەدەم.

٣. جەلیل رەئوف رەشید، ناسراو بە(جەلیل کۆکسی) ئەفسەرە بەپلەی عەمید لەسەر میلاکی ئاسایشی گەرمیان.

٤. عوسمان جەمیل ساڵح، ناسراو بە(عوسمان مەلا جەمیل).

٥. مەجید عومەر عوسمان، ناسراو بە(مەجید کادر) خانەنشینە بەپلەی عەقید.

لەپاش ڕوداوی ژەهراویبونەکە، هەریەك لەکاك جەلیل، کاك عوسمان، کاك مەجید. لەگەڵ کاك عەدالەت رەفعەت عەبدولقادر کە پێشمەرگەی دەستەکەی کاك رەیس بو هاتن بۆ گەرمیانو گەیشتنە لای ئێمە.

کاك رەیس چەند ڕۆژێك لەشاری سلێمانی مایەوە، بەڵام پاش چاکبونەوەی لەگەڵ شەهید فەریقە سور گەڕانەوە بۆ لای ئێمە لەگەرمیانو پێکەوە بوین هەتا مانگی ١٠. ١٩٩٠، دواتر لەگەڵ شەهید شاهۆو کاك عەدالەت گەڕانەوە بۆ ناوچەی قەرەداغو لەوێ مانەوە هەتا ڕاپەڕین.

لەکۆتایی مانگی ٧ سالی ١٩٩٠، ئەم پێشمەرگانە بەڕێگەی شاربازێڕدا بەمەبەستی پشودان بەرەو ئێران بەڕێکەوتن:

١. شەهید محەمەد حسێن سلێمان، ناسراو بە(شەهید حەمە ئاخە)

٢. شەهید ساڵح محەمەد حسێن، ناسراو بە(کاکە توکنی)

٣. جمعە مەجید ئەحمەد، ناسراو بە(جومعە مەجید داودی)

٤. فائق تۆفیق فەرەج، ناسراو بە(فایەق کەلاری)

لەمانگی ٩. ١٩٩٠، کاك جوامێر ئەحمەد مەحمودو لەمانگی ١١ی هەمانساڵدا، کاك هادی ئەحمەد مەحمود کە هەردوکیان برای شەهید شاهۆ بون هاتنە لای ئێمەو بون بەپێشمەرگە. شایانی باسە کاك هادیو برایەکی تری بەناوی کاك عەتا لەڕاپەڕینی ١٩٩١دا لەخانەقین پێکەوە شەهید بون.

لەسەرەتای مانگی١٢ی ١٩٩٠چەند پێشمەرگەیەکی تربەمەبەستی پشودان بەڕێگای شاربازێڕەوە بەرەو ئێران بەڕێکەوتن، ئەوانیش بریتی بون لەم ناوانەی خوارەوە:

١. شەهید هەڵکەوت ئەحمەد غیدان

٢. شەهید دکتۆر ئاتیلا سەعدوڵا خەلیل

٣. نەوشیروان حاجی ئەحمەد

٤. عەباس محەمەد ئەمین، (ملازم عەباس) پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا.

٥. مەجید عومەر عوسمان، ناسراو بە(مەجید کادر).

لەم پاشکۆیەدا باسی چۆنیەتی هاتنەوەو ڕۆیشتنەوەی دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکانمان کردوە لەنێوان گەرمیانو ئێراندا. لەوکاتەدا بەتایبەت لەقۆناغی یەکەمو دوەم،ڕێگای هاتنو ڕۆیشتنمان لەناوچەی شاربازێڕوشاخی سورێنەوە بوو،

لەو بوارەدا چەند فەرماندەو کادرو پێشمەرگەیەك کە شارەزاو چاوساغی ناوچەکان بون،ڕۆڵی ئازایانەیان دەبینیو زۆر ماندودەبون کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکیانن:

١. شەهیدبەکر عەلی قادر محەمەد(خاڵە بەکر)،لە ١٩٩٧ لەشەڕی ناوخۆ شەهید بو.

٢. شەهید ڕەئوف سابیر سەعید، ناسراو بە(مام ڕەئوف)

لەپایزی ١٩٨٩ لەئێران بەهۆی تەقینەوەی ڕومانەیەکەوە شەهید بوو.

٣. شەهیدفازڵ عەبدوڵا فەرەج(فازڵ شیرەمەڕی) لە١٩٩٧ لەشەڕی ناوخۆشەهیدبوو.

٤. خوالێخۆشبو عەبدوڵا قادر حەمەلاو، ناسراو بە(عەبە ڕەق) لەڕۆژی ١٣.١.٢٠١٣ بەڕوداوی ئۆتۆمۆبێل کۆچی دوایی کرد.

٥. شەهید بەکرڕەسوڵ حەسەن(مەلابەکر)ساڵی ١٩٩٧لەشەڕی ناوخۆدا شەهیدبوو.

6ـدلاوەر عوسمان ناسراو بە(دلاوەرە درێژ)، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا.

7. محەمەد ڕۆستەم محەمەد، ناسراو بە(حەمە سیاسی)، ئەفسەرە بەپلەی لیوا لەسەر میلاکی وەزارەتی پێشمەرگە.

8. کامیل نوری محەمەد ئەمین، لەڕاپەڕینی ١٩٩١ لەگوندی چیمەن نزیك کەرکوك بەسەختی بریندار بو، بەوهۆیەوە قاچێکی لەدەستدا. پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا لەسەر میلاکی کەمئەندامانی سەنگەر.

9. جەلال محەمەد عەلی، ناسراو بە(جەلال سیرەمێرگی) پێشمەرگەی خانەنشێنە بەپلەی لیوا لەسەر کەمئەندامانی سەنگەر.

10. جەزا حسێن ساڵح، (جەزا پوشێنی) پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عەمید.

11. کە مال سادق قادر، ناسراو بە(کەماڵە خڕە).

12. ناجی حاجی محەمەد عەزیز، ناسراو بە(مام ناجی). پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا لەسەر میلاکی کەمئەندامانی سەنگەر.

١٣. نەوزاد محەمەد غەفور، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عقید.

١٤. هوشیار عەلی عەبدولحەسەن، ناسراو بە(هوشیار بیاوێڵەیی) پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا لەسەر میلاکی کەمئەندامانی سەنگەر.

١٥. جەلال مستەفا قادر محەمەد(هێرش بچکۆل) خانەنشینە بەپلەی عەقید.

١٦. سۆران حامد ڕەحیم سەعید، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی ڕائید.

**قۆناغی سێ یەم.. داگیرکردنی کوێتو سەرەتای قۆناغێکی نوێ..**

ڕۆژی ٣. ٨. ١٩٩٠ سوپای عێراق هێرشی کردە سەر کوێتو داگیری کرد. ئەو کارەی ڕژێمی بەعس کە ڕوداوێکی گەورەی ئەو سەردەمە بو، دەنگدانەوەی گەورەو کاردانەوەی نێودەوڵەتیو ناوچەکەی لێکەوتەوە. کاریگەریەکانی داگیرکردنی کوێت ئاسۆیەکی گەشی بۆ گەلەکەمان هێنایە کایەوە، چونکە بۆ هەموان ڕون بو کە سەدام بەو کارەی کێشەیەکی قوڵی بۆ خۆیو ڕژێمەکەی خولقاندوەو ناتوانێت بەئاسانی لێی دەرباز بێت. داگیرکردنی کوێت لەلایەن سوپاکەی سەدامەوە ئومێدێکی گەورەی بەجوڵانەوەی سیاسی کورد بەخشی، دواتر وەك ئەوەی کە پێشبینی دەکرا، داگیرکردنی کوێت بو بەهۆی هاتنە کایەی قۆناغێکی نوێ بۆ عێراق بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی. لەلایەن دەوڵەتانو چاودێرانی سیاسی، هەروەها لەلایەن حزبو هێزە سیاسیەکانی کوردستانەوە شیکاریو پێشبینی ئەوە دەکرا کە لەناوچەکەدا گۆڕانکاری ڕیشەیی ڕوئەدات، بۆیە هیوای زۆرمان بەئاکامەکانی ئەو ڕوداوە هەبو. ئیتر ڕاستەوخۆ زۆربەی هێزو لایەنە سیاسیەکان کەوتنە خۆسازدان بۆ سودوەرگرتن لەو دەرفەتەی کە چاوەڕوان دەکرا بەهۆی دەرهاویشتەی ڕوداوەکە بێتە کایەوە، لەبەرئەوە یەکێتی نیشتیمانی کوردستانو پارتی دیموکراتی کوردستانو پارتە سیاسیەکانی تری ناو بەرەی کوردستانی، کەوتنە کۆبونەوەو کاری هاوبەشو دانانی بەرنامە بەئامانجی خۆسازدانو ئامادەکاری بۆ قۆستنەوەی هەر دەرفەتو ئەگەرێك. سەرجەم لایەنەکان بەوریاییەوە چاودێری هەلومەرجەکەو ئاڕاستەی ڕوداوەکانمان دەکرد. پێشبینیەکان بۆ گۆڕانکاری لەتای تەرازوی هێزدا هاتبوە ئاراوە، لەو ڕوەوە چەند ئەگەرێك لەلایەن سەرکردایەتی لەبەرچاو گیرابو، کە بەپێی قەبارەو تواناکانی ئەوکاتە بەرنامە بۆ هەر ئەگەرێك دانرابو. لەو چوارچێوەیەدا سەرکردایەتی ی.ن.ك، بۆ خۆئامادەکردن بڕیاریدا ژمارەی دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکان زیاد بکات، جگە لەوەش پێشمەرگە بۆ ناوچەکانی تریش ڕەوانە بکات. لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەیەدا، ژمارەیەك کادیرو فەرماندەو پێشمەرگە لەمانگی ١١و ١٢. ١٩٩٠ بەڕێگای تەپەڕەش

تیلەکۆدا، کە سەر بەقەسری شیرینە لەئێران، بەسەرپەرشتی شەهید حەمە ڕەش بەدو وەجبە گەڕانەوە بۆ گەرمیان. ئێرانیش لەو کاتەدا وەك دوژمنێکی سەرسەختی ڕژێمی عێراق کەوتە خۆیو هەوڵی ئەدا سود لەو دەرفەتە وەربگرێت، لەو سۆنگەیەوە ئێمەو ئێران بەرژەوەندی هاوبەشمان لەو بارودۆخە نوێیەدا هەبو، لەبەرئەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەو بەرنامانەی کە دانرابون، ئێران کارئاسانی بۆ هێزو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان دەکرد.

هاوکات لەو سەردەمە هێزی دوژمن بەرەبەرە توشی شپرزەییو پەرتەوازەیی دەبونو هەلومەرجەکە بەرەو ئەوە دەچو کە ڕژێم لەسەر ناوچە سنوریەکانو جێگاکانی تری کوردستان تواناى کۆنترۆڵکردنی ئەمنیو سەربازی لاواز بێت، چونکە ڕژێمی عێراق بەشێکی زۆری سوپاکەی لەکوردستانەوە کشاندەوە بۆ باشوری عێراق. دەستەو پێشمەرگە پارتیزانەکان بەبڕیارو ڕێنمایی سەرکردایەتی لەو ماوەیەدا. ئەرکی سەرەکیو کاری ئەو قۆناغەمان بەهەماهەنگیو هاوبەشی لەگەڵ ڕێکخستنی شارەکانو پێشمەرگە دێرینەکانو کەسانی تری نیشتیمان پەروەر، هەوڵدان بو بۆ ئامادەکاریو سازدانی جەماوەر..

لەڕویەکیترەوە بەمەبەستی فراوانکردنی تۆڕی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ هەمو هێزە سیاسیەکانو پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی کوردستان، بەئامانجی زەمینەسازیو ئامادەکاری بۆ ئەگەری ڕاپەڕین کەوتینە جوڵەو کاری چڕوپڕ، هەرچەندە باسکردنی سەرهەڵدانی ڕاپەڕین لەدوای ئەو هەمو کارەساتەی ئەنفالو کیمیابارانو جینۆسایدکردنی کوردستان کارێکی ئاسانو بێ کێشەو گیروگرفت نەبو، بەڵام خێرایی بەرەو پێشچونی ڕوداوەکانو قوڵبونەوەی کێشەکانی عێراقو ناوچەکە لەلایەکەوە، تورەییو بێزاری خەڵکی کوردستانو عێراق لەڕەفتارە نامرۆییەکانی ڕژێمی بەعس لەلایەکی ترەوە، هاندەر بون بۆ ئەوەی کارەکانمان دەرئەنجامی خێراو دەسکەوتی باشیان هەبێت. لێکدانەوەکان بەو ئاراستەیە بون کە لەکاتی هێرشی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی لەدژی سوپای عێراق، ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستانو گەلانی عێراق یەکێك دەبێت لەئەگەرە بەهێزەکان..

پاش داگیرکردنی کوێت یەکێك لەدەسکەوتەکان کەمبونەوەی فشاری سوپای عێراقو بەکرێگیراوەکانی بوو. بەوەش زەمینەیەکی لەبارو گونجاو ڕەخسا بۆ کارو جوڵەی دەستە پارتیزانەکان. بەوهۆیەوە کاك حەمە ڕەشو ئەو هێزەی کە لەگەڵی هاتن، توانیان لەسەر سنوری ئێرانەوە لەگەڵ خۆیاندا، بەباری وڵاخ بەشی ماوەیەك ئازوقەو پێداویستی تر بهێنن. ئەو پێشمەرگانەی کە لەئێرانەوە بەسەرپەرشتی شەهید حەمەڕەش هاتنەوە بۆ گەرمیان بریتی بون لە:

١. شەهید حەمەڕەش.

٢. شەهید خەلیل عەبدوڵا محەمەد ئەمین، ناسراو بە(خەلیل بیکەیسی). لە ٢٥. ٧. ١٩٩٥ لە شەڕی ناوخۆدا شەهید بو.

٣. شەهید نەجات نەجم غەریب، ناسراو بە(نەجات گەڕەچیا) لەمانگی ٥. ١٩٩٤ لەشەڕی ناوخۆدا شەهید بو.

٤. شەهید محەمەد حسێن سلێمان، ناسراو بە(حەمە ئاخە).

٥. شەهید ئەحمەد ڕەشید عەباس، ناسراو بە(ئەحمەد حاجی ڕەشید).

٦. شەهید عەلی سەمین محەمەد ئەمین، ناسراو بە(عەلی سور) لەساڵی ٢٠٠٧ لەکفری شەهید بو. دو براو خوشکێکی ئەنفال کران.

٧. شەهید سابر نەجم سابر، ناسراو بە(مام سابر) لەڕاپەڕینەکەی مانگی ٣. ١٩٩١ لەکفری شەهید بو.

٨. شەهید عەلی حەمەساڵح قادر، ناسراو بە(عەلی سوری زەماوەنگە) لەمانگی ١٢. ١٩٩٣ لەشەڕی ناوخۆدا لەکەلار شەهید بو.

٩. شەهید خەتاب حەسەن حسێن ناسراو بە(خەباتە سور).

١٠. شەهید خەلیل ئیبراهیم مستەفا، ناسراو بە(هەژاری ئاسایش).

١١. شەهید کریم محەمەد کەریم، ناسراو بە(شێخ کەریمی باخ) لەڕاپەڕینەکەی مانگی ٣. ١٩٩١ لەئەمنە سورەکەی سلێمانی شەهید بو.

١٢. شەهید سەرحەد عومەر حەمەساڵح، ناسراو بە(سەرحەد دۆڵانی).

١٣. شەهیدسەباح فەتاح قادر،لەساڵی ١٩٩١بەهۆی تەقینەوەی مینەوە شەهیدبوو.

١٤. شەهید کامەران محەمەد سەعید، ناسراو بە(کامەران هۆمەربلی).

١٥. شەهید نادر مەجید جوامێر.

١٦. شەهید سەید بابا محەمەد سەعید، ناسراو بە(سەید بابا).

١٧. شەهید سەلاح محەمەد کەریم، ناسراو بە(سەلاحە بچکۆل)، لەساڵی ١٩٩٤ لەشەڕی ناوخۆدا شەهید بو.

١٨. جەلال کەریم عیسا،ناسراو بە(م.جەلال)ن ئێستا بریکاری وەزارەتی ناوخۆیە.

١٩. ئاوات جەناب نوری، ناسراو بە(ئاواتی شێخ جەناب)، ئەندامی جڤاتی نیشتیمانی بزوتنەوەی گۆڕان.

٢٠. سەلاح محەمەد فەرەج، (سەلاح کوێخا)، سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان.

٢١. ئەحمەد سالح، (مەلا ئەحمەد جەیران)، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی لیوا.

٢٢. لەتیف بابا رەسول رچا، ناسراو بە(شێخ لەتیف)، ئێستا ئەفسەرە لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ بەپلەی عەمید.

٢٣. نازم شەریف محەمەد، ناسراو بە(نازمی وەستا شەریف)، ئەفسەرە بە پلەی عەمید لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆی عێراق.

٢٤. رەمەزان محەمەد عەلی، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عەقید.

٢٥. محەمەد عەبدولڕحمان محەمەد(حەمە پاریاوڵە) خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٢٦. شکور محەمەد سلێمان، ناسراو بە(شکور قەرەبلاغی) ئەفسەرە بەپلەی عەمید لەسەر میلاکی ئاسایش.

٢٧. ئاری رەئوف سابر، ناسراو بە(ئاری رەئوف بێگەرد).

٢٨. جومعە مەجید ئەحمەد، ناسراو بە(جومعە داودی) خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٢٩. فایەق تۆفیق فەرەج، ناسراو بە(فایەق کەلاری)، خانەنشینە بەپلەی مقەدەم.

٣٠. تۆفیق رەشید. پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٣١. عارف عەزیز مارف، ناسراو بە(عارف گۆمەزەردی)، خانەنشینە بەپلەی مقەدەم.

٣٢. حەسەن حەمید کەریم، (حەسەن کوڵەجۆیی) خانەنشینە بەپلەی مقەدەم.

٣٣. حەسەن عەلی خەلیل. ناسراو بە(حەسەن کوڵەجۆیید زەنگاباد)، ئەفسەرە بەپلەی عەمید لەسەر میلاکی هێزەکانی ٧٠.

٣٤. عومەر ئەحمەد محەمەد (عومەر چەوساوە) خانەنشینە بەپلەی مقەدەم.

٣٥. هیدایەت حەسەن لفتە. ناسراو بە(هیدایەت هۆمەربلی)، بەپلەی مفەوەز لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆی عێراقە.

٣٦. سەیوان غازی سالار،ئەفسەرە بەپلەی عەمید لەسەرمیلاکی ئاسایشی گەرمیان.

٣٧. سەلام حەمید ئەحمەد. ناسراو بە(سەلام کۆیی)، مفەوەزی پۆلیسە لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ

٣٨. مکەرەم رەشید برزۆ.

٣٩. هەژار محەمەد سالح. پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٤٠. عەلی نوری دەروێش. ناسراو بە(عەلی هۆمەربلی)، بۆ ماوەیەکی کەم تەسلیم بوەوە، پاشان گەڕایەوە بو ناو پێشمەرگە. پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی مقەدەم.

٤١. عەبدولاّ تەیب نوری. ناسراو بە(شێخ عەبدولاّ) شارەزای ناوچەکەو شارەزای دروستکردنی کەڵەك بو بۆ پەڕینەوە لەئاوی سیروان. چوار کچو دو کوڕی ئەنفال کران، پێشمەرگەی خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٤٢. بەهائەدین محەمەد ئەحمەد(بەهادینی داربەڕو) خانەنشینە بەپلەی عەقید.

٤٣. رەحمان رەشید محەمەد، ناسراو بە(رەحمان مەلا ڕەشید)، دەرچوی کۆلێژی پزیشکەو کاری پزیشکی دەکات.

٤٤. لوقمان عەزیز کەریم. ناسراو بە(لوقمان چاوڕەش)، ئەفسەرە بەپلەی مقەدەم لەسەر میلاکی وەزارەتی پێشمەرگە.

٤٥. محەمەد مەجید، ناسراو بە(حەمەی حاجی مەجید) خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٤٦. جەلال حەسەن فەرەج. ناسراو بە(جەلال شەمەیی) خانەنشینە بەپلەی عەمید.

٤٧. حەسەن ئەحمەد عەبدولڕەحمان، ناسراو بە(د.حەسەن کانی ڕۆشنایی).

٤٨. جەلال عەلی قادر، ناسراو بە(جەلال قولیجانی) خانەنشینە بەپلەی عەقید.

٤٩. ئازاد حەسەن تۆفیق، ناسراو بە(ئازاد بان سنوقی)، لەمانگی ١. ١٩٩٠ تەسلیم بوەوەو ئێستا لەولاتی ئەلمانیا نیشتەجێیە.

هەندێك لەم کادیروفەرماندەو پێشمەرگانەرۆیشتن بۆقەرەداغ و دەوروبەری سلێمانی لەگەڵ دەستەکەی کاك رەئیس یەکیانگرتەوەو کاریان دەکرد بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی راپەرین:

١. ئاوات شێخ جەناب

٢. مامۆستا جەلال شێخ کەریم

٣. شەهید شێخ کەریمی باخ

٤.شەهید سەرحەد عومەر سالح

٥. لوقمان عەزیز کەریم (لوقمان چاورەش).

٦. جەلال شەمەیی

٧. شەهید سەلاح حەمە کەریم

٨. حەسەن ئەحمەد عەبدولرەحمان، ناسراو بە(د.حەسەن)

* http://peshmargamedia.com/Detail

# ڕێکخستنەوەی دەستەپارتیزانەکان



**بەپێی بیرەوەری کاک عوسمانی حاجی مەحموود**

**1 ـ دەستەی کاک ئازادی سەگرمەو مام ڕۆستەم**

1. کاک ئازادی سەگرمە خانەنشین
2. کاک ڕۆستەم. (ئەندام پەرلەمانی خانەنشینە)
3. کاک شێخ مەحمود عەبدولصەمەد حەمەخان(شێخ مەحموددرێژ
ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینەو ماڵی لەکەرکوکە.
4. ئەردەڵێن عەلی نادر(شەهیدئەردەڵێن) مانگی1988/11تەسلیم بووەوە.
5. شەهید مەریوان سلێمان ئەمین( مەریوان هەمەوەندی)
6. شەهید عەبدولڕەحمان محەمەد شەریف (شەهید ڕەئیس چەمچەماڵ)
مانگی 1988/11 تەسلیم بووەوە،لەڕاپەڕینی 1991 لەبان مەقان شەهید بوو.
7. کاک خوارەحم صالح کەریم (چالاک) لەئێستادا لەوڵاتی نەمسایە.
8. کاک جەمال کەمال عەزیز، ئەفسەرە لەئاسایشی چەمچەماڵ.
9. کاک سەرکەوت ئەحمەد مەحمود، پێشمەرگەی خانەنشینە.
10. کاک سامال ڕەحیم کاکەولا، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.
11. کاک مەریوان حاجی حسێن، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.
12. کاک تەها غەریب عەبدولا (برای کاک ئازادی سەگرمە) پێشمەرگەی خانەنشینە
13. لە1988/10/11شێرکۆ جدی،بەهۆی پەلاماری هەلیکۆپتەر لەچەمی لاهێز،
لە نێوان گوندەکانی فەقێ مستەفا،کەڵۆز لوقمان،هەردووقولیجان، شەهید بوو.
14. شەهید هەڵکەوتی ئەندازیار،ڕۆژی 1998/10/11 شەهید بوو.

15. شەهید شێرزاد عەریف ڕەمەزان، ڕۆژی 1988/10/11 شەهید بوو.

16. کاك کەمال ڕەحیم کەریم (شەهید کەماله خڕە)

مانگی 1989/1 تەسلیم بووەوە، لەساڵی 1996 لەشەڕی ناوخۆ شەهید بوو.

2ـ دەستەی شەهید حەمەڕەش

1. شەهید محەمەدکەریم عیسا(حەمەڕەش) 1991/3/11 لەخورماتوو بریندار بوو، لەکاتی بەڕێکردنیدا بۆ کفری، لەشەوی 11 لەسەر 1991/3/12 شەهید بوو.

2. شەهیدخەتاب حسن حسێن(خەباتەسور) لەشەڕی ناوخۆ لە 1996شەهید بوو.

3. مام جەلال ئەمین کاکە، ساڵی 2001 لەکفری کۆچی دوایی کرد.

4. کاك هونەر شێخ عەلی، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

5. کاك بەهادین شێخ کەریم (برای شەهید حەمەڕەش) ئێستا خانەنشینە.

6. کاك ڕزگار ڕەئوف سابر (ئاری ڕەئوف بێگەرد) پلەی عەقیدە لە وەزارەتی ناوخۆ.

7. کاك حەمە ڕەحیم قادر (حەمە ڕەحیمی جیهان) ئەفسەرە لە هێزەکانی 70.

3. دەستەی شەهیدان: مەلا ئەحمەدو سەید محەمەد )وکاك عەدنان حەمەی مینا

1. شەهید ئەحمەد محەمەد حەمە ئەمین (مەلا ئەحمەد کەلاری).

2. شەهید دارا قادر سەمین عەزیز (شەهید دارا نارێنی).

3. شەهید حاجی حەمید قادر، هاوسەرەکەی و کچێکو کوڕێکی ئەنفال کران.

4. شەهید نوری قادر خورشید (پۆلا نارێنی).

5. شەهید ڕەحیم ڕەشید ئەحمەد (ڕەحیم کەلاری).

6. شەهید سەلام محەمەد حسێن ساڵح (شەهید سەلام نارێنی).

7. شەهید حەیدەر حەمید سەلیم (شەهید حەیدەر شۆڕاوەیی).

بەهۆی ڕوداوێکی سروشتی سەر لەئێوارەی 19 لەسەر1989/2/20 ئەشکەوتی داری خلە ڕوخاو هەر حەوتیان لەناو ئەشکەوتەکەدا شەهید بوون.

8. شەهید سەید محەمەد محێدین ئەمین (شەهید سەید محەمەد) لەکۆتایی ناوەکانی لیستی ئەم دەستەیەدا، بە کورتی باسی ژیانی سەید محەمەد دەکەم.

9. شەهید بوورهان محەمەد قادر (بوورهانی حەمەی مینا) لەڕاپەڕینی 1991دا لەکوڵەجۆی زەنگاباد شەهید بوو.

10.شەهیدئەحمەدسالح گورجی(ئەحمەدزەرداوی)

لەڕاپەڕینی1991 لەخورماتوشەهیدبوو.

11. شەهید محەمەد ئیبراهیم رەشید (شەهید حەمە کادر)، لەساڵی 2001 لەشەڕی دژی تیرۆر شەهید بوو.

12. کاك عەدنان محەمەد قادر (عەدنان حەمەی مینا) وەزیری خانەنشین.

13. کاك سەلام رەسوڵ(سەلام شوشە)ئێستا پلەی لیوابە لەسەر وەزارەتی ناوخۆ.

14. کاك عوسمان حەسەن قادر (حاجی عوسمان).

15. کاك حسێن ساڵح کاکەخان(مامۆستاحسێن) عەمید لەوەزارەتی ناوخۆ.

16. کاك کەریم مەحمود سەمین(مەلاکەریم)لەڕاپەڕیندا لەمانگی1991/3 لەکوڵەجۆی زەنگابادبەسەختی بریندار بوو،خانەنشینە لە لیستی کەمئەندامان.

17. کاك هەیاس حسێن فەتاح. پلەی نەقیبە لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ.

18. کاك حسام عەلی فەرەج (شێخ حیسام داربەڕو) لەشەڕی ناوخۆ لەمانگی 1994/8دا بەسەختی بریندار بوو، بەو هۆیەوە قاچێکی لەدەست دا.

19. کاك سۆران غازی سالار. ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

20. مکەرەم رەشید برزۆ،ئەفسەرەبەپلەی مقەدەم لەسەرمیلاکی سوپای عێراق.

21. کاك نەوزاد کەریم فارس. ئەفسەرە بەپلەی مقەدەم لەسەر میلاکی ئاسایش.

22. کاك کەریم رەشید ئەحمەد، پێشمەرگەی خانەنشینە.

23. کاك سامی سەمین سەعید، بەپلەی عەمیدە لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ.

## 4. دەستەی شەهید مەحمود مامە عەزە

1. محمودعەزیز محمود (مەحمودمامەعەزە) لەشەڕی ناوخۆ لە 1996شەهیدبوو.

2. کاک سدیق عەلی تۆفیق،ئەفسەرە بەپلەی عەقید لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ.

3. کاک محەمەد عەبدولڕەحمان محەمەد (حەمە پاریاوڵە)، خانەنشینە.

4. کاک ڕەمەزان محەمەد عەلی، پێشمەرگەی خانەنشینە.

5. کاک تۆفیق ڕەشید، پێشمەرگەی خانەنشینە.

6. کاک بەگ موراد شاموراد خواموراد (مام بەول)پاش ڕاپەڕین کۆچی کرد.

## 5.دەستەی کاک شێخ کەریم و شەهید سەید جەوهەر

1. جەوهەر لەتیف محەمەد(سەید جەوهەر)لەشەڕی ناوخۆ لە1997 شەهید بوو.

2. کاک کەریم ئەحمەد خدر (شێخ کەریم)، پێشمەرگەی خانەنشینە.

3. محەمەد حسێن سلێمان (حەمەئاخە)لە شەوی 16لەسەر17/ 1991/12

لە بەرگری هێرشی دوژمن، بۆ سنووری چەمچەماڵ لەبان جەباری شەهیدبوو.

4. شەهید فازڵ ئەحمەد خدر(برای شێخ کەریم)

لە1993/12/27 لەشەڕی ناوخۆ شەهید بوو.

5 . سەید بابامحەمەد سەعید، لەشەڕی ناوخۆ لەساڵی 1994 شەهیدبوو.

6. نادر مەجید جوامێر، لەڕاپەڕینی 1991 لەخورماتو شەهید بوو.

7. یاسین عەبدول محەمەد (یاسین بچکۆل) لەڕاپەڕین لەڕۆژی 1991/3/20

لەناو کەرکوک لەگەڕەکی شۆرجە شەهید بوو،کاک بوورهان سەر سپی براشی

لەڕاپەڕین لەڕۆژی 1991/3/11 لەبان مەقان شەهید بوو.

8. کاک عادل عەبدولقادر ڕەحیم (عادل پیرەمەوەنی) هاوسەرەکەی و دو براو دو

خوشکی ئەنفالن. پێشمەرگەی خانەنشینە.

9. کاک نازم نەجم ئەحمەد (نازم کەرکوکی) پێشمەرگەی خانەنشین،

10. کاك جەعفەر لەتیف محەمەد (سەید جەعفەر) پێشمەرگەی خانەنشین.

11. کاك جەمال موحسین حەوهەر (جەمال وارانی) ئەفسەر لەسەر هێزەکانی 70.

12. کاك محەمەد کەریم مەحمود (محەمەد چەوری) ئەفسەرە لەهێزەکانی 70.

13. موحسین مەدحەت دحام (کاك موحسین لەکی) پێشمەرگەی خانەنشین.

14. عەبدولاّناميق رەحیم کەریم(عەبدولاّ قەیتولی) ساڵی 2008 کۆچی دوایی کرد.

## 6.دەستەی شەهید ئازاد عەبدولاّ بەرغەش

1. شەهید ئازاد عەبدولاّ بەرغەش

2. شەهید ئاسۆ (تاهیر عەبدولقادر محەمەد)

3. شەهید جەلال جەبار ساڵح

هەرسێکیان لەرۆژی 1988/10/12 لەهەردەی دوڕاجیخورماتو بەهۆی پەلاماری هەلیکۆپتەر شەهید بوونو تەرمەکانیان بردنو شوێنبزر کران.

## 7.دەستەی عوسمان حاجی مەحمود

1. شەهید ئەحمەد رەشید عەباس (ئەحمەد حاجی ڕەشید) لەمانگی 1993/12 لەشەڕی ناوخۆشەهیدبوو.هاوسەرەکەیوحەوت منداڵیوخوشکوبرایەکی ئەنفالن.

2. شەهیدساڵح حوسێن (کاکە توکنی) لەڕاپەڕینی 1991 لەخورماتوشەهیدبوو.

3. شەهید قادر محەمەد فەرەج (مامە قالەی هۆمەربل).

4. شەهید کامەران سەعید محەمەد (کامەران هۆمەربلی)

لەشەڕی ناوخۆ لەمانگی 1994/12 شەهید بوو.

5. شەهید کامەران هیدایەت فارس (کامەران مامۆستا هیدایەت)

لەشەڕی ناوخۆ لەمانگی 1993/12 شەهید بوو.

6. شەهید مەجید ئیبراهیم لفتە (مەجید دوزی) لەڕاپەڕینی 1991

لەزنجیرە بەرزایەکانی کفریخورماتو لەغەرە شەهید بوو.

7. کاك جەمال ڕەشید ساڵح (جەمال شێخ حەمیدی)، ئێستا خانەنشینە.

8. کاك سەعید ئەحمەد محەمەد (مەلا سەعید)، لەڕاپەڕین لەخورماتو بەسەختی بریندار بوو، ماوەیەك سەرپەرشتیاری ئیدارەی گەرمیان بوو، ئێستا خانەنشینە.

9. کاك عوسمان عەلی سەمین (عوسمان تلیشانی) لەمانگی 1989/8 بەهۆی نەخۆشییەوە تەسلیم بووەوە، لەڕۆژی 1991/10/6 لەکاتی هێرشی سوپای عێراق بۆ کفریسەرقەڵا بەسەختی بریندار بوو، ئێستا خانەنشینە.

10.کاك شکور محەمەد سلێمان (شکور قەرەبڵاغی) ئەفسەرە بەپلەی (عەمید) لەسەر میلاکی ئاسایشی گەرمیان.

11. کاك عەلی نوری دەروێش (عەلی هۆمەربلی)، ئێستا خانەنشینە.

12. کاك عەلی حەمید ڕەشید (عەلی غائب)، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

13. کاك سباح عومەر وەلی (سەباح شێخ حەمیدی)، ئێستا خانەنشینە.

14. کاك غائب حسێن (غائب لەلبن)، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

15. کاك شکور ئیسماعیل عەلی، لەمانگی 1989/3 تەسلیم بووەوەو چەند مانگێك زیندانی کرا، پاشان ئازادکرا، ئەوکاتەی ڕۆیشتبوو بۆ تەسلیم بوونەوە جگە لەتفەنگو تاقمی مەخزەنو فیشەکەکانی، نامەیەکی بۆ بەجێهێشتبووم، باسی هۆکاری تەسلیم بوونەوەی دەکات (نامەکە ماوە).

16. کاك حەسەن حەمید حەمە عەلی (حەسەن هۆمەربلی) ئەفسەرە بەپلەی (عەمید) لەسەر میلاکی پۆلیسی سنور.

17. کاك بوورهان عەبدولرەحمان (بوورهان زەرداوی)، بەڕێوبەری بەڕێوبەرایەتی پۆستەو گەیاندنی گەرمیانە.

18. کاك ڕەشید عەلی سەعید (حەمە ڕەشید توکنی)، باوكو دایكو برایەكو چوارخوشکی ئەنفالە،ئەفسەرەبەپلەی(عەمید)لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ.

19. کاك جەمال سابر (جەمال مەلا ئۆمەری)، باوکی ئەنفالە، ئێستا ئەفسەرە بەپلەی مقدم لەسەر میلاکی وەزارەتی ناوخۆ.

20. کاك عوسمان جەمیل سالح (عوسمان مەلا جەمیل) دایکو دو خوشکو دو برای ئەنفالن، ئێستا پێشمەرگەی خانەنشینە.

21. کاك رەحیم رەشید محەمەد (مەلا رەحیم) ماوەیەك قائمقامی کفری بوو، ئێستا خانەنشینە.

22. کاك عەلی محەمەدکەرەم(عەلی فەقێ مستەفایی) لەساڵی2008شەهیدبوو.

23. عوسمان مەحمود محەمەد(عوسمان حاجی مەحمود) وەزیری خانەنشین.

هەموو دەستەکان ژمارەمان 92 پێشمەرگە بووین ئەم ژمارەیەش وەکو خۆی نەمایەوەو گۆڕانکاری بەسەردا هات....

* سەرچاوە : رۆژنامەی ئاوێنە / عوسمانی حاجی مەحموود/ کۆتایی تەمموزی 2015



# خۆراگری پاش ئەنفال

## دێی بەلەکە

## خیانەت و وەفا لە دوو هەڵوێستی جیاوازدا

دێی بەلەگە دەکەوێتە نێوان هەردوو گوندی هۆمەربل و دوراجی لە سنوری ناحیەی سەرقەڵا. جێگای ئەم گوندەکەوتوەتەدامێنی هەردەی (هۆمەربل . بەلەگە) لە خوار بەلەگەوە دێی بەلەگەی بچوك دێت دوای ئەمیش هەردەو قاتەکانی کفری دەستپێدەکات .ئەم دێیە لە کاتی شاڵاوەکانی ئەنفالدا کەوتبووە ناو بازنەی ئەنفالی سێیەمەوە بەلەگەو دێیەکانی دەورەبەری بەوەی لەڕووی جوگرافیەوە کەوتبوونە نێوان سنوری هەردو قەزای کفری و دوزخورماتو ،نزیك لە ڕێگای ئەم دووشارە کەهێڵی جیاکەرەوەی نێوان دەسەلاتی شۆڕش ورژێمی بەعس بوو، بەواتای هێڵی ڕوبەروبوونەوە ،بۆیە بەبەردەوامی دەکەوتنە بەر تۆپبارانی سوپای عیراق . لە دوای ساڵی ١٩٨٥هوە ئەم دێیە و دێیەکانی تری سنوری قەزای کفری ودوزخورماتوو بووبوونە ئامانی سەرەکی سوپای عێراق و زۆربەی کات هێرشی سوپا و جاش و تۆپباران و پەلاماری کۆپتەر و فڕۆکەی پیلاتۆز ،جگە لەهێزی پێشمەرگە بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە خەڵکیان دەکردە ئامانج و زیانی گیانی و ماددیان لێدەدان بەهۆی ئەم باردودۆخەوە لە نێوان ساڵانی ١٩٩٨٥ تاساڵی ١٩٨٨٨ ژیانی کار و کەسابەتی کشتوکاڵی و بەخێو کردنی مەڕ و ماڵات زۆر سەخت و مەترسیدار بوو.جوتیارەکان ناچار بوون زۆربەی کاری ڕۆژانەیان وەك "کارەکانی کشتوکاڵ لە جوت و دروێنەی گەنم و جۆ و زەرعەتداری "بەشەو ئەنجام بدەن

،شوانەکان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی کۆپتەرەکانی بەعس لە نزیك لەوەرگاکان لەژێر زەویدا حەشارگەیان دروستکردبوو، هەتا لەکاتی تۆپباران و پەلاماری هەلیکۆپتەرەکاندا خۆیان بپارێزن ،هەندیکجار هەلیکۆپتەرەکان بۆردومانی ئاژەلەکانیان دەکرد و چەندین مەڕومالاتی خەڵکیان دەکوشت .بەشێوەیەکی گشتی ژیان لەوکاتانەدا لە دێی بەلەگە ودێیەکانی تری ئەو ناوچەیە لەو پەری کولە مەرگی پڕکارەسات و گرانیدا بوو. دانیشتوانی بەلەگە و دێیەکانی تر وا ڕاهاتبوون لەکاتی بیستن و ئاگادار بوون لەهەواڵی هێرش وپەلامارەکانی سوپای عیراق ، کەلوپەلی ناومالْ و پێداویستیەکانی ژیانیان دەبردەدەرەوەی دێیەکان ولەجێگای پەنادا دەیانشاردەوە، لەشالأی ئەنفالیشدا هەمان شتیان کرد، لە خوارووی دێی بەلەگە جێگایەك هەیە هەردەیەك هەیە پێی دەوترێت هەردەی سیْ مەریوانە، ئەم جێگایە بەشێکە لەهەردەو قاتەکانی کفری، سروشتی خاکەکەی وا هەڵکەوتووە، کە پێکهاتەیەك لە تاوێری گەورە و بەردو چەو وگڵ دروست بووە . تاوێرەکان بەشێوەیەکی گشتی لەگەلْ ئەوەی لێکچونێکی تەواو لەم تاوێر وبەردەڵێنەدا نیە ، بەلاّم چەند زنجیرەی درێژ و هاوتەریبیان دروستکردوە،نێوان زنجیرەکان بووەتە شیو ودۆل ، ئەو بەشەی کە زۆرترین زنجیرە وگردۆڵکە و کون و کەلەبەر لەخۆدەگرێت کەوتوەتە پشتی ڕێگای خورماتو ـ کفری

ئەو زنجیرانە ناوبەناو لەهەندیك جێگادا (بن کاچی) گەورەیان تێدایە لەهەندیك جێگاش ئەشکەوت ـ کەلۆزی بچوك، هەروەها ژمارەیەك کونی گەورە و بچوك. سروشتی ناوچەکە وایکردوە کە جێگایەکی لەبار بێت بۆ خۆپاراستن لە هێرش و شەڕ و مەترسی .

ژمارەی خێزانەکانی دێی بەلەگە لە پێش ئەنفال ٧٥ تا ٨٠ خێزان دەبوون ، خەڵکەکەی زۆردڵفراوان ونیشتمانپەروەر وخوڕاگربوون، یەکێك لە کەسایەتیەکانی

دێیەکە کاك حاجی محمد بوو ،بەهۆی پابەند بوونی بەهێزی بە دینداری لەگەڵ ئەوەی خۆی ناوی محمد بوویەکێك لە دو کورەکەشی ناونابوو محمد (ئەم کورە دواتر بەر ئەنفال کەوت) . لەکاتی شالاوی ئەنفالی سێدا حاجی محمد و خەڵکی گوندەکە کەلوپەل و پێداویستیەکانیان بردبووە چەمی کونارەکە لەهەردەی سێ مەریوانە. حاجی محمد کورێکی تری هەبوو بەناوی ئەحمەد ، کادری رێکخستنی ناو خەڵك بوو پاش روخان وچۆڵکردنی گوندەکەیان لە گەڵ چەند کەسێکی ترلە نزیك گوندەکەیان لەهەردەی سێ مەریوانە دەمێننەوە . پاش چەند رۆژێك جگە لە ئەحمەد و تەنها یەك کەس ، خەڵکەکەی تر هەمو ناوچەکەیان چۆڵکردبوو. دواتر ئەو کەسە خیانەت لە ئەحمەد دەکات و شەهیدی دەکات ، پاشان تەسلیم بە رژێمی بەعس دەبیتەوە . ئەو خائینە بەوەشەوە نەوەستابوو، بەڵکو بوو بوو بە چاوساغی رژێم بۆ بردنی تەرمەکەی شەهید ئەحمەد. ئەو کاتەی هەواڵی شەهید کردنی ئەحمەدمان بیست ،ئێمە لە دەور و بەری دێی کانی عوبێد بووین کە سەربەناحیەی ئاوەسپی قەزای کفریە، بەلام بۆ بە دەنگەوە چونی روداوەکە ،شەهید مجید دوزی و سەباع شیخ حەمیدی و بەندە بەریکەوتین و لە رۆژی ١٩٨٨/٥/١٣ گەیشتینە دەور وبەری دێی بەلەگە ، ئێمە ئەوکات وردەکاری روداوەکەمان نەدەزانی و لەوە ئاگادار نەبووین کەرژێم بەچاوساغی ئەو خۆفرۆشە تەرمەکەی بردوە بۆ کفری ، بۆیە بەگەیشتنمان یەکسەر کەوتینە گەران بەدوای تەرمەکەی شەهید ئەحمددا، یەکێك لەو جێگانەی پێشبینی ئەوەمان دەکرد ،تەرمی ئەو شەهیدە قارەمانەی لێبێت چەمی کونارەکە بوو لەهەردەی سێ مەریوانە .

کاتێك گەیشتینە چەمەکە دیمەنێکمان بینی کە لەناخەوە هەست و سۆزی هەژاندین و سەرلەبەری بیرکردنەوەشمانی داگیر کرد . لەو چەمەدا سەگێکی هەوشار کە پاسەوانی ماڵی حاجی مەحەمەدی دەکرد ،پەلاماری دەداین و رێگەی

ئەئەدا لە ماڵەکە نزیك بینەوە کە لە بن کاچی تاوێریکدا دانرابوو. جوانی ئەو دیمەنە لەوەدابوو کەسەگێك ئەمەك و وەفای نیشان داین ، بەوەی ئامادە بوو هەتا دواساتەکانی ژیانی پاسەوانی لەو ماڵە بکات کە نانی لێخواردوە . سەگێك لەدوای نەمانی خاوەنەکەی و لە دەشتێکی واچۆڵ و ترسناکدا بێ هیچ گوشاریك پارێزگاری لەماڵی خوانەکەی بکات*، کەچی مرۆڤێك بە تەواوی ئیرادەی خۆیەوە و دەچێتە خوێنی هاونیشتمانی و هاوسەنگەرەکەی و شەهیدی دەکا و تەرمەکەی تەسلیم بە رژێم دەکات لەپێناو هەندێك دەسکەوت یان ئافەرینێکی بەعسدا . لەڕاستیدا چیرۆکی ئەو سەگە هەوشارە لێرەشدا کۆتایی نەهات ،وەك ئەوەی لەقەدەری رۆژانی سەختی ئەنفالدا ،سەگێك بە ئێسك و پروسك و پاشماوەی جەستەی خۆی ، بە ئێمەی پێشمەرگەی پارتیزان بڵێت ،من تا دوا ساتەکانی ژیان و بوونم بە وەفاداری مامەوە و لە گەڵ وەفادا ژیام ......!! چونکە دوایی نزیکەی سێ مانگ کە چوینەوە هەمان شوێن . پاشماوەی جەستەی سەگەکەمان لەنزیك کەلو پەلەکانی ماڵی حاجی بینی،کەبرسێتی بەهۆی نەمان و ئەو کەمە ئارد و گەنمەی،کەلەگەڵ کەلو پەلی ماڵەکەدا شارابووەوە کۆڵی پێنەدا و دەستبەرداری ئەرکەکەی نەبوو، تالەهەمان جێگادا برسێتی ژیانی لەناو برد .ئەم دیمەنە و چەندین چیرۆك و بابەتی تری هاو شێوە لەچەند جێگایەکی تر دوبارە بووەتەوە بەشێوەیەك کە بوەتە دیاردەیەکی ئەوکارەسات و رۆژە رەشانەی ئەنفال.

* ئاوینە : پاش ئەنفالی ۳ بریاری مانەوە و خۆڕاگری عوسمانی حاجی محمود

https://www.facebook.com/AzariGall?ref=h



پارتیزانەکانی گەرمیان 1990
ئەحمەد فازل - مەحمود بەنگاوی - لۆکە - شەهید حەمە سور - جەبار -

# هەلیکۆپتەر

**هەلیکۆپتەر بەدرێژایی شۆڕشو پێشمەرگایەتی چەکێکی ترسناکو کاریگەر بوو، بەتایبەت لەپاش دەستپێکردنەوەی شۆڕش لەساڵی 1975دا، زۆرترین زیان کە لەهێزی پێشمەرگە دراوە بەهۆی هەلیکۆپتەرەوە بووە.**

**لەقۆناغی پارتیزانی پاش ئەنفالەکانیشدا ئەم چەکە بەهەمان کاریگەری زیاترەوە بەکارهێنرا،لەوکاتەداچەکێکی ئەوتۆمان نەبووکەبەرگری پێبکەین دژی هەلیکۆپتەر.**

**هەردەی دوڕاجی (خورماتو) - پەلاماری ڕۆژی 1988/10/12**

**دەستەکەی شەهید ئازاد بەرغەش کە سێ کەس بوون، لەهەردەکانی نێوان خورماتو، دێی قوریچایی چەند جێگەیەکیان کردبووە حەشارگە، لەڕۆژی 1988/10/12 بەهۆی گەڕانو سوڕانەوەو چاودێری کردنی هەلیکۆپتەرەوە، ئاشکرا کرانو پەلامار دران، لەئەنجامدا هەرسێکیان شەهید بوون، دواتر هەلیکۆپتەرەکان دابەزینو تەرمەکانیان بردن. شەهیدەکان:**

1. **شەهید ئازاد عەبدوڵا بەرغەش**
2. **شەهید جەلال حاجی جەبار**
3. **شەهید تاهیر عەبدولقادر (ئاسۆ)**

## ڕۆیشتنی ژمارەیەك پێشمەرگە بۆ بارەگاکانی ناو کوردستانی ئێران

ڕێگای هاتن‌و چون بۆ ئێران گرفتێکی گەورە بوو، سەرەڕای ئەوەش ڕۆژی 1988/11/17بەئاگاداری‌وتەنسیق کردن لەگەڵ سەرکردایەتی،ژمارەیەك فەرماندەو کادرو پێشمەرگە بەڕێگای شاخی بەمۆ (دەربەندی بێلولە) بەڕێکەوتن بۆ ئێران، دوای چاوەڕوانی‌و برسێتیی‌و ماندوبوونێکی زۆر لە1988/12/5 گەیشتنە ئێران.

بریتی بوون لەم ناوانە:

1. شەهید مەحمود عەزیز مەحمود (شەهید مەحمود مامە عەزە)
2. کاك ڕۆستەم
3. کاك عەدنان حەمەی مینا
4. مام جەلال ئەمین کاکە
5. شەهید بوورهان محەمەد قادر (بوورهان حەمەی مینا)
6. کاك محەمەد عەبدولرەحمان محەمەد (حەمە پاریاوڵە)
7. کاك سدیق عەلی تۆفیق
8. کاك سەلام رەسوڵ قادر(سەلام شوشە)
9. کاك حەمە رەحیم قادر (حەمە رەحیمی جیهان)
10. کاك کەریم مەحمود سەمین (مەلا کەریم)
11. کاك عوسمان حەسەن قادر(حاجی عوسمان)
12. کاك هەیاس حسێن فەتاح
13. کاك شێخ مەحمود عەبدولسەمەد حەمەخان (شێخ مەحمود درێژ
14. کاك خوارەحم سالح کەریم (چالاك)
15. مام سالح محەمەد عەلی ئیبراهیم (وردەدین)
16. کاك ساماڵ ڕەحیم کاکەولا

17. کاك رەمەزان محەمەد عەلی

18. کاك تۆفیق رەشید

19. کاك بەهادین شێخ کەریم

20. کاك بەگ موراد خواموراد شا موراد (مام بەول)

21. کاك سامی سەمین سەعید

روخانی ئەشکەوتی داری خلەو شەهید بوونی پۆلێك پێشمەرگە

داری خلە تاکە داربەڕویەکە لەسەر یەکێك لەگردەکانی زنجیرە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی دێی(زاوت)ی سەربەناحیەی باوەنور،لەسنووری قەزای کەلار،ئەشکەوتی داری خلە، دەکەوێتە دامێنی ئەو زنجیرە بەرزاییە، لەراستیدا بەمانای ئەشکەوت (کەولۆن)،وەکو جێگایەکی سروشتکرد ئەو شوێنە ئەشکەوت نییە. ئەم جێگایە بەشێوەیەکی وا هەڵکەوتوە ئەکەوێتە یەکێك لەلاکانی دۆڵێکی قوڵ کە ئەمبەرو ئەوبەری دۆڵەکە بەرزایی‌و گردەو پێکهاتەی خاکەکەی خۆڵو بەردو تاوێرو زیخە.لای سەرەوە کە سەرەتای دەستپێکی دۆڵەکەیە تەنگو بەر تەسکە، بەڵام بەرە بەرە بەرفراوان دەبێت، تا دەبێتە شیوێك، لەزستان‌و بەهاراندا ئاوی هەیە، ئاوەکەی دەڕژێتە ناو چەمێك لەنێوان هەردو دێی وڕێڵەو دێی ڕۆسەی شامار کە نزیکی داری خلەیە. لەوەرزی باران باریندا ئاو لەبەرزاییەکی بڵندەوە دەڕژێتە ناو دۆڵەکە. پاڵەپەستۆی باراناو لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگار، لای ڕۆژهەڵاتی دۆڵەکەی دڕیوەو بنکەندی کردوە. ئەم جێگایە بەهۆی قایمی‌و نەبینراویەوە لەلایەن کاك عەدنان‌و شەهید سەید محەمەدو شەهید مەلا ئەحمەدو دەستەکەیان گەورە کراو ڕێکخرا بەشێوەیەك کە بەچەند چینە بەردێکی گەورە بەردەمەکەیان هەڵچنیو دیوارێکیان لێدروستکرد، پاشان ڕێڕەوی ئاوەکەیان دەستکاری کرد. لەئەنجامی ئەو گۆڕانکاریانە بوو بەئەشکەوت‌و جێگای 14. 15 کەسی تێدا دەبووەوە. هەرچەندە

جێگاکە لەزستاندا هەتاری کەم بەردەکەوتو نسرمو سارد بوو، بەڵام لەروی ئەمنیەوە حەشارگەیەکی باش بوو بۆ حەوانەوەی پێشمەرگە، شوێنێکی کپو دورەدەست بوو. پاش رۆیشتنی کاك عەدنان بۆ ئێران لەمانگی 1988/11دا، شەهیدان مەلا ئەحمەدو سەید محەمەدو دەستەکەیان زۆربەی کات لەو جێگەیە دەمانەوە. رۆژی 1989/2/19 کاك سەید محەمەدو کاك مەلا ئەحمەدو 7 پێشمەرگە لەئەشکەوتەکە بوون، پێش ساتەوەختی روخانی ئەشکەوتەکە، کە کاتژمێر 5:30.5:20ی سەر لەئێوارەی 19 لەسەر 1989/2/20 بوو، کاك سەید محەمەدو کاك سۆران غازی سالار، دوقۆڵی لەئەشکەوتەکە دەردەچنو دەچن تا بەجیهاز پەیوەندی لەگەڵ دەستەکانی تر بکەن. (ئەوکاتە 24 کاتژمێر جارێك بەهۆی جیهازی بچوك وەکو تلفونکنو پی ئاڕ سی،سەرلەئێواران یان شەوان پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتر دەکرد). دوای تەواوبوونی پەیوەندی، کاك سەیدو کاك سۆران دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەشکەوتەکە،دەبینن شوێنەکەیان بەتەواوەتی ڕوخاوەو دەنگی هاوڕێکانیشیان نابیستن، ئەوان بەخەمباری دەمێننەوەودەزانن کەهیچیان بۆناکرێت،چونکە بەجۆرێك روخابووهیچی لەگەڵدانەدەکراو،پێداویستی ئەوتۆش لەبەردەستدا نەبوو.

بۆ ڕۆژی دوەم واتە سەر لەئێوارەی 1989/2/20، لەکاتی پەیوەندیدا، کاك سەید محەمەد لەرووداوەکە ئاگاداری کردین، ساتەوەختی ئاگادار کردنەوەمان شەهید حەمەڕەشو کاك شێخ کەریم، لەشاخی ئاجداغ بوون سەر بەناحیەی سەنگاو، ئێمەش لەنێوان هەردو گوندی جوامێرئاغاو هۆمەربل بووین سەر بەقەزای کفری، شەهید سەید جەوهەر لەسنوری خورماتو بوو. دوری نێوان هەر لایەکمان لەجێگای رووداوەکە 14.12 کاتژمێر دەبوو بۆیە هیچمان بۆنەدەکرا جگە لەوەی بڕیارماندا بچین بۆ شوێنی روداوەکە تا لەنزیکەوە روداوەکە ببینین. پاش ئاگادارکردنەوەمان

لەهەواڵەکە هەریەکە لای خۆمانەوە بەرێکەوتین‌و پاش نیوەڕۆی 1989/2/21 لەگەڵ شەهید حەمە ڕەش‌و کاك شێخ کەریم گەیشتینە ئەشکەوتەکە، لەویٚ کاك سەید محەمەدو باقی دەستەکەیانمان بینی، بەهۆی ئەو سەدان تەن گڵ‌و خۆڵ‌و بەردەی بەسەر ئەشکەوتەکەدا داڕوخا بوو، نەبوونی هیچ جۆرە پێداویستیەك، دەسەوسان بووین. بۆیە نەماندەتوانی هەوڵی دەرهێنانی تەرمەکانیان بدەین‌و بەو شێوەیە مایەوە. پاش ڕاپەڕین لەڕۆژی 1991/10/31دا تەرمی شەهیدەکانمان دەرهێناو لەڕۆژی 1991/11/1دا لەمەراسیمێکی جەماوەری گەورەدا، هەر حەوتیان بەیەکەوە لەگۆڕستانی کەلاری کۆن نێژران:

1. شەهید ئەحمەد محەمەد ئەمین (شەهید مەلا ئەحمەد)
2. شەهید دارا قادر سەمین عەزیز (دارا نارێنی)
3. شەهید سەلام محەمەد حسێن ساڵح (سەلام نارێنی)
4. شەهیدنوری قادر خورشید(پۆڵانارێنی)

نارێن دوا گوندی کوردە لەبناری زنجیرە چیای حەمرین.

5. شەهید حەمید قادر(حاجی حەمید)، هاوسەرو کچ‌و کوڕێکی ئەنفال کران.
6. شەهید حەیدەر حەمید سەلیم (حەیدەر شۆراوەیی)
7. شەهید ڕەحیم ڕەشید ئەحمەد (ڕەحیم کەلاری)

* شەش پێشمەرگەمان تەسلیم بوونەوە (چۆنیەتی تەسلیم بوونەوەیان، لە لیستەکان ڕون کراوەتەوە) پاش ئەو ڕوداوو بەسەرهاتو ئاڵوگۆڕانە، بەهەموو دەستەکان 49 پێشمەرگەماینەوە.

---

سەرچاوە : ئاوێنە / عوسمانی حاجی مەحمود

partizan.garmian@gmail.com



## خوێنەوەیەکی کورت بۆ بیرەوەرییەکانی "عوسمانی حاجی مەحمود"

**تاکە شتێك کە زۆر گرنگە خەڵکی لەسەر پەروەردەبکەین، ئەوەیە کە فێریان بکەین چۆن بتوانن ناسنامەی خۆیان بپارێزن.(کونفۆچیۆس)**

**رزگار رانگور**

دوای چەندساڵ لەبێدەنگی کاك عوسمانی حاجی مەحمود لە٢٨.٧.٢٠١٥ بە شەش بەش بیرەوەری ٣ساڵ ژیان و گوزەرانی خۆیانی بۆباسکردین، وەك پارتیزانێکی دوای ئەنفال، لە ژێر ناونیشانی " پاش "ئەنفالی 3" بڕیاری مانەوەو خۆڕاگری " لە ڕۆژنامەی ئاوێنە بلاو کرایەوە، هەر لەو کاتەشدا یەك دووبەشی هەمان بیرەوەریش لەکوردستانپۆست بلاو کرایەوە. کاتێك من دەستم کرد بە خوێندەوەی

بیرەوەرییەکە، سەیرم کرد کاک عوسمان باس لە شتگەلێك دەکات، کە لەهەر جێگەیەکی تری ئەم دنیایەدا ئەمە ڕووی بدایە بەدڵنیاییەوە، دەبووە کەرەسەی میدیاکان و دەیان فلیم و کتێبی لێ بەرهەم دەهات، هەر هیچ نەبووایە دەبووە کەرەسەی مێزگرتن لەناو کەناڵی تەلەفیزۆنەکانەوە، داوا لە خاوەن نووسینەکە دەکرا بێت تیشکی زیاتر بخاتە سەر ئەو قوربانیدانە و ئەو ئازایەتییە، کە ئەو جەوامێرانە لەو ڕۆژە تاریکانەدا ئەنجامیان داوە کە بەسەر گەلەکەماندا هاتووە.

کاک عوسمان دەڵێ:

گەرمیان یەکێك بوو لەو ناوچانەی کە لەپاش ئەنفالی سێ تا ڕاپەڕین لەساڵی 1991دا پێشمەرگەی بە بەردەوامی لێمایەوە.

بەر لەوەی دەستبکەم بە نوسینی تێبینییەکانم لەسەر بیرەوەری ئەم پیاوە، کە بێدەنگی ڕەوشتێکی پێداوە کە کەمتر دەربکەوێت، یان هەر دەر نەکەوێت و هەمیشە وەك مرۆڤێك خەریکی بیرکردنەوەیەك بێت و خەمێك داگیری کردبێت، وەك ئەوەی بیەوێت زیاتر خۆی بناسێت، ئەو پیاوە دەڵێ تێرامان دەکات، یان ئاڵۆزی ڕووداوەکان داگیری کردوە، بۆیە هەمیشە گوێدەگرێت و کەم قسەدەکات و لە میدیاکانەوە دەرناکەوێت، کاتێکیش چیرۆکی ژیانی خۆی دەنووسێتەوە ئێمە لامان سەیر دەبێت...! دەپرسین ئەی بۆچی تاکو ئێستا ئاوا بێدەنگ بوویت؟

نووسەر لە نووسینەوەی بیرەوەرییەکەیدا دەڵێ: پشتم بە سەرچاوەی ئەو ڕۆژمێرەش بەستووە کە خۆم ڕۆژانە تۆمارم کردوە، منیش دەڵێم یەکێك لە باشترین نووسینەکانی "ئارنیستۆ چی گڤارا" ڕۆژانەکانی "بۆلیڤیا "یە کە کاسترۆ پێشەکی بۆ نووسیوە و دەڵێ گیڤارا: لە کاتی شۆڕشی کوباشدا، هەرکاتێك دەوەستاین تاپشوبدەین، گیڤارا دەفتەرێکی بچوکی دەردەهێنا و دەستی دەکرد بە نووسینی یاداشتی ئەو ڕۆژەی لێمان دەگوزەرا، ئەو گوێی بەماندووبوون

نەدەدا.خۆزگە کاك عوسمانیش بەهەمان شێوە، لەجێگەی نووسینەوەی ئاوا پچڕ پچڕی ئەم بیرەوەرییە،هەمووشتێکی ڕۆژانە هەرنەبووایە هەفتانە بۆبگێڕینایەوەوە، ئەو دەم ئەم بیرەوەرییە دەبووە شاکارێکی هێندە مەزن کە مێژووی ئەم وڵاتە شانازی پێوەبکردایە، ئێستاش هیچ لە ناوەڕۆکی ئەم بیرەوەرییانە کەم ناکاتەوە، بەڵام کاتێك مرۆڤ دەیخوێنێتەوە خواستیارە بزانێ پارتزانەکان چۆن نانیان خواردوە، چۆن خۆیان شتوە، چۆن کاتە دوورو درێژەکانیان بەسەر بردوە ؟ من بەر لەماوەیەك نامیلکەیەکم خوێندەوە کە سەربازێکی ونی تر بیرەوەری خۆیمان بۆدەگێڕێتەوە،کەچۆن بۆلای پارتیزانەکان چووە.ئەویش"هاوڕێ سوپا"یە و گەرمیانییەکە قوربانی بەهەمووشتێك داوە "بیرەوەری دارکنارەکە" کە لە ناو بیرەوەری ئەم پیاوەدا جگە لەوەی کاك عوسمان بەسەر بیرەوەرییەکدا چۆتەوە، هەروەها کاك عوسمان کارئەکتەرێکی زیندووی ناو ئەم بیرەوەریەی"هاوڕێ سوپا"یە. لەناو ئەم نامیلکەیەدا ئامارە بەژیانی پارتیزانەکان دەدات و ئەویش چیرۆکی بیرەوەری پارتیزانەکان دەوڵەمەند دەکات.ئەوەی جێگەی ئامارە پێدانە لێرەدا ئەوەیە، کاتێك "هاوڕێ سوپا " خۆراك بۆ پارتیزانەکان دەبات دەبێت خۆی یەکەمین جار لە خۆراکەکەی بخواردایە، بۆ ئەوەی پارتیزانەکان دڵنیا بوونایە لەوەی کە خۆراکەکە پاکە و زەهری تێدا نییە، بڕوابوون لەو کاتەدا لەژێر تاقیکردنەوەدابووە.هەموو شتێك لەو کاتەدا دەبوو لەژێر چاودێری و گوماندا بووایە، بۆ خاتری ئەوەی هەرزان پارتیزانەکان شەهید نەبن. لە دوای ئەنفالی سێ ١٢ پێشمەرگە بڕیاری مانەوە دەدەن لەگەرمیان."سۆن تزو" ئەو پیاوەی کتێبی "هونەری جەنگ"ی نووسیوە دەڵێ :زۆربەی خەڵکی پەی بەوە نابەن،چۆن لەهەندێك حاڵەتدا سەرکەوتن بەر لەدەسپێکی شەڕدا بەدی دێت".

بڕیاردان و مانەوە لەو کاتەدا کە هەموو شتێك هەرەسی هێناوە خوێن لەهەموو لاشەی نیشتمان دەچۆڕێت، خۆفرۆشی لە لوتکەی هەڵچوندایە، بێمتمانەی و خۆپەرستی گومان، ڕوخانی دەرونی تاك بەتاکی گەلێکی تەنیوە، جاسوس و کوشتی یەکتری و فریودانی یەك و برسێتی و تینوێتی، دابڕان هتد...لەو کاتەدا تۆ بڕیار بدەی بمێنیتەوە و بەرگری بکەیت، مانای سەر کەوتنی پیش شەڕە، لەکاتێکدا بەعسییەکان لە لوتکەی دەسەلاتدا بوون و لەشەڕی ئێران عێراقیش مەرەخەس ببوون، سوپایەکی پڕچەك و لەشکرێکی بێشوماریش لە جاش و خۆفرۆش لەخزمەتیاندا بووە، ئەمان بڕیاری مانەوە دەدەن، بیرکەنەوە ساڵی ١٩٧٥ کاتێك ئاشبەتاڵ بوو دێهاتەکان دەستکاری نەکرابوو، گەر خەڵکانێك هەبوونایە بڕیاری بەرگری و مانەوەیان بدایە مێژوو بەجۆرێکی تر دەنوسرایەوە بۆمان، یەکێك لە بڕیارە ژیرەکانی ئەم گروپە هەڵبژاردنی ئەو ناو چەیە بووە کە خۆیان وەك بەری دەستیان شارەزای بوون، بۆیە مانەوەیان لێرە کارێکی چاك بووە، پاشان لە هونەری شەڕدا هەمیشە نزیك دوژمن مانەوە پارێزراوتر دەبیت، لەوەی زۆر دووربکەویتەوە، دوژمن دوور بەدواتدا دەگەڕێت و باوەڕی نییە تۆ لە بن دەستیدا بیت

کاك عوسمان دەڵێ:" لەو ڕۆژانەدا کۆی دیمەنەکە بریتی بوو لەوێرانی و سوتماك و دێهاتی ڕەش داگەڕاو کە مایەی خەمێکی قوڵ بوو بۆ هەموومان، بەڵام سەرەڕای ئەو دۆخە نالەبارە پێویستمان بەپشودرێژیی و ئیرادەی بەهێزو چاوەڕوانی خوراگرانە هەبوو، بۆیە هەر ئەوەمان هەڵبژاردو لەسەری بەردەوام بووین.لەو کاتەدا هەستم بەوە دەکرد کە ئەرکێکی قورس کەوتوەتە سەرشانی هەموومان و پێویست بوو بەرامبەر بەو ئەرکە شتێك بکەین.لەو سۆنگەیەوە ئەوەم بەبیرداهات و لەخۆم

پرسی: "ئایا ناکرێت لەناوچە چۆڵکراوەکاندا بمێنینەوە و درێژە بەشۆڕش و پێشمەرگایەتی بدەین"[١]

دیارە ئەوەش دەڵێ کە من تەنها نەبووم بەڵام، ئەو بۆخۆی وابیری کردۆتەوە، بۆیە دەستی کردۆتە پرسیارکردن لە پێشمەرگەی تریش، بۆ ئەوەی بڕیارێك بدەن. پارتیزانەکان دەستیان کردوە بە'تاقیکردنەوەی ئەزمونێکی نوێ، کارێك کە پیشتر لەهیچ جێگەیەکی کوردستان تاقی نەکراوەتەوە، هەمیشە هێزی پێشمەرگە لە ناو خەڵك و لە دێهاتە ئاوەدانەکاندا بووە، بەڵام ئێستا دێهات نەماوە ئێرەش چۆڵەوانییە و دێهاتەکانیش لەگەڵ زەویدا تەختکراوە، خۆراك چۆتە قاتی، پەیوەندی پچڕاوە و دەستت بەهیچ ناگات، بەڵام بڕیار دەدەیت بمێنیتەوە.ئەوەی زۆر ئازایەتییە لەم کاتەدا ئەوان چاوەڕوانی سەرکردایەتی نابن کە بڕیاریان بۆ بدات چی بکەن؟ بەڵکو خۆیان بڕیار دەدەن کە بمێننەوە دوای پەیوەندی بەسەرکردایەتییەوە دەکەن، ئەوان خۆیان دەبنە بەرپرسی چارەنووسی خۆیان، ئەوەش ئەزمونێکی ترە.بەڕاستی دەبێت ئامەژە بە فلیمێك بدەم کە چەند منداڵێك دەکەونە جەنگەڵێکەوە و لەوێ سەرکردە چۆن دروست دەبێت خۆی نمایش دەکات فلیمەکە باسی مێژووی شەڕی جیهانی دووەم دەکات.

ڕژێم زۆربەی ڕۆژەکان کێوماڵ دەکات، کانییەکان زەهراوی دەکات، هەموو ئەو شتانەی کە بەسوود دەبوون بۆ ژیان لەناوی دەبات، جاشەکان لێرەو لەوێ لە خیانەت کردن بەردەوامن و کەرەسەی گوندەکان دەدزن و کۆدەکەنەوە و لە شەڕەکاندا دژی پارتیزانەکان بەشدار دەبن.کەسانێك بۆ ئەوەی پێستی خۆی ڕزگار بکات، خێزان و منداڵی هاوڕێکەی شەهید دەکات و دەچێتەوە بۆ لای ڕژێم و دەبێتە خزمەتکاری.واتە لێرە چاوت بە چیرۆکی خیانەتکردنیش دەکەوێت و هەڵوێستەت پێدەکات.ناخۆشی ئەم بیرەوەرییانە لەوەدایە کە کاك عوسمان پێمان

نالێ دوای چارەنوسی ئەم جاسوس و خۆفۆشانە بەکوێ گەشت ؟ بلێ ئەوانیش تێکەڵ نەبوون لەگەڵ پێشمەرگە خانەنشینکراوەکاندا و موچەخۆرین ؟

پاشان کاتێك رژێم دەزانێت بەڵێ لە کوردستان کەسانێك بڕیاری مانەوەیان داوە، بۆیە یەك دووجاران لێبووردنی گشتی دەردەکات، داخۆ لەم کاتانەدا پارتیزانەکان چۆن بەرخوردیان لەگەڵ یەکتردا کردوە؟ لەیەك ترساون داخۆ ختورە بە دڵی کەسیاندا هاتووە لەو کاتە؛ چۆن یەکتریان قبووڵکردوە ؟ شەڕیان بووە لەیەك زویربوون ؟ چۆن نیگابانیان کردوە، باوەڕ بەیەکبوون چۆن بووە ؟ گومان لەکوێی ژیانیاندا خۆی حەشارداوە؟

کاك عوسمان باسی دوو پارتیزانمان بۆ دەکات کە خەڵکی دوا گوندی کوردستانن لەسنوری حەمرین گوندی "نارێن" کە دەکەوێتە بناری چیای حەمرین، پاشان چیرۆکی پیاوێکی جوامێرمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن خۆی کردۆتە قوربانی ئەویش" کاك شێخ حسێنی هەزارکانی " کاتێك ئەم چیرۆکە دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت ئاهێك لەمرۆڤی کوردا ماوە، دەبوو سینەماکارێك ئەم چیرۆکەی بکردایەتە فلیمێك کە ببووایەتە جێگەی سەرسوڕمانی جیهان لەئاست مەردی ئەم پیاوەدا، بەڵام کوا ئێمە بەدوای کەرەستەی هونەری ڕەسەندا دەگەڕێین؟

دوای ئەوە کاك عوسمان باسی سێ قۆناغی جودامان بۆ دەکات کە لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا بەسەر گوزەرانی ئەو پارتیزانانەدا هاتووە.ژمارەی پارتیزانەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، کەم دەکات و زیاد دەبێت.بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆر لەوانە شەهید دەکرێن لە شەڕی ناوخۆدا، ئەوە خاڵێکی زۆر سەرنج ڕاکێش بوو بۆمن وەك خوێنەرێکی ئەم بیرەوەریانە. خاڵێکی تر کە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە کاك عوسمان مجامەلەی کەسی نەکردوە، ئەوەش خاڵێکی زۆر پۆزەتیڤانەیە کە ئازایەتی تێدایە، بۆ نمونە ئەوانەی تەسلیم بوونەتەوە ئەم فەرامۆشی نەکردوە

دەڵێ تەسلیم بوونەتەوە.لەگەڵ ئەوەش دوایی لەڕاپەڕینداهەمان کارئەکتەرشەهید دەبێت، چیرۆکی زامداربوونی کاك ئازادی سەگرمە و براو خوشکەزاکەی بۆ خۆی کەرەستەی نووسینی شاکارێکە کە دەکرێ قسەی لەسەر بکەین، ئەویش بردنی برینداریکی سەرکردەیە بۆناوجەرگەی ڕژێم وبۆ پایتەختی سوڵتان لە بەغداد. بیرمە کاتێك "کاك ئازاد"بە دووداُرشەقەوە گەڕایەوە لە قاسمەڕەش بۆی باسکردین کە چۆن بردویانە بۆ بەغداد.مارپێوەدان و زەهراوی کردنی سەرچاوە ئاوییەکان و کارێز و کانییەکانیش قوربانی خۆی خواستوە تەنانەت پەلەوەرەکانیشی کوشتوە، کێ بوون کامەخۆفرۆش بوو سەرچاوە ئاوەکانی زەهراوی دەکرد؟ ئەوەش لە نادیاردا ماوەتەوە.ئەشکەوتی داری خلە:دارمانی ئەشکەوتێك وزیندە بەچاڵکردنی پۆلێك پێشمەرگە تراژیدیایەکی تری ناو ئەم بیرەوەرییانەیە، ئەگەر ئەو دوو پارتیزانەی تر خەریکی پەیوەندیکردن نەبوونایە بە جیهان، ئەوە بۆ هەتا هەتایە ئەوانەڕوفاتیشیان نەدەدۆزرانەوە وکەسیش لە نهێنی مەرگی ئەوانە تێنەدەگەیشت و ڕەنگە وەك ناپاکێکیش هەژمار بکرانایە. زۆربەی فلیمەکان کە سەیر دەکەین چیرۆکی کەسێکە یان کۆمەڵێکە کە لە گەشتێکدا ڕووداوێکیان بەسەر هاتووە، نوێترین فلیم کە دیم ۱۲۷ کاژمێر بوو، گەنجێك بەردێك دەستی دەگەزێت و ئەویش ناچار دەبێت دەستی خۆی ببڕێت، دەبێتە باشترین فلیمەکانی ساڵ.سەیربکەن ئەشکەوتێك دەڕوخێت بەسەر پۆلێ پارتیزاندا و بێدەنگ دەڕوات و کەس باسی ناکات. ئەوەی جێگەی تێرامان بوو بۆ من ئەوەبوو بۆ یەکەمین جار بوو بزانم کە کاك عوسمان باوك و برایەکی شەهید بوون بەدەستی "موجاهیدنی خەڵق " لەگەڵ ۲۵ پێشمەرگەی تردا، مجاهیدین ڕێخراوێکی تیرۆرستی دژی ئێرانە و لە نیشتمانی ئێمە لەگەڵ ڕژێمی سەدامدا هاوشانی ئەوان دژی گەلەکەمان بووە.ئەوەی لای من جێگەی نیگەرانییە تاکو ئێستا ئەم کەیسە واتە کەیسی کۆمەکی موجاهید بۆ

سەدام نەکراوەتە بابەت و ڕانەکێشراون بۆ بەردەم دادگا، لەکاتێکدا کورد بالأدەستە لە بەغداد و سەرۆك کۆمار کوردە و جێگری سەرۆك وەزیرانیش هەر کوردە، دەیان گزیر و وەزیریشمان هەیە، بەلأم کەس باسی ئەم کەیسەی نەکردووە، یان ئێمە نەمان بیستوە.

بەر لەوەی کۆتایی بە م نوسینەبێنم باسی چیرۆکی وەفای سەگەکەش باس کەم کە لە ناخەوە منی هەژان دوایش هەمان سەگ بۆ ئەوەی خاوەنەکەی جێنەهێڵێت لەبرسا گیان دەسپێرێت،دیارە ئێمە چیرۆکی ئەوسەگەشمان بیستبووکە قەپ دەکات بەدەمی ئەو شۆفڵەدا کە دەیەوێت خانووی خاوەنەکەی بڕوخێنێت.بەلأم ئەو چیرۆکەی کاك عوسمان باسی دەکات،خوێنەر لەبەردەم ویژداندا رادەگرێت.

قۆناغی سێهەم کاتێك دەست پێدەکات کە ڕژێمی بەعس، کوێت داگیر دەکات، ئینجا پارتیزانەکان ڕەوتی ژیانیان دەگۆڕێ و لەشارەکان هێزی "سرك" سوپای ڕزگاری کوردستان دروست دەکەن لە ئۆردوگا و شارەکانی نیشتمان.

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو بۆ من ئەوەیە کە نووسەرانی ئێمە نایەن لەسەر بابەتێکی وا بنووسن، کە پڕێتی لە خۆبووردەیی و قوربانیدان و باسی تاریکترین کاتێك دەکات لە مێژووی باشوری نیشتمان،بەلأم لەسەردەیان شتی پوچ و بێکەڵك قسەدەکەن ولابەڕە ڕەش دەکەنەوە. لەهەمووی سەیرتر لای من بێدەنگی "یەکێتی نیشتمانی کوردستان" و مێدیای ئەم پارتەیە! لەکاتێکدا نووسەر نەیشاردۆتەوە کە ئەو مێژوە پڕشنگدارە مێژووی یەکێتییە، بەڕێزیشەوە باسی کارەکتەرەکانی دەکات لەناو بیرەوەرییەکەیدا.من لای خۆمەوە دەستخۆشی لە کاك عوسمان دەکەم کە بێبەشی نەکردین لە بیرەوەرییەك کە هەموومان دەبێ شانازی پێوە بکەین.



# هوشیاری مین و خەباتی پارتیزانی

پۆلێك لە پێشمەرگەپارتیزانەکانی گەرمیان لە سنوری شاخی بەمۆو هەواڵی پەرینی قاچی وشیار هەڵبجەییان پێ دەاگا کەهاوسەفەری ڕەتڵەکە و دەلیلی پاککردنەوەی مینی سەرڕێگاکانیان دەبێ دوای هەواڵە کەکاك عوسمانی حاجی مەحمود چەند کەسێك دەست نیشان دەکات ( سامی ئاسایش و حاجی عوسمان و محمد مالیە) بۆ ئەوەی بیگەیننەشوێنێکی سەلامەت، لەو کاتەدا مینێکی فسفۆری تر دەتەقیەوە، کاك عوسمان جیهازەکە لە دەستی دەپەڕێ، هاواردەکات:

(- دوورکەونەوە.. ئەگەر مینی تر تەقیەوە تەنها با من تیا بچم )

کاك سەلام کوێخا عزیز و کاك صدیق سۆفی مەجیدوکاك سامی، بەدار.. دارەمەیتی بۆدروست دەکەن ودەیخەنە سەرپشتی هێسترێك، دوای ڕێگایەکی دوور و درێژ بەنێوان دەیان کێڵگەی مین وسەربازگەدا دووری دەخەنەوە، بەوحاڵەشەوە لەڕێگا ئەو ڕێنماییان دەکات، تا نەکەونەکێڵگەی مینی ترەوە، لەپاڵ بەردێکدا پشوویەك دەدەن، تەماشادەکەن مینەکەقاچی سوتاندووە..هەربۆیەنزیفی نەکردووە...

بۆ بەیانی ڕۆژ دەبێتەوە دەگەنە شوێنێکی سەلامەت..ئەووێنەیەی سەرەوە ئەوڕۆژە لەکاتی پشوودانادا چرکێندراوە، دیارە وشیار هەردوو قاچی قەرتاوە،یەکەم قاچی لە گەڵ پارتیزانەکان قاچەکەی تریشی لەچالاکییەکی تردا..



## حمە ڕەحیمی جیهاز

## پیاوێك هەمیشە وەك شاخی زەردە خۆڕاگر

پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان (حمە ڕەحیمی جیهازە )

- لە شاری سلێمانی لەدایك بووە
- خوێندنی هەرلەسلێمانی بووە
- لە حەفتاکاندا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە وەدەکات..
- سەرەتای ساڵی 1980 دەبێتە پێشمەرگە لە گەرمیان
- هەمیشە توندو تۆڵ بەهیممەت وره بەخش و بەقەولی کوردی خۆمان کوڕی ڕۆژی تەنگانە ، بەشداری زۆرێك لەشەڕ و پێکدانەکانی کوردستان و ڕۆژهەڵات دەکات.
- لەکاتی ئەنفالەکانیش لە گەرمیان لەگەڵ مەفرەزە پارتیزانەکان دەمێنێتەوە و لە ڕاپەڕینە مەزنەکەش کاریگەری تەواوی دەبێت لە ڕێکخستن و هاندانی جەماوەردا .
- دوای دروست بوونی لەشکری کوردستان لە هێزی پێشمەرگە کار دەکات و هەمیشە شەونخونی دەکات بۆ پاراستنی کوردستان ..
- ساڵی 2015 بەهۆی بۆمبی چێنراوی داعش لەگەڵ دوو هاوڕێی لەناوسەیارەیەك بۆمبیان پێداتەقیەوە و بەقورسی بریندار دەبێ و هاوڕێ کانیشی شەهید دەبن .
- ئێستا جێگری میحوەری گەرمەسێرە بە گۆچانەکەی دەستی یەوە بەپلەی لیوای هێزی پێشمەرگە ، تەمەن درێژ و تەندروست بێت..



## کاك عەدنان و هاورێکانی

دوای مانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لە خەباتی سەختی پارتیزانی لەگەرمیاندا *لە رۆژی 1988/11/23کاك عدنان حەمەی مینا و هەڤاڵان محمودی مامەعەزە، حەمەرەحیمی جیهاز.حەمەپارێوڵە،سەلام رەسوڵ،شێخ محمود،مەلاکریم، صدیق علی توفیق وچەند پارتیزانێکی تر، گەرمیانی وێرانەیان بەجیهێشت و ملیان لەهەزاران تاشەبەردی بناری شاخە سەربڵندەکانی فەرەداغ ناو بەسەردەیان بەردەبازدا پەڕینەوەودەشتی گەرمیانیان تەیکردو...

لەڕێگای(بەمۆ)وە،گەڕانەوە بەرەو بارەگاکانی سەرسنووری ئێران.

*1989/1/18دەستەیەك لە پارتیزانەکان بەفەرماندەیی عوسمانی حاجی محمود لەنزیك دوز وسلێمان بەگ دوو چالاکی ئەنجام دەدەن و دەگەڕێنەوە بارەگاکانیان.

بۆرۆژی دواتر دوژمن بەهێزێکی زۆرەوە ئەچێتەناوچەکەو شوێن پێ پێشمەرگەکان هەڵدەگرێ تابیان دۆزیتەوە بەڵام سوودی نابێ.

*شەوی1989/1/19هەرکە پارتیزانەکان هەواڵی چالاکییەکانی قولآیی گەرمیان دەبیسن بڕیاردەدەن بازنەی خامۆشی بشکێنن،دەستەکەی کاك حەمەڕەش خۆیان سازدەدەنەوەولەپەلامارێکی بروسکە ئاسادا هەڵمەت دەبەنە سەر ڕەبیەکەی نزیك گوندی وێرتنەی(زینانە)ودەست بەسەریدادەگرن،دەسکەوتی پێشمەرگەکان:

(6)پارچەجەك دەبێت. پێشمەرگەکان بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە ،بۆرۆژی دواتر رژێم کێومالێکی تری ناوچەکە دەکات.

*رۆژانی6و7ی شوبات هێزێکی زۆر لەجاشە شڕەخۆرەکان دەچنەگوندەکانی (پێنج ئەنگوست)و(درۆزنە)و(مەسۆیی) پترلە 24 کاتژمێرلەژێرچاودێری پێشمەرگە پارتیزانەکاندا دەبن،بەلام پێشمەرگەکان خۆیان دەپارێزن.

*1989/2/14 بەفروبارانێکی زۆردەباری، کاك حەمەڕەش بە بروسکەیەکی (6) خالی بەرێز (م.س)ی یەکێتی لەبارودۆخ وپێداویستیەکان ئاگادار دەکاتەوە.

 رۆژی15/2/1988هێزێکی زۆری جاش دەکەونە کێومالکردنی بناری ئاشداخ ،بەمەبەستی دۆزینەوەی شوێنەوارێکی پارتیزانەکان دەچنە گوندەکانی(خێل ئاخە)و(مراد ئەلی) لەزەمینەوە لەژێرچاودیری هەوالگری سەربازی ولەئاسمانەوە هەلیکۆپتەر پارێزگارییان لێدەکات و بۆ شەو دەگەڕێنەوە.

* ئەم گەڕانەوەبە لە نامەیەکی شەهید حەمە ڕەش بۆ ڕێکخراوی سلێمانی لەرێکەوتی 20 1988/12 دا باس کراوە



هاوینی ١٩٨٩ دەوروبەری دزلی ئەو کاتەی مەفرەزەیەکی پارتیزانەکانی گەرمیان گەرابونەوە بۆ سنورەکان بۆ پشوودان...ئەوانەی ئەناسرێنەوە.. :

احمد حاجی رشید،ملارحیم،مام ناجی، هونەرشێخ علی،ئاری رەئوف بێگەرد، ناوی نەزانراوە، شەهید سید بابا،شەهید عمر سەنگاوی، شەهید علی فقێ مستەفایی، حمەرەشید . نەبەرد ،

دانیشتوەکان :

شەهید عبدولا، شەهید تاهیرە بچکۆل، شەهیدکامران ، شەهید خەباتە ، شەهید علی م،جلال شێخ کەریم ، شکور قەرەبلاخی، عادل، جمال

* سەرچاوە :

www.facebook.com/jalalkarimessa



# مامۆستا کاکەڕەش

## دەربارەی پارتیزانەکان وتی:

دوای کشانەوەمان لەگەرمیان کەوتینەسنووری تیپەکانی (21) ی کەرکوك و (25) ی خاڵخالآن لەویٚ هیٚزەکەمان کرا بە دووبەشەوە.

**<u>* بەشی یەکەم :</u>**

(تیپی59 ی حەمرین)و(تیپی 57ی سەگرمە)وچەندپیٚشمەرگەیەکی دەستە جیاجیاکانی مەلبەند کەپترلە (200) پ.م دەبووین کەوتینە سنووری شوان و قەلآسیٚوکە. شەوەکەی کاك شیٚخ جەعفەر بەجیهازە (هۆکیتۆکی)ئاگاداری کردینەوە مەجالی پەڕینەوەنەماوە، خۆتان چارەی خۆتان بکەن، هەرئەوشەوە چووینە گوندی باوەفەتی.لەدوای شاڵاوەکانی ئەنفالی چوار هاوڕیٚلەگەڵ کاك سیروانی کویٚخاو چەند هەڤاڵیٚکی تری ئەوسنووورە، دووبارە گەڕاینەوە بۆبەری گەرمیان.

*** بەشی دووەم:**

کە سەدان پ.م) دەبوون ئەوان پیٚشترفریاکەوتبوون پەڕیبوونەوە بۆ شەوبەری دەشتی کۆیە وگەیشتبوونە لای کاك قادری حاجی عەلی و کاك شیٚخ جەعفەرو برادەرانی ئەوسنووورە.

لە10ی ئایار لەگەڵ هەڤاڵان(جەلالی شیٚخ کریم،عادل نادر،سیروان دیٚڕەشەیی. جەلال مەسۆیی، قادرمەملی، کاك هیٚمن، کویٚخاسیروان،کاك محەمەدقەرەداغی.

چووینە گوندی(کانی سارد)و لەوێ کۆبوونەوەیەکمان ئەنجام دا، بەرلەرۆژی 1988 /5/15 بڕیارمان دا کە پێشمەرگەکان بکەین بە دوو هێز:

*** هێزی یەکەم:**

کە بریتی بوون لە (کاک هیمن،سیروان کوێخا،رەفعەت چەمچەماڵی،سیروان دێرەشە، عادل نادر،مامۆستاجلال شێخ کریم،هەڤاڵەکانیان.. لەناوچەی هەمەوەند مانەوە.

***هێزی دووەم:**

کە پیکهاتبووین لە(جەلال مەسۆیی،قادرمەملی،حاکم محەمەدقەراغی، سەرداری سەعەجوقلی،شێرکۆجدی، شوانەی کادر،مامۆستاکاکەرەش،حەمەرەحیمی عەدەد جیهازی مەڵبەند،ونزیکەی(50)پ.م لەهەڤالآن کەوتینەڕێ بۆدەورووبەری (گۆلباخ). ماوەیەك لەوسنوورەماینەوە،لەمانگەکانی حوزەیران وتەممووزدا چەندین پێشمەرگە خۆیان تەسلیم کردەوە،ئەوئازووقەخواردنانەی لەهەردەکانی(زەنگنە)کۆکرابوونەوە، هەموویان تیکەڵ وپێکەل وپیس کردبوو،گومانیان لەلامان دروست کرد،پاشان پڕوپاگەندەی ژاراوی بوونیان بلآوبۆوە،هەربۆیە ناچاربووین خۆمان لەخواردنیان بپارێزین،ئەوماوەیە هیچ خواردنیکمان دەستنەکەوت بەناچاری هەر فەریکەجۆمان دەخوارد..لەوماوەیەدا ئیدارەی مەڵبەند کە بریتی بوون لەکاك سەردارسعیدو کاك محەمەدقەرەداغی ودەستەیەك پێشمەرگە لە رێگای قەرەداغ و شارەزوورەوە کەوتنەڕێ بەرەوبارەگاکانی سەرسنوور. منیش لەگەڵ چەندهەڤالێك خۆم گەیاندە لای کاك حەمەرەش، ماوەی (15)رۆژ لەلای ئەوان مامەوە.ئەوماوەیە زۆربەناخۆشی ژیانمان بەسەردەبرد..

هەر چۆنێك بوو تا15 /1988/9لەگەرمیان خۆمان راگرت...



## پارتیزانی دوای ئەنفال

# حەمەڕەشید توکنی

### گەڕانەوە لە مەرگ

کۆتای هاتنی لیبوردنەکە بەکێو ماڵ کردن و پە لاماری وژمن دە ستی پێکرد ،ئە گە بیرەوەریم بارمە تیم بدات لە 1988/10/7 بوو، لە سە ر هە مان تە وژمی پێشتر سە رقاڵی کۆ کردنە وە ی خواردن و پێداویستی بووین لە چە می (سە رکانی) نزیك گوندی (عەلیانی گەورە) .

پاش نیوەڕۆ هێزێکی زۆری دوژمنمان بینی لە گوندی (بنەکەی خەپەکوێر)ە وە بۆ ئاراستە ی گوندی (عە لیانی گەورە) دێت.بەپەلە کەلوپەلە کانمان کۆکردە وە و بەرە و گوندی (قولیجانی ئەمین قارەمان) رۆیشتین،ئێوارە چووینە (تەنگی قە لأسوور) شیوێکی قوڵ بووئەشکەوتێکی گەورەو سەختی تێدابوو شوێنەکە زۆر باش ولەبار بووبۆمانەوە کە کە دەکەوتە نێوان گوندی (قولیجانی سەرحەد)و (قولیجانی ئە مین قرەمان) ەوە،ڕۆژی دواتریش لەوێ ماینە وە ،بۆ ئێوارە هێزێکی زوری دوژمن گە یشتنە گوندی (قولیجانی ئەمین قارەمان).

شەو پێچامانە وە ڕۆیشتین بۆ نێوان گوندی(قولیجانی سەرحەد)و(كوردەمیر)بۆ تەنكی (بانەچەرمو) كە(مەلارەحیم) پێشنیازی شوێنەكەی كرد،نزیكەی پێنج سەدمەترێك دەكەوێتە ڕۆژهەلاتی گوندی(قولیجانی سەرحەد)وەو ڕۆژئاوای گوندی (كوردەمێر)ەوە، شوێنی ناوبراو كە كونێكی ( 3.1.5) مەتربوو بەقەد پالێكەوە لە ناو شیوێكدا بوو.ئەو ڕۆژە بەبەردەوامی كۆپتەر بە سەر ئاسمانی ناوچەكەدا دەسوڕایەوە بۆ ئێوارەكەی هێزەكەی دوژمن گەیشتنە گوندی(قولیجانی سەرحەد) شوێنەكەمان ئەوەندە لە گوندەكەوە نزیك بوو بە سانایی گویمان لەدەنگی هێزە كەی دوژمن بوو. ،پاش تاریك بوون چوومە سەر بەرزاییەكەی نزیك شیوەكە كە ئێمەی تێدابووین بۆ گوێگرتن لە هێزەكەی دوژمن،وادەزانم ئێستەیە گوێم لێ بوو یەكێك لە جاشەكان بانگی دەكرد:

. حەمید. ..حەمید....! وەرە (حەرەسیت)پاسەوانیت .

دیسان ،حەمید...حەمید وەرە حەرەسیت.هاتمە خوارەوە ڕوداوە كەم بۆبرادەران گێڕایەو وپێم ووتن برادەران پێم باش تازووە لێرە بڕۆین و مشوری شوێنی سبەی بخۆین.كەوتینە گفتووگۆكردن لە سەرڕۆیشتن یان مانەوەمان ، هەندێكمان پێمان وا بوو دەبێت ئێرە بە جێبهێلین ، هەندێكی بە ئاساییان دەزانی وپێیان لەسەرمانەوە دادەگرت،هەندێك بێدەنگ بوون،من و(جمال شێخ حەمید)ی زۆر پێمان لە سەر ڕۆیشتن دادەگرت ،و وتم ئەوەی من گوێم لە دەنگی گۆڕینی پاسەوانەكانیان بووە هەركەستان بوایەن هەمان بۆچوونی منتان دەبوو،باوەڕ بكەن ئەگەر خەلكی شەرمنیان تێدا هەبێت بۆ دەست بەئاو سبەی دێتە ئێرە و دەمان دۆزێنەو ئەو پەندە وەك خۆی جێبەجی دەبێت كەدەلێن( ئەوەی بۆ گووكەر هەلدەكەوێ بۆ ڕاوكەر هەلناكەوێ) ،وە ئەگەر كێومالێ بكرێت یەكەم هەنگاو لەئێرە دەستپێدەكەن چوونكە دوژمن وەك لەڕۆژانی پێشوو بینیمانە هەنگاو بە هەنگاوگوند بەگوند

هاتوون ،بەدڵنیاییەوە لە لە گوندەکە دەربچن بۆ ئاڕاستەی کوردەمێر دەڕۆن کە لێرەوە تێدەپەڕن (عەلی غایب) تا بڵێیت پیاوێکی ئازاو ژیرو وردەکار بوو ،بەڵام تا بڵێیت پیاوێکی یەك لا وئینکار نە گوڕ بوو لە بۆچونی خۆیدا ،پاش یەك کاتژمێر وتوویژ لەسەر ووتەی خۆی سوور بوو بەوە کۆتای پێ هێناوبە من و جمالی ووت ماڵتان ئاوا بێت ئێوە لە هیچ شوێنێك خۆتان ناگرن .

من تورە بووم ووتم کوڕی باش ئێمە لە بەرەی شەڕدا نین تا خۆمان لە پێش دوژمن ڕابگرین ، ئێمە خەباتی پارتی زانی دەکەین،ئەو جۆرە خەباتە کاتێك تیایدا سەرکەوتوودەبیت،ئەو شەڕانەی خۆت هەڵیدەبژێریت،خۆت ئامادە دەکەی کاری لەسەردەکەیت.بەپێچەوانەشەوە ئەوشەڕانەی دووژمنەکەت هەڵی دەبژێرێت دەبێت لێی هەڵبێیت وخۆتی لێلا بدەیت،برادەران سەر زەنشتی عەلی یان کرد،هەموو وتیان: بۆ چوونەکەی تۆ ڕاستە با لێرە بڕۆین ،بەلاّ تورە بونی من هیچی لە یەکلاییەکەی علی کەمتر نەبوو ، ووتم بە خوێنی شەهیدان هەموو بڕۆن من لێرە دەمێنمەوە علی وا دەزانێت ئێمە دەترسین ،چەند دڵنیام ئەوانەی سەرمان بە ئاسمانەوە ئەستێرەن واش دڵنیام سبەی لێرە توش دەبین ئەوەی پیاوە شەڕ بکات تا دەکوژرێت.ئەوەشی پیاو نییەو خوێڕییە خوی بدات بەدەستەوە،من لێرە دەمێنمەوە هەر چیش دەبێت با ببێت .

سبەی پێش ڕووناك بوونەوە گوێدرێژەکانمان برد لە دووری دووکیلۆمەتێکەوە بەرەڵامان کردن بۆ ئەوەی لێمانەوە دوور بن ئەگەر دوژمن بینیانی وگومانی ئەوەیان کرد هی پێشمەرگەیە لو کاتەدا لەو دەوروبەرە بۆی دەگەڕێن ،بە پەلە نان و چامان خواردو چی کەل و پەل و پێداویستیمان پێ بوو شاردمانەوە ،جیهازێکی ڕاکاڵی بچوکمان پێبوو بردم بۆ شاردنەوە ،وتیان جیهازەکە بۆ دەشاریتەوە ،ووتم

من دەزانم ئەمڕۆ دەکوژرێین با جیهازەکە دەست دوژمن نەکەوێت لە سەرووی خۆمانەوە خستمە ژێر خۆڵەوە

پاش نان و چاخواردن هەندێ چای لە ناو کتریەکدا مابوو کردمانە سەر ئاگرەکە و هەندێ لمعان کردە سەری ،ئەو کونە ئەشکەوتەی ڕۆژی پێشوو تیایدا بوین لە ناو شیوەکەوە دەمی بەرزو کراوە بوو،ئەوەندە دڵنیا بووین دێنە سەرمان ئەو کونەمان بەجێهێشت وچوینە کونێکی خوارتر کە سەد مەترێك لێوە دوور بوو،کونەتازە کە لە ناو شیوەکەوە نزیکەی حەوت مەتردوور دەبوو دوو مەترێك خۆڵ بەسەریەوە بوو گەورەیی لە ناو کونەکە (1/5. 3)مەتر دەبوو بەرزییەکەی نزیکەی هەشتا تا نەوت سم دەبوو، سەرەوەو تەنیشتەکانی خاکێکی پتەوتوند بوو لە تێکەڵەی بەرد و خۆڵ و لم بوو لە شێوەی کۆنکریت کە ئێمە پێی دەڵێن(غار)بنەوەی گڵێکی نەرم بوو،لەگەڵ دوونیا ڕوناك بونەوەداوپێش هەتا ودەرچوون چووینە ناو کونەکەوە کاتێك بینیمان جاش و سەربازەکان هاتنە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی گوندەکە بەرووی ئێمەدا، لەگەڵ خۆماندا و بە دوای خۆماندا بە بنچك وچەند لقە ژاڵەیەك وەك چان بە کێشمان کردو شوێن پێکانمان سریەوە لە ناو شیوەکەدا تا پێش کونەکە چوینە ناوییەوە ،شەهید کاکە دوا کەس بوو چەند لقە ژاڵەیەکی پێ بوو و تا هیچ شوێن پێیەك نە هێڵێت لە پێش کونەکە دا دانیشت بۆئاگاداری دەرەوە .

کاتێك چووینە کونەکەوە بینیمان زۆر بچووك و نزمە ناتوانین بە ئاسانی تیایدا دابنیشین بە پەلە بەنێزە و زمەی تفەنگەکانمان هەرکەس لای خۆیەوە دەستی کرد بە هەڵکەندنی خۆڵکەی ژێری خۆی و دەست بە دەست بۆ پێش کونەکە پاڵ دەنا .

ڕەنگە لە چەند خولەکێکدا پازدە سم زیاترمان هەڵکەندبێ و خۆڵەکەمان دەخستە پێش دەرگای کونەکە کەمەترێك زیاتر بەرز دەبوو .

کاتژمێر حەوت بوو دەنگێك لەسەر سەرمانەوە هات و شەهید کاکە بە پەلە هاتە ژوورەوە و وتی هاتن ، گوێمان لێ بوو بە کوردی دەدوان ،بڕیارماندا من و (عوسمان تلیشانی و سەباح شێخ حەمیدی) لە پێشەوەی کونەکەوە بین و چاوەڕوانی هەر دوژمنێك بین کەسەر دەکات بەناو کونەکەدا، بیکوژین و بە دەست ڕێژ بە ناو ئەوهێزەی کە لە پێش مانن و ئەوانی دیکەش بە دواماندا دەرچن و بلاْوە بکەین و سەنکەر بگرین و شەڕ بکەین تا کۆتای ژیانمان ،ووتمان کەس بەکوێرانە فیشەك نەتەقێنی ئەگەر دڵنیا نەبێت دوژمنێك دەکوژێت .

وە کەس بیر لە هەڵهاتن و خۆ بەدەستەوەدان نەکاتەوە ،دەبێت شەڕێك بکەین دوژمن شاهیدی بۆ قارەمانی و گیان فیدای ئێمەو پێشمەرگە بدات .

هەوڵی تەواو بدەین لە یەکەم دەست کردنەوە و دەست ڕێژدا چی لە ناو شیوەکەو بەر دەستمانە بکوژرێت و دەرباز نەبن ،یەکەم بۆ ئەوەی دوژمن بە شێوەیەك چاوی بشکێ بە ئاسانی نەتوانن لێمان نزیك ببنەوە .

دووەم بۆ ئەوەی چەك و تەقەمەنی زۆر بەر دەستمان بکەوێت تاکوبەرگری زیاتر بکەین و ژمارەیەکی زیاتر لەدووژمن بکوژین تا کۆتای ژیانمان بەرگری بکەین هەر بۆیە ئێمە هەرسێکمان لە پێش کونەکەوە دانیشتین و دەستمان لە سەر پەلە پیتکەی تفەنگەکانمان بوو دەنگەکە بە تەنیشتماندا هاتە خوارەوە بۆ ناو شیوەکەی پێشمان ، بینیمان چوار جاشن لەلای ڕۆژئاوامانەوە بە بیست مەترێك،کەمێك لە ناو شیوەکەدا وەستان و ئینجا سەرکەوتنە سەرەوە بۆسەرکەنەکەی بەرامبەرمان کە پازدە مەترێك لێمانەوە دوور دەبوو، دوانیان لەسەر کەنەکە و ەستان وتەماشای ناو شیوەکەیان دەکرد.یەکیان وتی: وەڵابەدڵنیاییەوە ئەمە شوێنی خۆیانە.

ئەوەندە بە جوانی وئاسایی تەماشام دەکرد ئەگەر وێنەکێش بوایەم پاش سی ساڵ ئێستەش وێنەم دەکێشا ،پیاوێکی بالاْ مام ناوەند دەموچاوێك ڕێکی گەنم ڕەنگ

قاتێکی خاکی قەمسەڵەیەکی لایلۆنی شینی لە بەردا بوو ، جامانەیەکی قوتی لە سەر نابوو کلاشینکۆفێکی سیوخۆی قۆناغداری بە شانەوە بوو ، هاوڕێکانی بەرەو ئاڕاستەی گوندی (کوردەمێر) ڕۆشتن پاش چەند خولەکێك ئەویش بەدوایاندا ڕۆیشت، هەندێ لە برادەران پێشنیازیان کرد لە کونەکە دەرچین و بەرەو ئاڕاستەی باکور ڕۆژهەلات بەرەو چەمی (لاهێن) هەڵبێین .

بە تایبەت (سەباح)کە یەکەم کەس بوو ئەو پێشنیازەی کردو زۆریش لە سەری ڕۆیشت ،هەندێکمان بە تایبەتی من زۆر بە توندی دژی بۆچوونەکەی بووم ووتم ئەوە کاری خۆکوژییە لەکاتێکدا چواردەورمان هێزی دوژمنە وگوندی (قولیجان) حەوسەدمەتر لێمانەوە دوورە... بۆ کوێ دەچیت ڕوو لە کوێ دەکەیت دوژمن تەنیویەتی و کۆپتەر وەك خۆرو مانگ و ئەستێرە بەسەر سەرتەوەیە،کێ دەڵێت لەگەڵ دەرچونمان کۆپتەر نایەتە سەرمان، لە دوو ڕۆژی ڕابردوودا بینیمان لە بەیانی تا ئێوارە کۆپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەوە یە .

شەهید کاکەووتی: ئێرە زۆر نزیکە بەخوا ئێستا دیسانەوە دێنەوە سەرمان .

منیش ووتم : واز لەم قسانە بێنن نزیك بێت ودوور بێت،باش بێت و خراپ بێت بەم بەیانیە ناتوانین لێرە دەربچین،مەیکەن بەحاڵی شەو من دەمگوت نزیکە ئێرە بەکەڵك نایەت ،هەندێك ئێمەی بە ترسنۆك دەزانی،هەندێکتان ئێرەتان پێ باش بوو، هەندێکتان وەك کەرەی شەربەت بێدەنگ بوون.

واز لەو قسە بێمانایانە بێنن قسەیەك بکەن بۆ ئەم شوێنە سوودی هەبێت،ئەوەی بە کەڵك بێت بۆ ئێستا هەڵکەتدنی تا کونەکە یە بۆئەوەی، یەکەم گەورەبوونەی ئەشکەتەکەو شوێنەکەمان کە خەریکە پشتمان دەشکێ ئەوەندە چەماینەوە ،دووەم ئەوخۆڵەی هەڵیدەکەنین بکەینە پێش کونەکە بۆ ئەوەی دەمی کونەکە بچوك ببێتەوە و زۆر کراوەو جێگای سرنج نەبێت.

لە ترسی گیانی خۆماندا لە ماوەیەکی زۆر کورتدازیادسی سم ژێری خۆمانمان هەڵکەندو چاڵ کرد و خۆڵەکەمان بەچنگ دەست بەدەست پاڵ نایە پێشەوە و خستمانە پێش دەرگای کونەکە .دەرگای کونەکە مەتر زیاتر بوو ئەوەندە خۆڵمان خستە پێشی نیو مەترێکی مابوو بۆ کاتژمێر هەشت لە بان سەرمانەوە و لە ڕۆژئاوامانەوە خرەی پێ پەیدا بوو.

(سەباح) وتی: وەڵا ئەوەدەنگی سمی گوێدرێژە کانە جاشەکان کەلێرە ڕۆیشتون گوێدرێژە کانیان بینیوە خستویانەتە پێش خۆیان بزانن بۆ کوێ دەچن، بۆ ئەوەی بمان دۆزنەوە ، گوێدرێژە کانیش بۆ ئێرەیان هێناون . تا ڕادەیەك بیرکردنەوەکەی دروست بوو. بەڵام تا ئەو کاتەش گوند و دەشت و دەر گوێدرێژی زۆری لێ بوو ئەو ئەگەرە زۆر سەلمێندراو نەبوو . ئەوەندەمان زانی بە بەرزی سێ مەتر لەسەرمانەوە دەنگی بێتەل پەیدا بوو (نعم سیدی نعم سیدی) بەڵێ گەورەم بەڵێ گەورەم پەیدا بوو . من ووتم ئەرەوەڵا ئەوە جیهازەکەی خۆمانە دۆزیویانەتەوە ، بوو بە خرەی میلی چەك هێنانەوە و وەکو مێگەل بەم دیوو ئەودیوی کونەکەدا دابەزینە خوارەوە بۆ ناو شیوەکە هەموو دەیانگوت تەواوە گەورەم تەواوە ( تمام سیدی تمام) هەموو لە ناو شیوەکەدا دەگەڕان و دەستیان لەسەر بەلەپیتکەی تفەنگەکانیان بوو ، گەورەم نان گەورەم نان (سیدی خوبز سیدی خوبز ) گەورەم جگەرە گەورەم جگەرە (سیدی سیگار .سیدی سیگار ) گەورەم تەقەمەنی .....تەقەمەنی

(سیدی عیتاد عیتاد ) ئێمە هەرسێکمان لە ناو کونەکەوە تەماشا دەکەین فەردەنانەکە لەناو ئەو کونە بوو کە دوێنیی تێیدا بووین دەر هێناو نیوگونیێ پاکەتەکەی (شەهید عەلی)یان لە کونەکە دەرهێنا لەوناوە هەڵیان ڕشت وهەرسەرباز بوو پاکەتی هەڵدەگرت ،سندوقێکی هەڵنەبچڕاوی فیشی بیکەیسی کە بەیانی زوو

برادەران کردبوویانە ناو درزە بەردێکەوە بە قەد کەنەکەی بەرامبەرمانەوە دەرهێنا لەکاتێکدا پرسەریان کردبوو لەبەردو وا بەپێش چاومانەوە بەرەوپێش کونەکەدێن.
لە ناو شیوەکەی پێشمان سەربازێك لەهاوڕێکانی جیا بووەوە بەرەو ئاڕاستەی ئێمە بۆ سەرەوە دێت تا سێمەترێك ئێمە تەماشامان دەکرد لە ترسی ئەوەی نزیك بوەوە سەرمان نەبینێ سەرمان داگرد و ووتمان ئامادەبن وا هاتنە سەرەوە .
سەرمان خستۆتە سەر خۆڵەکە تەماشای سەر دەرگای کونەکە دەکەین دەستمان لە سەر بەلەپیتکەیەو بە دەستی چەپمان توند تفەنگەکانمان گرتوە و لە زەوی بەرزمان کردووەتەوە تاکو سەر ببینین و تەقەی لێبکەین ، دەنگی پێکان وردە وردە زیاد دەکات و چاوەڕوانی سەری سەربازین ، دەنگی پێکە وەستاو دڵنیاین لە پێش کونەکەیەو بۆ دیار نییە . پاش خولەکێك دەنگی پێ دەستی پێ کردەوە بەلأم دەنگەکە تا بێت کەم دەبێتەوە.
سەربازەکە ووتی(اخوان رادیو) برایان ڕادیۆ ڕادیۆیەکم دۆزیەوە سەرمان هەڵبڕی بینیمان ڕادیۆکەی شەهبد کاکە بە دەستیوەیەو بۆ خوارەوە بۆ ناو شیوەکەدەچێت هەمووسەربازەکان بە ناو شیوەکەدا پاش دە خولەکێك چوونە خوارەوە ئێمەیان بە جێ هێشت .ووتمان:
کاکە ڕادیۆکەت لە کوێیە ؟
. لەپێش کونەکە دامناوەو دوو سێ لقە ژاڵەم خستوەتە سەری .
. ئەو سەربازەی بۆتەماشاکردنی کونەکە دەهات ڕادیۆکەی تۆی بینیەوە و بووە هۆکاری دڵخۆش بوون و لە بیر چونەوەی کارەکەی کە بۆی هاتبووکەتەماشاکردنی کونەکەبوو.
. ئەی باوکەڕۆ ڕادیۆکەی من بوویردیان.خۆزگەخۆم بکوژرایەم ڕادیۆکەیان نەبردایە.

شەمید کاکە بەشێوەیەك ئارەزووی لەڕادیۆو کاتژمێری هەبوو وەك ئالودەبوویەك وابوو،ڕادیۆکەی لەشێوە ڕادیۆییەکی گەورەبوو ئەوکات پێیان دەووت (ئەبوخریتە)، (ئەبو نەخشە)لەگەڵ کاتژمێری ڕیکۆی گەورە شەو و ڕۆژ کە دەخەوت یان دەچوینە کون و ئەشکەوتەوە لە ترسی شکانیان لە شوێنێکی باش دوور لە دەست و پێ دایانی دەنا(مەلارەحیم) ووتی:

بەڵێن بێت ئەگەر ئەمڕۆ ڕزگارمان بوو ڕادیۆیەکی وەك ئەوەی خۆتت بۆ دێنم . ئاخر ئەگەر ئەبو خرتیەی گەورە نەبێت نامەوێت.

پاش پێنج خولەك هێشتا سەربازەکان چل مەترێك لێمان دوور نە کەوتبوونەوە ، ئەوەندەمان زانی وەك گاگەل و گەلە سەگ زیاد لە سەد جاش لە سەروی شیوەکەوە هاتنە خوارەوە  گەیشتنە نانەکە کەسەربازەکان هەڵیان ڕشتبوو ،ووتیان :

ها ها نانەکە ئەوەندە نەرمە هی ئەمڕۆیە هاها بەتانی ، هاها دبەی ئاو .

ئێمە لە ناو کونەکەوە تەماشایان دەکەین، بن بەردوبنچك و بن کاچەکان دەگەڕان گەیشتنە پێش کونەکە کە ئێمەی تێدا بووین، جاشێك لەسەر شوێنی ئاگرەکە دانیشت و لمەکەی سەر کوانووەکەی لادا و دەستی خستە سەری و ووتی: سەمە ...سەمە بە شەرەفم ئەم بەیانیە لێرە بوونەکوڕی خوا تڵپە چاییەکە تەڕە،هاوڕێکەی ووتی:خۆزگە ئەم بەیانیە منیش لێرە دەبووم.

ووتمان:هەر ئێستا جاش بەهۆی گەڕان بەدوای شەڕە خۆریدا دێن بۆتەماشاکردنی کونەکەو دەماندۆزنەوە ، برادەران زۆریان دەپاڕانەوە  خوایە گیان کوێریان بکەیت، پێغەمبەر چاویان ببەستیت،خوایە گیان بە گەورەیی خۆت ڕەحمان پێبکەیت ،غایب چەند جارێك ووتی : مەولوی پێغەمبەر کوێریان بکەیت ، خوایە گیان مەولوم لێ قبوڵ بکەیت،خوایە بە دڵ لێت دەپاڕێمەوە ،بەمن ووتی:ڕەشە ئەوە ناپاڕێیتەوەو هاوار بۆ خوا ناکەیت ؟

ووتم:من باوەڕم پێی نییە و هاواریشی بۆ ناکەم .

زۆر لە برادەران هاواریان دەکرد و مەولودیان دەکرد و دەپاڕانەوە .

باوەڕ بکە یەکێك لە برادەرانم سنگی نزیکم بوو گوێم لە ترپەی دڵی بوو،دڵمان ئەوەندە بە خێرایی لێی دەدا خەریك بوو لە سینگمان بێتە دەرەوە بەڵام ئەوهاوار و پاڕانەوە مانای ئەوە نەبوو دەترساین بەڵکو باوەڕ بەخوا بوون کە پێیان وا بوو فریاد ڕەسیانە، ئەو برادەرانە کە هاواریان دەکرد هەموویانم لە شەڕدا بینیوە زۆر لە من ئازاتر و بە دەست و برد تربوون .

وەك شریت بەدوای یەکدا ژیانی ڕابردووی خۆم دەهاتە وەپێش چاو کە چۆن لە وەتی خۆم ناسیوە و هەستم بە ژیان کردووە لە دەردە سەری و نەهامەتیدا ژیاوم.

وتەکەی دایکم هاتەوە یاد کە پێی دەوتم :کوڕم مەبە بە پێشمەرگە دەکوژرێیت ئەگەر بەزەیت بە خۆتدا نایەت بەزەیت بەمندابێتەوە .

یەکەم چرکەساتی بوون بە پێشمەرگەم هاتەوە یاد کە پێیان وتم :پێشمەرگایەتی مانای قوربانی دان و فیداکاری وکوشتن و بریندار بوون و تینوێتی و برسێتیە .

ئەو وێنە و ووتانە یەك بەدوای یەکدا بە بیرمدا دەهات و وەك شاشەی تەلەفیزیۆن بە پێش چاومدا دە هات دەچوو.بە پێش چاومەوە بوو چۆن لە کونەکەوە بە دەستڕێژی گوولە دەردەچیز ودەکەوینە گیانی دوژمن و ژمارەیەکی زۆر جاش و سەرباز دەکوژین .

دواجار کۆپتەر بان سەرمان لێدەگریٚ و بە شەست تیر لێمان دەدات .

هاورێکانم دەبینی دەست و لاق وسەرییێو بەشێك لە جەستەیان پێوە نەماوە. جاش و سەربازەکان لاشەکانمان ڕادەکێشێن و لەسەر یەك کەڵەکەمان دەکەن ولە ئیفای سەربازی بارمان دەکەن ،دواجار تەرمەکانمان دەبەن بەناوشاردا دەیسوڕێننەوە بۆچاو شکاندنی خەڵکی شۆڕشگێڕ و کوردپەروەر،جاشەکان لە ناو

شیوەکەدا بلاو بونەتەوە هەموو شوێنێك دەگەڕان ،لەگەڵ گەیشتن بە پێش کونەکە، ووتمان : وا ئێستە دێنە سەرەوە ،لە تاریکی ناو کونەکەوە تەماشایان دەکەین ، چاوەڕوانی ئەوە بووین لەشیوەکەوە سەرکەون بۆ ئاراستەی ئێمە، لە پڕ ئەفسەرەکە کە حەفتا مەترێك لە ئێمەوە دوور کەوتبووەوە لەگەڵ سەربازەکاندا بە دەنگی بەرز بانگی کرد (یالا کاکات).

لەگەڵ بانگی ئەفسەرەکەدا دەستیان لە گەڕان هەڵگرت و وەك گا گەل و تولەو تانجی بە دوای یەکدا بە کۆمەڵ دوای سەربازەکان کەوتن، بانگ کردنی ئەفسەرەکە نەبوایە جاشەکان دەمانیان دۆزیوە ، چونکە ئەوەندە بەوردی دەگەڕان دەتگوت بۆ میرو وزەنگیانە دەگەڕێن .

جاشەکان لە شیوەکە دەرچوون و بۆ ئاڕاستەی گوندی(کوردە مێر)ڕۆیشتن . هەناسەیەکمان هەڵکێشاو وتمان : ئۆخەی ئەم جارەش ڕزگار بووین،پێنج خولەك پاش ڕۆیشتنی هێزەکە هەر ئەوەندەمان زانی سێ کۆپتەر خۆیانکرد بە شیوەکەدا نیو کاتژمێر بە ناو شیوەکەدا وەك ئۆتۆمبێلی ناو کۆڵانەکانی شاردەڕۆیشتن ودەهاتنەوە ووتمان :

هەڵبەتە ئەم هێزە بەبێتەل بە هەلیکۆپتەرەکانیان ووتووە شوێنەکەمان دۆزیوەتەوە ئەم بەیانیە لێرە بوونە پێش ئێمە دەرچوونە بۆیان بگەڕێن تا بیاندۆزینەوە .

زۆر ترساین بنیشنەوە ئەوەندە نزم بوو فڕۆکەوان وعەدەد دۆشکە کە بە دەمانچەش تەقەمان لێیان بکردایە دەمانپێکا ،کۆپتەرەکان ڕۆیشتن .

سەباح ووتی بەس نەبوو بە گوێی منتان نەکرد لێرە دەرنەچووین، هەرگیز دەرباز بوونمان نەدەبوو لێرە دەربچوایەین چوونکە لە جاش و سەرباز ڕزگارمان بوایە لەکۆپتەر ڕزگارمان نەدەبوو .

تا کاتژمێر حەوتی ئێوارە نەمانتوانی لە کونەکە بێینە دەرەوە لە ترسی ئەوەی پێمان وا بوو جاش و سەربازیان لەو نزیکە دانابێت بۆ چاودێری کردنمان .

کاتژمێر حەوتی ئێوارە پاش دوازدە کاتژمێر لە کونەکەدەرچووین بەبێ میز کردن و نان خواردن،ئەوەندە دانیشتبووین و پێمان ڕانەکێشا بوو دەر چووینە دەرەوە نەمان دەتوانی بە پێوە ڕبوەستین ،پاش تاریک بوون لەوێ بەرێکەوتین،شەو چووین بۆ ژێر زەمینەکەی سەر چەمی ئاوەسپی لە نێوان گوندی (خان خواروو) و( بابا بەکر).

**ئەو پێشمەرگانەی پێکەوە ئەو مەرگەمان بەڕێ خست پێك هاتبوولە :**

1. شەهید کاکە توکنی
2. شەهید کامەران مامۆستا هیدایەت
3. عوسمان تلیشانی
4. مەلا ڕەحیم
5. غایب حوسێن
6. سەباح شیخ حەمیدی
7. جەمال شێخ حەمیدی
8. عەلی غایب
9. شکور ئیسماعیل
10. حەمەڕەشید توکنی

* سەرچاوە : https://www.facebook.com/burhan.hamaxan.3

## بیرەوەری پارتزانێك

## لێبوردنی گشتی..

بەردەوام سەرقاڵی کۆکردنەوەی خواردن بووین.ڕۆژ تائێوارە بەبێ ئەوەی بوەستین و ئاگامان لەماندووبوون هەبێ.وەك ئۆتۆمۆبێلی بێکیلۆمەتر ڕێگامن دەبری تا ئێوارە.ئێوارە دەگەراینەوە بۆشوێنی حەوانەوە ئەوەندە ئاردو تۆز بەسەرو ریش و لەشمانەوە بوو بەلۆینە( ئاشەوان)ی ئاشمان دەکرد. چەند ڕۆژێکی پێشتر غایب لەگەڵ شەهید کاك ئەحمەد بۆ ئەرکێك چووبون.

لەناو کەلاوە روخاوە کانی گوندی توکندا ژمارەیەك خەلکی گوندەکایان بینیبوور هاتبون بۆ دۆزینەوەو دەر کردنی هەندێ کەل و پەل لە ژێر دارو پەردووی خانوە روخاوە کاندا.یەك لەوان پورم بەفراو بوو هەواڵی منی لێپرسی بوون.

کاك ئەحمد سەلامەتی منی پێدابوو،وتبووی لەگەڵماندایە بەلام شووێنەکەی دوورە. هەر کاتێك هاتەوە ئیمە دەتوانین ئاگاداری بکەینەوە بێت بۆئێرە..بۆیە کاتێکیان دیاری کردبوو. غایب گەڕایەوە و هەواڵەکەی پێ ووتم ، لەڕۆژی دیاری کراو، من وماموستاعوسمان پاش نیوەڕۆ،لە چەمی سەرکانییەوە بە ڕێکەوتین.

لە نزیك گوندی عەلیانی گەورە شکور قەرەبلاغی وپێشمەرگەیەکی دیکەمان بینی لە چەمی گوندی (ئۆمەر بل)ە وە دەهاتن. بۆ کاتژمێر چوار گەیشتینە گوندی تووکن،ئەوگوندەی تیابدا چاوم بە دونیا هەلەێناوە.ئەوگوندەی بۆ یەکەم جار فێری ووشەی دایە بووم و هەستم بەسۆزو خوشەویستی دایکم کرد. لە بەرزییەکەوە گەیشتمە ناو چەم تەماشای گۆمی کەنە زەردم کرد وا هەموو هاورێ کانی منداڵیم.عزەدین مام هیدایەت هاورێی قوتابخانەو خۆشەویسترین هاورێی گوندو لاویم. حەسەنە سوور و عوسمان حاجی محمد و ئەحمد ساح غفورو عریف سمایل

حسێن علی مامەلی و عوسمان مام ئەوڕەمان و چەندی دیکە.هەموو جلە کانیان داکەندووە رووت رووت وەك ئەوکاتەی لەدایك بوون.چاوەروانی من دەکەن تاکو بچم لە گەڵیاندا یاری گولە گولە و قورە گۆمە و هتد.. بکەین.لاوانی گوند دەستەیەك لە سەر قوتە سوو ر دەستەیەك لە پاڵ دیواری مزگەوتەکەدا. سەرقاڵی یاری داوە داوە و نۆرسکان و چەڵەمشتێنەن.لە لاناو هەیوانی مزگەوتە کەدا مام فواد و شوکە خانەو ئەحەسوور و نوری سە عید ژاڵەو حەمەی جوهەر.چوار دەوری غالیب حەمە رۆبەو حمە خولە یان داوە لە گوندی عزیز قادرەوە هاتوون. هەموو سەرقاڵی نوکتەو قسەی خۆش وگێرانەوەی بەسەر هاتەکانی کاکە مەجە و مام جوادو خەلکی ترن.لەو لاوە پۆل پۆل کچان دەبینم وا شەوقی مام سابیر و فەخەی مام ئەحمەدو نەسرین مام حەمەلاو شلێر خوشکم.لە کانی ئینجەوە یەکی تە نەکەیەك ئاو بەسەریانەوەیە و دەستیان لێبەرداوە و بەدەم قسەکردن و پێکە نینەوە جار جار چەپۆکێك بەیەکدا دەکێشن.لەو لاشەوە پورە غەزێمی دایك عزەدین لە سێبەری حەوشەی ماڵ وەستاوەو بە بینینی من رەنگی گەشایەوە.

ووتی کورم بۆ وا دێرهاتی عزە دین کورم کراسێکی بە دیاری بۆ کریوی.

ووتم کەی حەمە رەشید بە مۆڵەت هاتەوە بیدەرێ.

لەولاشەوە میمکە رەعە وەك هەردەم لە سیبەری دەرگای حەوشدا شانی ناوە بە شانی ئامینی کچیەوە.دانیشتوەو بۆنی مێخەکبەن وسۆتکەو شملی رۆژە رێیەك لووتی رێبوار خۆش دەکات. لەولاشەوە دایکم و ئاوازی سپی و چاوشین پرچ زەری خوشکم لە دەرگای حەوشە وەستاون.

چاودێری پەیمانی پەپولە ئاسای پرچ زەردو لوولی چاو شینی برازام دەکەن لە گەڵ دڵەی برایم سۆڤ یاری دەکەن.بە بینینی من بالیان لێپەیدا بوو بەخێرای هاتن لە ئامێزیان گرتم.

پەیمان بە بینی من پەپولە ئاسا باڵی گرتەوەو لە باوشما خۆی گرتەوە.
ووتم مامە دایکە تازە لە ماڵ خاڵم گەراوەتەوە و
دەستێك جلی جوانی بۆ هێناوم بۆ ئەم جەژنە.
تۆ چیم بۆ دەکڕی ..؟
ژیانی برازام پرچ سوور ڕەنگ پەمەی چاوشین لێم دەروانی و نایەتە لام.
وەرە مامە.. وەرە مامە..
نە بیهەی دایکی دەڵێت ژیان دەڵێ تا ریشی نە تاشێ ناچمە لای.
بە ناو گوندا ڕۆیشتم شەهید حەمە سدیقم بینی سواری گوێ درێژە کەی بووبوو
جگەرەیەکی سیغار بەدەمیەوە بوو لە پێش مێگەلە کەیەوە بۆ ناو گوند دەهات.
مام ئەو رەحمانم بینی تازە هەواڵی شەهید بوونی عوسمانیان پێدابوو.
چاوەکانی سوور هەڵگەرابوو بە بینینی من زەردە خەنەو گریان تێکەڵی یەك بوون.
لەسێبەری ماڵە کەیانەوە هاتەخورەوەو توند لە ئامێزی گرتم
رووومەتم لە ئەشکی تەڕ تەڕ بوو.
پێی ووتم کە ئێوە دە بینم وادە زانم عوسمان زینووەو لە گەڵتانە.
مام هیدایەتم بینی توند لەئامێزی گرتم و گووتی هەرکات تۆ دەبینم
وادەزانم عزەدین دەبینم.
چەندسەربەرزم کەدەبینم تفەنگەکەی شەهیدمەلاکریمی برامتان هەڵگرتوەو
لە سەنگەری بەرخوردانە...لەوێوە ڕۆیشتم مامم مەلا حەمەخانم بینی
ریشی سپی هاتبوو پێی ووتم هەواڵێکی بورهانی کورم دەزانی؟؟.
ویستم سەرێك مە ماڵ سەعید کاکە بدەم،چوومە ماڵەوە وا پورە رەسمێ و
منینجە و دە کورو کچ بەریز وەستاون هەواڵی کاکە توکنیم لێدەپرسن.

لە پڕ نوزەی سەگێك شریتی خەیاڵی بچڕیم و بە ئاگا هاتمەوە، خۆم بە خۆم ووت ماڵ وێران..

ڕەنج بێوەر.. کوا ئەمانەی لە گەڵیان دەدوێی..

هەموو لە بیابانەکانی نوگرە سەلمان وعەرعەر زیندە باچاڵکراون.

تۆ لە ناو گوندێکی سوتاو وتەخت کراوی بە ئاستەم شوێن ماڵەکان دەناسرێنەوە.

ئەوەی هەبێ و گیان لەبەر بێت ئەو سەگەیە کە نوزەی دێت.

روانیم نوزەی لاواز و بچڕ بچڕ لە ناو ژێر زەمین (کونە تەیارە) کەی ماڵ شەهید کاکە دێت.

نواڕیم سەگە بۆری عریف سمایلە لەناو زیرزەمینەکەدا بە دیار هەندێ کەل و پەل و نوێنەوە خەوتووە.

لەبەر برسێتی بە ئاستەم هێزو ژیانی تیاماوە، بەونیوە گیانییەوە ئامادە نییە دەست لە پاسەوانی ماڵی خاوەنەکەی هەڵگرێ ،بە لوولەی تفەنگەکەم بەتۆبزی لاشەیەکی بێگۆشت و نیوە گیانم هەستاند دەرزی لەم کەلەکەی بۆ ئەو کەلەکەی دیکەی دەردەچوو.

بە حاڵی خراپ توانای دەرچوونی لە ژێر زەمینەکە هەبوو ..

ووتم خوایە دەڵێن ئاگات لە خشەی مارو مۆری هەیە.....



## خۆڕاگری شێخ حوسێنی هەزارکانی

- حسێن محەمەد فەرەج ناسراو بە (شێخ حوسێنی هەزارکانی)
- ساڵی 1957 لە(دێی هەزارکانی) ی سەرقەڵا لەدایك بوو بوو.
- مرۆڤێکی خواپەرست و وڵاتپەروەروخۆشەویستی ناو جەماوەر و پێشمەرگەبوو.

تەکیەکەی کاك شێخ حسێن تا ئەورۆژەی وێرانکرا میوانخانەی پێشمەرگە وجێگەو پەناگای هەژاران و لێقەوماوانی گەرمیان بوو، سیفەتە دەگمەنەکانی لەخۆبوردەیی‌و راستگۆیی وای کردبووجێگای ڕێزو متمانەی هەموان بوو،کوردێکی موسوڵمانی باوەڕداری سەرڕاست و نیشتمانپەروەری ڕاستگۆ بوو.

لەکاتی شاڵاوی ئەنفالی سێ دا،خۆی‌و خێزان‌و کەسوکارو هەندێ لەدەروێشەکانی لەوانە بون کە لەدێی ملەسوورە، لەلایەن سوپاو جاشەوە گیران و لەگەڵ خەڵکەکە ڕاپێچ کران. لەرۆژی 1988/4/14 لەکاتی گواستنەوەیان بۆ (قۆرەتو) لەسنوری قەزای خانەقین، لەکاتی تێپەڕبونیان بەناو کەلاردا، لەلایەن چەند دۆست و خزمێکی کاك شێخ حسێنەوە، دەرفەتێکیان بۆ دروستکردن، تا خۆی و خێزانەکەی ڕزگار بکەن، بەڵام شێخی گەورە و جوامێر.. بەوە رازی نابێت، ئەو دەرفەتی رزگاربونەی ڕەت دەکاتەوە، چونکە نایەوێت لە خەڵکەکەی تر جیاببێتەوە، ئەو لەنێوان مردن و ڕزگاربونێکی ئاوادا مردنی لاپەسەندتر دەبێت، بۆیە وتبوی (با چارەنوسی منیش وەکو ئەوانی تربێت) هەربۆیە کاکە شێخ حسێن بوە سەرگەورەی کاروانی ڕو لەماشێنی مەرگی بەعسیە رەگەزپەرستەکان، خۆی‌و 12 کەس لەئەندامانی خێزانەکەی، لەگەڵ هەزاران کوردستانیی غەدرلێکراو، ڕەوانەی بیابانەکانی خواروی عێراق کران ولەوێ کۆمەڵکوژ کران.

* سەرچاوە : سمکۆ سابیر / شێخ حوسێنی هەزارکانی/چاپی یەکەم 2019

# رۆڵی پارتیزانەکان
# لە راپەڕین و رزگاری خورماتوو

بەرلەراپەڕینی شاری خورماتوو دەستەیەك لەپارتیزان بەشاخی(هەنجیرە)ەوە دەبن، بەپێی بیرەوەری هەڤاڵ(تاهیری حاجی عومەر)کەخۆی دوای ئەنفال پارتیزان بووە و دوای گەڕانەوەی بۆشار.وەك هاوکاری پارتیزانەکان کاری کردووە،بەرلەدەسپێکی راپەڕین چەند پارتیزانێك دەگەڕێنەوە ناوشار و لەماڵێکدا خۆیان حەشار دەدەن، کەئەوانیش هەڤاڵان(حسن حمیدوشەهیدشکور عەلیانی وجەلال سعیدعەبدوڵاو عەزیزتوکنی) دەبن.بەڵام دوای ئەوەی لە دواکەوتنی کاتی دیاری کراوی راپەڕین ئاگاداردەکرێنەوە،بڕیار دەدەن لەناوشارنەمێنێنەوە،چەندشەوێك بەرلەراپەڕین هەڤاڵ(تاهیرحاجی عمر بەسەیارەی کاك(عادل ئەحمەدهادە)لەشار دەریان دەکەن و دەیان گەیەننەوە دەوروبەری(کفری).پاش چەند رۆژێك کاك تاهیر وجەباری مەلاعەلی وجومعەدرێژ) سەردانی پارتیزانەکان و هێزی ئامادە دەکەن،بۆئەوەی بەشداری لە بەرنامەی راپەڕینەکەدابکەن،شەوی 10 ـ11 /1991/3 لەگەڵ لەپارتیزانەکانی گەرمیان لە شاخی هەنجیرەوە بۆ ناوشار شۆڕدەبنەوە،کەئەوانیش بریتی دەبن لەهەڤاڵان(حەمەئاخەوسەلام کۆیی وملازم عەباس وحەمەڕەشیدتوکنی و عەلی فەقێ مستەفایی و مجیددووزی و جەماڵ شێخ حەمیدی و سەباح شێخ حمیدی و شەهید نادر) بەگیشتن بە ناوماڵەکان و نزیکبوونەوەی هێزی پێشمەرگە لەقۆڵی کفری یەوە دواتر بەرەو بینای قائمقامیەت دەڕۆن، ئاربیجیەك دەنێن بە مودرەعەیەکەوە بەڵام بەری ناکەوێت، هەڵمەت لەسەرهەڵمەت دەبەن و بەهاوکاری جەماوەر و شانەچەکدارەکان قائمقامیەت ڕزگار دەکەن ..ئیتر بەگەیشتنی هێزی پێشمەرگە شار بە جارێك دەخرۆشێت ومۆڵگەو مەقەڕی حیزبی بەعس و قاتعی جیش شەعبی و سایلۆکە .. تا ئێوارە تەوای شاری خورماتوو ڕزگاردەکەن ..

# پارتیزانەکانی پارتی
# لەکەرکوك و گەرمیان



پارتیزانی دوای ئەنفال تاهیر رەباتی



# مام هێرش پارتیزانی دوای ئەنفال

لەدوای ئەنفالی سێی گەرمیان زۆربەی پێشمەرگەکانی لایەنە کوردستانی یەکان لەوسنووره هێزیان هەبوو، خەڵك و پێشمەرگە سێ رێگایان لەبەردەمدا هەبوو:

1 . خۆڕادەست کردن بەوهێزە گەورەیەی گەمارۆی ناوچەکەی دابوو..

2 . خۆحەشاردان و هەڵاتن بۆ دەرەوەی بازنەی گەمارۆکە..

3 . مانەوە بەشێوەی پارتیزانی و خۆحەشاردان و بەرانگاری..

پارتیش لەو سنووره هێزی زۆری هەبوو،بەشی هەرەزۆری ئەو هێزە شەوی یەکەم خۆیان گەیاندە دەوروبەری چەمچەماڵ وتەکیەو بەرەوشوان وقەڵاسێوکە کشانەوە. .تاریق احمد فەرماندەیەکی دێرین و ناو و ناوبانگی بە ئازایی ناسرابوولە بناری خاڵخاڵان ورەی هەڤاڵکانی خۆیرووخاندبوو.. هەڤاڵێك بۆی گێرامەوە کوتووبووی :

. هەرکەسێك ئەمجارە دەربازم بکات (یەك دەفتەر دۆلار)ی دەدەمێ،خوا دەکات ئەمجارە بەسەلامەت دەردەچم .دەچمەوە ئەورووپا،جارێکی تر نایەمەوە کوردستان.

. جگەلەتاهیرەسوور لە پشتی سەنگاو،هێرش فاتح رشید جەباری(مام هێرش)خۆی ودەستەیەك لەهەڤاڵەکانی لە جەباری مابوونەوە ، ئەم پێشمەرگانەی لەگەڵدا دەبێت:

1 . نوزاد مەلااسماعیل دارئەختیاری 2 . فەرهاد عبدالله(د. فەرهاد)

3 . شەهید یوسف 4 . شەهید ئازاد

5 . کمال 6 . فەریقەلاڵ

ئەم دەستەیە شان بەشانی پارتیزانەکانی یەکێتی وشیوعی و سۆسیالیست تا پایز لەگەرمیان و بناری خاڵخاڵان بەپارتیزانی دەمێننەوە،دواتر بەرەو سنوورەکانی ئێران پاشەکشە دەکەن

# بەشی دووەم



## ڕێکخراوی سلێمانی
## کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان



## شەهیدانی ڕێکخراوی سلێمانی

ئەو پۆلە شەهیدە قارەمانانەی شارەکانی کوردستان لە کاتێکدا لە دوای ئەوەی بەعسیەکان بڕیاری خۆیاندا کە زۆر نامەردانە دەست بکەن بە کوشتن و بڕین و کاول کردنی کوردستان . ڕۆژێکی ڕەش بەرۆکی کوردستانی گرت بوو ئەنفال و کیمیاباران دەستی پیێ کرد لە لایەن دوژمنانی گەلەکەمانەوە ، دوای بەرگریەکی چەند مانگەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سەردەمی سەختی ئەنفالدا . هێزی پێشمەرگەی کوردستان توشی بار و دۆخێکی زۆر خراپ هات . یەکێتی نیشتمانی کوردستان زۆربەی هێزەکان وەك پارتی زان لە ناوچەکە هێشتەوە بە پشتیوانی ڕێکخستنەکان ، لەوانە ڕێکخراوی سلێمانی و شارەکانی تر ، ڕێکخراوی سلێمانیش شانبەشانی پێشمەرگە پارتی زانەکانی چاکی مەردانەیان لیێ کرد بە لادا شەو و ڕۆژیان خستە سەر یەك ، دەستیان کرد بە کارەکانیان و هاوکاری برا پێشمەرگەکانیان جموجۆڵی زۆریان خستەوە ناوشارەکان،هەر لەو کاتەدا پیاوانی ڕژێم وایان دەزانی کوردستانیان بۆ چۆڵ بووە ، بەڵام هەڤاڵانی ڕێکخستن چاوێکیان لەشارەو یەك لەشاخ بۆ کارکردن،ئەو پۆلەشەهیدە کەشەهید(جەباری حاجی ڕشید)

سەرپەرشتی زۆربەی ڕێکخستنەکانی شاری سلێمانی وکەرکوك وبەغدای دەکرد برادەرانیش لە گەڵی، لەو کاتەی پێشمەرگە قارەمانەکان لە ناوچەکان مانەوە ڕۆژانە هێرشی دوژمنیان لەسەر بوو ، ئەو مەفرەزە پارتی زانە زۆر خۆڕاگرانە سڵیان نەدەکرد ، یەك لەوانە توشی شەڕێکی زۆر قورس بوو کاك (ئازاد حمە غریب) ناسراو بە (ئازادی سەرگرمە) لەو کاتەی کە ناوچەکە بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتبوو بەدەر لە پیاوانی ڕژێم کەس لەو ناوچە نەبوو کاك ئازاد بە سەختی برینداد بوو،بەلأم زۆرقارەمانانە شەهید(جەباری حاجی رشید)هەوڵی دا بۆ چارەسەرکردنی زامەکانی کاك ئازاد ، لەبەر ئەوە کە کاك ئازاد پیاوێکی ناسراو بوو کاك جبار و شەمام خانی خێزانی هەوڵیان دا لە ڕێگەی چەند برادەرێکیانەوە بردیانە شاری بەغدا و دوای چاك بوونەوەی ڕەوانەی سنورە ئازاد کراوەکانیان کرد . ئەم پۆلە شەهیدە قارەمانە هەریەکەو لەو سنورەی بۆی دیاری کرابوو زۆر قارەمانانە کاری خۆیان ئەنجام ئەدا ، ڕۆژانە لەم ماڵا بۆ ئەو ماڵ ئەو کەڕەك و ئەو شارانە و هەڤاڵەکانیان ڕێك ئەخست و ورەی برادەرانیان بەرز دەکردەوە ، وازیان لە کاری ڕۆژانەی خۆیان دەهێنا تەنها سەرقاڵی کاری یەکێتەیکەیان بوون ئەم هەڤاڵانە سەرجەم مەینەتی بەکانی گەلەکەیان گرتبۆ ئەستۆ. تا پیاوانی ڕژێم زۆر بە وردی و بە نەخشەیەکی چەپەڵانەی خۆیان لە ساڵی 1989دەستگریان کردن.

1.شەهید جباری حاجی رشید ناوی نهێنی (هاوڕێ باوەڕ) لە کاتی ئەنجام دانی چالاکی لەبازگەی سلێمانی تاسڵوجەدەست گیرکرا

ـ لە 1990/11/18لە سێدارەدران لە گەڵاچوار هاوڕێی تر،سێ کوڕپەی بەدیاری بۆکوردستان جێهێشتووە بەناوەکانی(ڕەنج وکانی وکەنار)

2.شەهید احمد محمد وەتمان ناسراو بە(مامۆستا احمدی صناعە) ناوی نهێنی (سوارە )و (گمۆ) پیاوێکی زۆر ئازاو نەبەز و گورج و گۆڵ بووە لە ناو شاری

سلێمانی دەوری جوامێرانەی ئەبینی ، زۆر بێ باك بوو لە ژیان تا خەبات سەختر بووایە شەهدی نەمر رق ئەستور تر ئەبوو بەرانبەر پیاوانی رژێم ، تا لە ساڵی 1989لە سلێمانی دەست گیر کراو لە 1990/11/18 لە گەڵ هاوڕێکانی لە سێدارە دران ، ئەم شەهیدە قارەمانە چوار کۆرپەی چاو گەشی لە دوا بە جێماوە بە ناوەکانی ( هیوا و هێرۆ و هێشوو وهێڤار .

3. شەهیدی نەمر بکر صالح ناسراو (وەستا بکر ) ناوی نهێنی (هاوڕێ نەبەز و پۆڵا) شەهید بکر بە دەر لە کارەکانی ڕێکخستن لە سلێمانی ، لەو کاتەدا کە ڕێکخستنەکان توشی دابڕان بوو بوون بەهۆی ئەوەی زۆربەی هێزی پێشمەرگە چووبوونە سەر سنور ، لە هەمان کاتدا سەرپەرشتی چالاکیەکانی بابە گوڕگوڕی کەرکوکیشی دەکرد لەو کاتەدا لە سنوری کەرکوك چالاکی سەربازیان ئەنجام ئەدا بە تایبەت لە ساڵی 1988دا . مەخابن لە 1989/11/5 لە دوکانەکەی لە سلێمانی دەست گیر کرا . لە ڕۆژی 1990/11/18 لە سێدارە درا . لە دوای خۆی پێنج کۆرپەی چاو گەشی بۆ کوردستان بە جێ هێشتووە بە ناوەکانی (شاخەوان و سیروان و تۆڵە و شیروان و شێنێ)

4. شەهیدی نەمر محمد رحیم حسین ناسراو بە حمە رحیم ناوی نهێنی (شەماڵ) . ساڵەکانی 1980 سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی پێنجوێن و شارەزور و هەڵەبجەی شەهیدی دەکرد تا کاتی ئەنفال ، یەکێتی نیشتمانی کوردستان هێزێکی دروستکرد بە ناوی سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك) شەهید سەرپەرشتی هێزێکی لە سوپای ناوبراو دەکرد زۆر قارەمانانە کارەکانی ئەنجام ئەدا ، لە کاتی پەیداکردنی چەك بۆ زیاتر بەهێز کردنی ئەو سوپایە ، لە ڕۆژی 1990/7/7 دەست گیر دەکرێت .

لە 1990/11/18 لە هەمان ساڵدا لە سێدارە دەدرێن پاش خۆی سێ کۆرپەی بە جێ هێشتووە بە ناوەکانی(هانا و سۆما و توانا ).

.5شەهید عەتا ئەحمد محمد ناوی نهێنی زانا . لە ساڵی 1984 بوو بە پێشمەرگە لە تیپی 55ی قەرەداخ ، بەڵام لە 1987 گەڕایەوە ناوشاری سلێمانی و پەیوەندی کرد بە هەڤاڵانی ڕێکخستن لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەو هەڤاڵانەی لە ریزەکانی یەکێتی دابڕاون پەیوەندیان پێ وە بکاتەوە ڕێکیان بخاتەوە بۆ ناو ریزەکانی ڕێکخراوی سلێمانی ، مەخابن لە ڕۆژی 1989/10/22 لە ناو شاری سلێمانی دەستگیر کرا .

لە ڕۆژی 1990/11/18لە سێدارە درا.

.6شەهیدی نەمر سالار محمد سعید یەکێك بوو لەو کادرە قارەمانانەی ڕێکخراوی سلێمانی کە چاکی مەردانەی لێ کردبوو بە لادا شەو ڕۆژی خستبووە سەر یەك بۆ کارەکانی ، هەر چەندە ڕۆژێکی زۆر دژوار بوو کارکردن ئاسان نەبوو ، بەڵام کارکردن لای ئەم پۆلە شەهیدە قارەمانەو ڕۆڵەکانی یەکێتی و ڕێکخراوی سلێمانی لە جاران باشتر ئەنجام دەدا شەهید سالار لە 1990/2/11 لە سلێمانی دەست گیر کرا لە لایەن جەلادەکانەوە ، بڕیاری 20 ساڵ بەندکردنی بۆ درا ، بەڵام شەهیدی نەمر ئەوەندە ئەشکەنجە درابوو بۆ ماوەیەك لەوە دوا جەستەی پاکی کاکە سالار توشی نەخۆشیەکی کوشندە بوو مەرگ ڕێگەی نەدا وەك جاران بێتەوە کۆڕی خەبات لە ڕێکخراوی سلێمانی ، لە دووهەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانی ئەو ساڵە لە ڕۆژی1991/4/17 گیانی سپارد ، لە ڕۆژی 4/19 تەرمی پیرۆز شەهید سالار گەیشتەوە خاکە پیرۆزەکەی سلێمانی ..

هەزار سڵاو لە گیانی پاکی ئەم پۆلە شەهیدەو
گشت شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستان .

# وەڵامی ڕێکخراوی سلێمانی

**بۆ/کاك حمەرەش هاوڕێ (شێروانە)ی بەرێز**

**سڵاوێگەرم و هیوای سەرکەوتنتان**

**هاوڕێی بەرێز**

**نامەی دواییمان پێگەیشت کەدوای گەڕانەوەی نوێنەرمان بۆتان ناردبووین و ئەمەوەرامەکەیەتی:**

**1. ڕاستەئێوە دوومانگەپەیوەندیتان بەئێمەوە کردووە بەڵام هاوڕێ، لە بەرتەمەڵی و ترسی هاوڕێیانی(بەمۆ)مان کارەکان دواکەوتن،ئەمەخەتای ئێمەنەبووە..**

**ئێوەلەڕێیهاوڕێ(بەمۆ)وە بەکەمجارپەیوەندیتان کرد..وئێمەش پارە وصلاحیەتمان بەرەورووی ئەوان کردووە..**

**نامەکانی ئێوە دوای 20.15 ڕۆژ بەئێمە ئەگەیشت کەکەوتینەلێکۆڵینەوەدەرکەوت کەسستیوکەمتەرخەمی هاوڕێیانی(بەمۆ)مان بوون..بۆیە نوێنەرمان بۆناردن وئیتر خۆمان لێرەوەدەست بەکاربووین بۆجیبەجێ کردنی کارەکانتان .**

**2. واهاوڕێیەکی(محمد)مان بۆتان ناردلەگەڵ دەرمان و پارە دوو هەزار دینارەکەو ..پێڵاوەکان وجلەکان .. هیوادارین ئەم جارە بەسودبێ..**

**تکایەنامەی دڵنیایی گەیشتنی مان بۆبنێرنەوە..**

**3. وا نامەیەکمان ناردبۆکاك ئازاد ئەگەرگەیشتبۆوەلاتان بەخێرهاتنەوەی دەکەین وئەونامەی لەخەتێکی خۆیەوە بۆهاتوە .**

**تکایە ئەگەر گەیشتبوو بانامە بۆمان بنێرێ..**

4 . تكایەخەبەرمان بدەنەوەلەجۆری جلەكان وگەوریی وبچوكی و

ئایە25ی تری هەروابێ.. یان چۆن..؟

5 . ئەمرۆ بەكیتاب ومكبیرە دەگەڕان 8/23 كەكێ فیرارە

بالەماوەی دوو رۆژدا مراجعەی تجنید بكات..

رەنگەجۆرێك لەعەفووبێ بەلأم نایانەوێ بەئاشكرا بیكەن..

6. رژێم 8/22 هێزێكی لەكەركوك بۆهەولێربۆموصل برد.

7. رۆژی8/22 .4 راجیمەبەرەوسلێمانی هات..

8 . رژێم دوورۆژەلەرێیسید صادق عەربەت سلێمانیەوەهێزدەگێرێتەوە

9. كەلێك خێزانی هەڵەبجەیی، ئێران ناردونیەوە بۆهەڵەبجە

بەلأم لێرەرژێم هەموویانی گرتووەو رەوانەی دەوری تكریت وكەركوكی كردون..

10 . تكایەبزانن(ئارام)كەوتۆتەكوێوە،وەجیهازەكەی چی لێكردووە..

لەم ناوە لای ئێمە دەنگی نیە...

تكایە وەلأمی گەیشتنی كەل وپەلەكانمان بدەنەوە..

دەهەزارفیشەكمان بۆكڕیون

بەدەمی شوێنی ناردنی تأمین ئەكەین.*

هەربژین ...

گۆیژە

ئێوارە 1988/8/23

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو

# دوو نامەی کاک حەمەڕەشید شارەزووری (کامیل) بۆ کاک حەمەرەش

زۆربەڕێزوخۆشەویستمان کاکەحمەرەش

سلاو وریزمان بەگەرمی لەگەڵ سلاومان بۆبرادەران.

گیانەکەم نوسراوەکەت ئێوارەی 18.17گەیشت،

واهاوڕیٚ(هیوا)هات بۆلاتان هەرچی کارێکتان هەیە پێی بڵیٚ .. و

پێکەوە جیٚبەجێی بکەن.

کاکەگیان بۆبریندارەکان نزیکی دوای شەوی21 . 22 مەوعید بۆهاوریٚ هیوا دابنیٚ تاکوئێمەیش شتەکان ئامادەبکەین وبەئەودا بۆتان دەنێرین ولەومەوعیدەئاگادارتان ئەکەین.هەموونوسراوەکانت ئەگەیەنمە شوێنی خۆی تکایەکاك محمدگیان دڵگران مەبە لەوەی لەمەوعیدی پێشوتا ئامادەنەبووین.

کاك هیوا ڕێگەی نەزانی و کەس دەست نەکەوت.

ئیتر هەرچیشتەکانە لەومەوعیدە ئەیهێنین

ـ ئایە پارەتان بۆبنێرین خۆتان سەرفی بکەن یانە؟

چونکەئەوجارە وتتان ئەتوانین. *

هەربژین

براتان کامیل

بەیانی1988/11/18

*ڕەشەبای ژەهرونەنفال/ عەبدولاکەریم مەحمود/ چاپی یەکەم

# نامەی دووەمی کاك حەمەڕەشید(کامیل) بۆ کاك حەمەرەش

هاوڕێی بەڕێز/ کاك حەمەرەش

سلاّوی شۆڕش وخەبات

لەگەڵ سلاّوی گەرم بۆکاك عوسمان وکاك عدنان وکاك مەلااحمد

هیوادارم سەرکەوتووبن.

1.هاوڕێ گیان:بۆبربندارەکان پێویستی بەجێبەجێکردنی ئەو نووسراوە هەیە کە بۆکاکە وەرمان گرت لە بەرپێگە بۆیە لەئێستاوە ئەوهاوڕێیەمان نارد نووسراوەکە پەیدابکات، ئەوهاورێیە زۆرنزیکی هاوڕێ هیوایە،لەم رۆژنەوەری ئەگرێو یەکسەر ئاگادارتان ئەکەین.

2.بۆنوسراوەکان نوسراوەکەی کاك شێخ فتاح دامەدەستی شێخ جبارچاوەڕێی وەلاّمم.

3. بۆکاغزی یاری بەهاوڕێ هیوام ووت بۆت بکرێت.

4. بۆکاك رەئوف نامەکەم داپێی لەرێگای مامۆستامحمدەوە

5.کەشوێنتان دانابۆئیشەکان واتەشوێنی مەوعیدی باش هەرهەموو شتێك ئەکەین و ئەنێرین،ناهێلین بەهیچ جۆرێ بێ شت بن واحتیاج بن،بەهەموو نرخێك ئامادەین بۆتامینی ژیانی تێکۆشەرانەتان.

بۆسریەکەی قۆپی لەم مەوعیدەیداهاتوودابە ناونیشانی تەواو ئاگادارتان ئەکەین.

6. ئەوشتانەی هاوڕێیوا ئەیەێنێ تکایە بەنووسراولەگەیشتنی دڵنیامان بکەن.

هەربژین بەسەربەرزی

هاوڕێتان کامیل

988/11/21

# نامەیەکی تری ڕێکخراوی سلێمانی

بەڕێزوخۆشەویستمان کاك حەمەڕەش (مەلانوری)

سلاوێکی گەرم

ئومێدمان سەرکەوتن وسەربەرزی وبەردەوامی خەباتە..

هاوڕێی بەرێز..!

نامەی رۆژی 7/11 تان گەیشتەدەستمان، دڵخۆش بووین کە(هێز) گەیشتەلاتان وە نیازتان هەیە بەم زوانەسەفەربکەن بۆسەرێ..

لەگەڵ هەمووشتێکدا لەوباروذۆخ وهەل ومەرجەی ئێوەی تیابوون و بەرگریتان کردو وەك شاخ بەرویدوژمنیدا گیرکەردا چەقین. دەڵێین لەگەڵ هەمووشتێکدا. . وەبۆمێژوودەڵێینکەئێوەوهەمووهاوڕێکانتان لەوێ پیاوی قارەمانی کوردبوون.. مایەی شەرەفمەندی وسەربەرزی هەمووکورد بوون..هەرگیز پەنجەی ڕێزوشانازی وبەرزی تان بۆرادەکێشین و لەریزی هەرەپێشەوەی کاروانی خەبات داحسابتان بۆدەکەین..ئەوەی ئێوە کردوتانە لەدوای ئەنفالیشەوە گەورەترین نیشانەی لە خۆبووردەیی وئازایەتی وگیانبازی وژیان بەخشی بووە. لەرێی میللەت ولەرێی کوردستان ولەرێی بیروباوەڕی کۆمەڵەویەکێتی ماندا،ئەوەی ئێوەکردوتانە هەمیشە نمونەیەکی زیندووی ویژدانی شۆرشگێڕانەی جوامێرانەی خەبات کارەکانەو لەداهاتوودا مێژوویەکی زیندوودەبێ کەکورد هەرملکەچ ناکات و بەرگری لەتەك هەموباروذۆخێکی سەخت وتوندو تیژدا هەردەکرێ، وەهەربەردەوام دەبێ و (لێرەناڕۆین) دەبێتە سروودی هەمیشە زیندووی نەوەیداهاتوو. بۆیە بەبۆنەی سەفەرکردنتانەوە ڕێزوسلاوی دەستەی کارگێڕانی ڕێکخراوی سلێمانی وهەموو هاورێیانمانتان پێشکەش دەکەین وئومێدی سەربەرزیوسەرکەوتنتان بۆدەخوازین..

وەلای خۆمانەوە داوای لێبووردن دەکەین لەهەمووهەڵەوکەموکوڕی کەلەماوەی پەیوەندی ماندا بووبێ. گەرکاتی خۆی هەندێك گلەیی لای ئێمەوە بووبێ دیارە لەسنووری ڕێکخستن دەرنەچووە ولەشێوەی رەخنەورەخنەلەخۆگرتندابووە کە کورتیەکەی هاوریانی ناوئەو بارودۆخەی خەبات وتێکۆشاندا

بەتایبەت سەرکردەکانی وەك ئێوە دەبێ‌دڵ ودەروون فرەوان بن وزیاتربەپشوو ونەفەس درێژودڵگەورەبن لەئاستی روداوەکان ولەئاستی پەیوەندی پێشمەرگانەوە دەبێ زیاترهێمن و لەسەرخۆو ژیرو توندوقایم بن لەهەڵسوکەوت وجموجوڵیاندا وبتوانن بەتەواوی خۆیان بپارێزن وژیان وگیانی خۆیان بەخۆڕایی وبە نیەمالی و بەکاری بچووك ولاوەکی وسوکەوە بەفیڕۆنەدەن.

لەکاتێکدا ژیانی خەڵکی وەك ئێوە لەم بارودۆخەدا بۆدرێژەدانی خەبات زۆرگرنگ وزۆرپیرۆزە وئێمە هەمووخەممان هەرئەوەبووە ئێوەی تێکۆشەر لەدەست شۆرش نەچێ‌وبتوانن بەوپەری سەرکەوتویی ئەرکەکانتان بەجێ بهێنن..هەمووخەم مان هەرژیان وگیانی ئێوەبووە ولەخۆتان زیاترترساوین لەزۆروزۆرداری وبەربلاوی دامودەزگا سەربازیو جاسوسییەکانی رژێم کەبەردەوام هیرش وچاودێریتان لەسەر بووە وترس وسامێکی گەورەبوون لەبەردەم دوژمندا...

هاورێی بەرێز..دووبارەماچت دەکەین وسوپاسی بێ پایانی لەخۆبووردەیی و ئازایەتی وقارەمانیتان دەکەین وئومێدمان وایە لەداهاتوودابەیەك بگەین وهەمیشە هەرهەواڵی بەرزی و سەرکەوتن وسەلامەتیتان ببیستین.*

و هەربژین

ڕێکخراوی سلێمانی

1989/7/17

* هەمان سەرچاوەیپێشوو

# نامەیەکی تری کاک حەمەرەش

بۆ/ ڕێکخراوی سلێمانی زۆر بەرێز هاوڕێ گۆیژە

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

هەمیشە هیوای سەرکەوتوویی وسەربەرزیتان بۆدەخوازین.

سڵاو ورێزمان هەیە بۆهەمووهاورێیان

هاورێی بەرێز..

نامەکەی8/4 تتان شەوی8/15.14بەدەستمان گەیشت.زۆرسوپاستان دەکەین.

هەمان شەوچاومان بەوهاورێیانە کەوت کە لەلایەن بەرێزتانەوە نێررابوون.

لەبەرنەبوونی مەجال وخراپی جێگاکە نەمتوانی هەمان کات بیان خوێنمەوە.بۆیە وەڵامەکەی3 سێ‌ڕۆژ دواکەوت. ماوەی دوومانگە ئێمە پەیوەندیمان کردووە بە بەرێزتانەوە بەڵام تائێستا نەمان توانیوە وەکو پێویست کارەکان ئەنجام بدەین و پێویستیەکان بۆپێشمەرگەدابین بکەین پێم خۆشەهاتنەکانی خۆم بۆشوێنی مەوعیدەکان وشتەکانی بەرێزتان کەبەدەستمان گەیشتووەباسی بکەم شتەکان ئەمانەن: پیلی قەڵەم(350)پیل،پیلی گەورە(75) پیل (30) گوللەی ئارپیجی (19) جووت کلاش کەزیاترلە 6 شەش جوتیان فرێ داوە لەبەر بێ کەلکی (11) جووت ئەدیداس (30) سی پارچە پاکەتی بەغداد و چوار تێپی ئاوی وبیست قەڵەم جاف(50)جوت گۆرەوی هەندێ دەرمان، لەمجارەشدا(30)جوت ئەدیداسمان بەدەستگەیشتووە. تائیستا من شەخسی خۆم (6)شەش جارهاتووم بۆ مەوعید بۆلای مام خەلیفەوشالاو چەندجارێکیش دەستەکەی خۆم ناردووە بەراستی ئەوەندە هیلاک بووین زیادلەپێویست نەتیجەی ئەوەیلاک بوونە تووشی نەخۆشی کردووم سەرمام بووەوبا داویەتی لەدەست وقاچم، لە7/12 تائێستا

نەخۆشم بەولاغ هاتووچۆئەکەم.کەس لەبرادەرانی ترشارەزای ئەم شوێنەنین تایەکیٚ لەبرادەران جارجاربێن کاك ئازادو هێزێك بەرێوەن،لەم ماوەدا ئەگەن هەرکاتیٚ گەیشتن ئاگادارتان ئەکەین.صمدگلی ئەتوانن لەرێگایشارەوەهەواڵیبزانن لەئێمەدابڕاوەئەگەرمابیٚ لەسنووری جەباری وقەرەحەسەنە من لەمامۆستاکاکەڕەشم پرسی ئەومەسئولی رێکخستنیانە وتی هەواڵی نازانم.

نامەیەکی (مامۆستا کاکەڕەش)مان لە لابوو بۆمان ناردن نامەکەی بەرێزیشتانی پیٚئەگەیەنین و وڵامەکەیتان بۆئەنێرینەوە ،ئەوبرادەرەی کەهات دیمان،قسەمان زۆرکرد، هەوڵمان داوە چەند رێگایەکیتر دروستبکەین،ئەوشتانەی کەئەوبرادەرە باسیکرد گوایە هەوڵی بۆدراوە بگاتە دەستمان زۆرچاکە بۆ ماوەیەکی زۆر هێزەکەمان پۆشتەدەکاتەوە.

لەنامەی پێشوومان‌دا باسییارمەتی مانگانەیپێشمەرگەمان کرد کەبۆمان داین بکەن وەڵامتان نەبوو .پێشمەرگەیوامان هەیە ماڵ ومنداڵی لەشاروشوێنەکانی ترە، رەنگەزۆرپێویست بەیارمەتی هەبیٚ،مانگی(7)وە (8)مان وەرنەگرتووە، دوایئەوەی کەجاری پێشووەوەڵامی نامەکەی بەرێزتانمان داوە ئاگاداریبەرێز کاك نەوشیروانمان کرد زۆرپیٚباش بوو لەدروست بوونی پەیوەندی نێوان ئێمەو بەرێزتان.

هاوریٚ گۆیژەی بەرێز.. حەزئەکەم هەندی لەسەروەڵامی نامەکەی کەبۆهاورێیان کاکەرەش و عدنان وحەمەرەش وعوسمانت نووسیوە بەڵیٚ دیارەئەوهێزەی کەلێرە ماوەتەوە جگەلەوانەی لەسنووری (ت21) دوای شەڕەکە پەرینەوە ئەوەکانی تریان بەاختیاری خۆیان کاتی خۆی مانەوە اجباری نەبوو کاتیهێزەکەی تریش هاتە ئەم بەرەوە هەموو یەکمان بینی جگە لە برادەرانی ت59ی حەمرین ئەوانیترمان دانیشتین کۆبوونەوەمان کرد چەندجاریٚ، هەندیٚشتمان بەلاوە باشبوو بەبروسکە بەسەرکردایەتیمان ووت یەکیٚ لەوانە داوامان کرد مەسئولیٚ لەمستەوای مەڵبەندا

بیت بۆرێکخستنەوەی هێزەکەو وەکو مەسئولی موباشرهەموو لایەك پەیوەندی پێوە بکەین. دیارەبوونی برادەرێك لەومستەوا زۆرچاك بووبەڵام بەداخەوە زروف تائێستامەجالی نەداوە جیٚبەجیٚبیٚ.وەکومەسئول لێرە نەبووە ئەو برادەرانەی ترکەلێرەین هیچ جۆرە موشکیلەیەك لەنێوانماندا نییە...

ئەگەرپیش چۆڵکردن ناوچەکەم و شکیلەی بچووك هەبووبیٚ ئێستا ئەویشمان نایەلاوە، هەمووشتیٚ بەپرس ورای یەکتری ئەکەین.

ئەونامانەی کەبۆبەرێزتان نووسراوەتەنەوە وەڵامی نامەکانتانم داوەتەوە.کاك عدنان کەنامەی بۆناردن نامەکەی پیشانی من داوخوێندمەوە پاشان ناردی، ئەودوو نامەیەش نامەی کاك مەلاأحمدو مامۆستا کاکەرەش،من خۆم هاوردم دامەدەست ئەوبرادەرە تەنهانامەکەیکاك عوسمان بووئەویش خۆیهات بۆ(صمود)دوایی کەگەڕایەوە بەجیهاز پێیووتم نامەیەکم بۆهاوڕیٚ بەمۆ نووسیوە دەربارەی وەزعی هەندیٚلە پێشمەرگەکانمان و هەندیٚ شتی پێویست پێی ووتم نازانم پێت چۆنە؟ پێم ووت تازەنامەت نووسیوە موشکیلەنییە، بۆئاگاداریتان یەکەمجارجوابی نامەکەی(بەمۆ)ی بەرێزمان داوە کاك عوسمان مان لەگەڵ بوو،مام خەلیفە ئەناسیٚو هەر لەورێگەوە نامەیناردبوو بەفرسەتی زانیبوو کەزۆرنزیکەو زوو دەنگی دەگاتە ئەوبرادەرەی ئەوشتانەی کەدیٚ دوایئەوەی ئەگاتەدەستمان وەکوپێویست دابەشی ئەکەین بەسەرهەموو هێزەکەماندا.ئەو پێشمەرگانەی کاك عوسمان باسی کردبوون لەنامەکەیدا دوای نامەکەی کاك عوسمان بۆئێوە، ئێمە بروسکەمان کرد بۆمەکتەبی عەسکەری بەرێز، قەولەچارەسەربکریٚ زۆرسوپاستان ئەکەین..ئێمەپێمان باشەکەمترین خەڵکمان لەرێگەی ئێوەوە بڕوات لەبەرپاراستنی گیانیهاوڕێیان هەرچەندە ئێمە کەسمان نەناردووە بۆلایبەرێزتان وهەرکەسیٚ لێرەوە هاتبیٚ سەربەخۆ هاتووە،پێمان ناخۆش بووە، رەنگەخەڵکمان هەبیٚ دڵی عاجزبووبیٚ لێمان

لەبەرئەوەی لای بەرێزتانەوەنەمان ناردووە، هاورێیان....! ئەوە نەبێ ئێمەهەوڵ نەدەین گیانی ئێوەوهاورێکانتان بپارێزین پاراستنی گیانی رێکخستن یەکیکە لەئەرکە گرنگەکانمان، بێگومان هەوڵی زۆریش ئەدەین بۆپاراستنی.بۆیەئەوەندەم درێژە بە نامەکەدا کە دڵنیابن لێرە بچووکترین ناکۆکی وناتەبایی لەنێوان برادەرانماندانییە. زەم وزەمکاری وپرتەو بۆڵە کتلەو کتلەبازی هیچ نەماوە لێرە هەروەها مەڵبەندوتیپ وکەرت وسنووری نێوانیش نییەو نەماوە ئەم هێزانەی ئێرە پێویستیان بەتەشکیلەی تازەیەوهەمووهێزەکەمان لەسنوورەکەدا ناگەنە (150)پ.م، سێ سەرتیپ یەك جێگرتیپ وچەندین ئامر کەرتی لێ یە.هاتوچۆ زۆرئاسان نیە بۆمەوعید یاچوون بۆلای یەکتری لەبەر نەبوونی وەسیلەی گواستنەوەوچۆلی ناوچەکەونەبوونی خواردەمەنی وئاڵۆزی ودەرچوونی دوژمن. ئیشەکانمان زۆری بەهۆیٔ جیهازی بچووکەوە جێبەجێ ئەبێو زۆری سوود لێوەرئەگرین. داوای لێبووردن ئەکەم کاغەزەکانمان زۆرپاك وچاکنییەو هەرئەوەمان لادەستکەوت. قەول بوو ناوی هەندێ ئامرسریەوجاش بنێرم بۆئەو برادەرەی دیمان بەلأم داوای لێبووردن ئەکەم شوێنەکەی دووربوو دەستم بە ناوەکان نەگەیشت لەداهاتوودا بۆی ئەنێرم شوێنیکمان دیاریکرد بۆاحتیات ئامادەی کەین هەرکاتێ تەواو دڵنیابوون لەوەی کەیارمەتیمان ئەدەن لەوشوێنەوە ئاگادارمان بکەن بۆئەوەی مەوعیدێ دابنێین بچینەلایان ببێ بەرێگەیەکی باش.

هیوادارم ئەوپێویستییانەی کەداوامانکردووەبۆمان جێبەجێبکەن.

بۆپێشەوە ....

حەمەرەش(شیروانە)

1988/8/17

## لەگەڵ ئەم نامەیەدا (لیستی یارمەتی پێشمەرگە)و

## چۆنیەتی سەرفکردنی ئەو مەبلەغەپارەی وەریگرتووە بەم شێوەیە هاتووە:

| زنجیره | ناوەکان | باری خێزان | ئەو پارانەی وەری ئەگرێ | مانگانەی وەرگراو |
|---|---|---|---|---|
| 1 | محمد کریم عیسی | | 375/000 | 6.5.3 |
| 2 | تۆفیق رشید | خ | 225/000 | 6.5.3 |
| 3 | کامەران عبدالله | س | 200/000 | 6.5.4.3 |
| 4 | محمد شاواس | س | 150/000 | 6.5.4 |
| 5 | رحیم کاکە محمد | س | 150/000 | 6.5.3 |
| 6 | رەمەزان حەمەعلی | خ | 150/000 | 6.5.3 |
| 7 | بگ مرادخوامراد | خ | 225/000 | 6.5.3 |
| 8 | احمد صالح | خ | 300/000 | 6.5.4.3 |
| 9 | رحیم رشیداحمد | س | 100/000 | 6.5 |
| 10 | مکرم رشید برزۆ | س | 50/000 | 6 |
| 11 | رسول مجید | س | 100/000 | 6.5 |
| 12 | بهالدین کریم عیسی | س | 150/000 | 6.5.4 |
| 13 | اکرم کریم عیسی | خ | 150/000 | 6.5 |
| 14 | حسین احمد | س | 150/000 | 6.5.3 |
| 15 | هونەرعلی محمد | س | 100/000 | 6.5 |
| 16 | گیب حسین نادر | خ | 150/000 | 6.5 |
| 17 | عمرنامیق سعید | خ | 150/000 | 6.5 |
| 18 | لگیف نامیق سعید | س | 100/000 | 6.5 |
| 19 | محمد عبدالرحمن | خ | 150/000 | 6.5 |
| 20 | شێخ تەها | خ | 95/000 | 5 |
| 21 | ناکۆ تەها | س | 50/000 | 5 |
| 22 | ناسۆ تەها | س | 50/000 | 5 |
| 23 | سامان | س | 50/000 | 5 |
| 24 | خەبات | س | 50/000 | 5 |
| 25 | رزگار رئوف | س | 50/000 | 5 |
| 26 | شاخەوان علی | خ | 150/000 | ...6... |
| 27 | جیهان بەخش | س | 150/000 | 6.5.3 |
| 28 | عدنان محمد قادر | | 125/000 | 6 |
| 29 | عوسمان حسن نادر | خ | 75/000 | 6 |
| 30 | کریم محمودسەمین | س | 50/000 | 6 |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 31 | رحمان محمدنادر | س | 50/000 | 6 |
| 32 | شوان محمدرشید | س | 50/000 | 6 |
| 33 | هەیاس حسن فتاح | س | 50/000 | 6 |
| 34 | سامیسەمین سعید | س | 50/000 | 6 |
| 35 | فەرهادمحمدحمید | س | 50/000 | 6 |
| 36 | خالدنوری | خ | 75/000 | 6 |
| 37 | احمدمحمدحمهامین | . | 250/000 | 6.5 |
| 38 | داراقادرسەمیح | س | 100/000 | 6.5 |
| 39 | سلام محمدحسین | س | 100/000 | 6.5 |
| 40 | سەیوان رحمان کاکل | س | 100/000 | 6.5 |
| 41 | فەرمان فەرەج داود | خ | 150/000 | 6.5 |
| 42 | حیدرمحمد | س | 100/000 | 6.5 |
| 43 | ئاسۆ | س | 100/000 | 6.5 |
| 44 | ئاسۆ | س | 100/000 | 6.5 |
| 45 | رزگار | س | 100/000 | 6.5 |
| 46 | ئارام | س | 100/000 | 6.5 |
| 47 | حسام علی | س | 100/000 | 6.5 |
| 48 | محمودعزیز | | 190/000 | 6.5 |
| 49 | صمد علیتۆفیق | س | 100/000 | 6.5 |
| 50 | کمال فائق | خ | 150/000 | 6.5 |
| 51 | بکرحمەصالح | خ | 150/000 | 6.5 |

ئەو مەبلەغەپارەیەی وەرم گرتووە : -

فلس    دینار

000    1350 رۆژی6/8    لەتیلەکۆ لەکاك شێرکۆم وەرگرتووە

000    1800 رۆژی6/12 لە قولیجان =    =    =    =

000    300 رۆژی6/23 لەکۆرەمێر لەکاك شێرکۆم وەرگرتووە.

000    400 وەرمگرتووە لە کاك عوسمان حاجی محمود

000    7450 حەوت هەزارو چوارسەت و پەنجا دینار.

فلس    دینار

000    7005 سەرفم کردووە ...

445 000    دینارم لاماوە (چوارسەدوچل وپێنج)

حەمەرەش

1988/8/19

*رەشەبای ژەهرونەنفال/عەبدولاکەریم مەحمود/چاپی یەکەم

# وەڵامی کاك حەمەڕەش بۆ ڕێکخراوی سلێمانی

بۆ/هاوڕێی بەڕێزهاوڕێ گۆیژە

سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

هیوامان خۆشی وسەربەرزی وسەرکەوتنتانە.

نامەکەی کە 1988/7/4 نووسیبووتان ڕۆژی7/14 گەیشتەدەستمان، سوپاسی هەستی هاوڕێیانەتان ئەکەین ئەمەش وەڵامەکەیەتی:

1. جیهازمان لایە سازوبەکارە ،پەیوەندیمان هەیە بەگوێرەیمەجال. لەداهاتوودا ئاگاداریکاك نەوشیروان ئەکەین لەدروست بوونیپەیوەندی لەنێوانماندا.

2. من حەمەرەشم سەرتیپی ت53ی شێروانە کەئەم نامەتان بۆئەنووسم ماموستا کاکەڕەش مەسئولی ت59ی حەمرین لێرەیەلەسنووری تیپەکەیان زۆرجاریەك ئەبینین.

3باسی لێپرسراو وکادروپێشمەرگەتان کردووەلەبەرڕۆیشتنی هەندێ پ.م بۆ م/3 وتەسلیم بوونەوەی هەندێکی تر ناتوانین ئێستا ژمارەی دروستتان بدەینێ،بەلام ئەمەیخوارەوەهەندێ مەعلووماتە لەوڕووەوە:

ا. محمودی مامەعەزە ،جێگریتیپی17 لەگەڵ سێ پێشمەرگە.

ب. شێخ کریم جێگریتیپی 51ی گەرمیان وئەم ئامرکەرتانە:

1. عوسمانی حاجی محمود　　2. سیدمحمد سید محی الدین

3. جەوهەرلەتیف　　4. مەلاسەعید احمد / ڕێکخەر

(60)شەست پێشمەرگەیان وهەندێ پشتگیری لەسنوورەکەیان ماوون

ج . حەمەڕەش سەرتیپی ت53ی شێروانە لەگەڵ 24پێشمەرگە.

د . مەلااحمد سەرتیپی تیپی55 لەگەڵ (5) پێشمەرگە.

هـ. عدنان محمد مینا سەرتیپی 57 ی سەگرمەخۆی و(9)پێشمەرگە

و□هێمن سەرتیپی تتیپی59ی حەمرین و(50) پێشمەرگە

کەئەم مەسئولانەیان لەگەڵدایە:

1. سیروان جێگری سەرتیپ     2. مامۆستاکاکەڕەش     م ڕێکخستن

3. شێخ تەها م کۆمەلایەتی     4. قادر مەملی     ف . ك

5. ڕەفعەت     ف ك     6. جەلال مەسۆیی     ف . ك

7. صمد گلیی     ف ك     7. یاسین بچکۆل     ف . ك

4. بۆسوود وەرگرتن لە موستەشاروخەفیفە ئێمە درێغی ناکەین ،

ئێوەیش لایخۆتان هەوڵی دابین کردنی بۆبدەن.

- بۆمەسەلەی پارە یارمەتی مانگی (7) هێشتا وەرنەگیراوە، مانگی (8) نزیك ئەبێتەوە، لێرە لە سەرەتای مانگدا یارمەتی پێشمەرگەکان ئەدەن ئێوە خۆتان حیسابی ئەو مەجموعە پێشمەرگەی لەسەرەوە بەژمارە بۆمان نوسیوون بکەن. ئەگەرپێتان هەڵ ئەسورێ میقدارێ زیاتر بنێرن، بۆئەوەی بەشیبکەین بەسەرئەو برادەرە مەسئولانەی لێرەن بۆکڕینی تەقەمەنی خراپ نییە.

4. ئێمە خۆمان زیاتر هیلاك ئەکەین بۆ ئەوەی گیانی ئەو هاوڕێیانە بپارێزین...

5 . چەند بکرێ پێلاو ئەدیداسی ئێرانی باشەکان لەگەڵ جلوبەرگی خاکی ترمان بۆبنێرن باشە،ئێمەیش لێرەبەگوێرەی پێویست بەشی ئەکەین بەسەر هێزەکەماندا، پێویستمان بە نانی کلاشینکۆف هەیەئەگەرجێ‌بەجێ‌ئەکرێ‌لەگەل جگەرە دا.

6. تکایە چەند ئەتوانن درێغی مەکەن لەناردنی گوللە ئارپیجی و تەقەمەنیتر ئێمەیش لەشوێن باش دای ئەنێین بۆکاتیپێویست.دواخاڵ داوای بلاوکراوەو نامیلکەیان کردووە..

براتان شێروانە

1988/7/15



# نامەی هاوڕێ سوپا

## 1990/11/17

**هاوڕێ(سوپا) نامەیەك ئاراستەی كاك عوسمان حاجی مەحمود دەكات:**

**لەناوەڕۆكی ئەونامەیەدا ئەوراستییەمان بۆئاشكرا دەبێت كە هەمیشە پارتیزانەكان لەسۆراخی ئەنفالكراوەكان دابوونە و داوی كۆكردنەوەی زانیاریان كردووە ، ئەویش بەمەبەستی دڵنیابوون لە چارەنووسی ئەوخەڵكە دڵسۆزەی گەرمیان، هاوڕێ سوپا لەسەربازێكی كوردی بەركانی( شەری كویت)ەوە نامەیەكی پێگەییوە. ئەویش دەقی نامەكەوچەندزانیاریەكی ناردووە،لەوزانیاریانەدا باس لەچەن شوێنەوارێك كراوە كەگوایە لەهی ئەنفالكراوەكان دەچن:**

1. سەرینی پەڕ
2. كراس وكەوایژنانەی كوردی
3. چاكەتی كوڕانی منالآنەبكوردی
4. قوتویجگەرەی ژەنگاوی

**لەگەڵ چەند نیشانەی تركەگومانیئەوە دەدەن بەدەستەوە كە هەندێ لەكوردە ئەنفالكراوەكان بۆماوەیەك لەوێ بەندكرابن..**

# نامەیەکی تری هاوڕێ (سوپا)

**بۆ بۆپارتیزانەکان**

* 1989/9/1:

ڕۆژی 1ی ئەیلولی 1989 لەراپۆرتێکی دوولاپەڕەییدا هاوڕێ سوپا پارتیزانەکان لەتەقینەوەیەکی گەورەی(تصنیع العسکری)سەربە(وزارەالصناعە)ئاگادار دەکاتەوە، پیناسەیەکی ئەودام و دەزگایانە دەکات کەھەرلەچەکیسووکەوە تاچەکی کیمیاوی تیادروست دەکرا،سنووری جوگراف وپانتایی شوێنەکان وچۆنیەتی پاسەوانی و ئەوهێزانەی بۆ پاراستنی دیاری کرابوون..ڕوونی دەکاتەوە،کاتی تەقینەوەکە بەوردی دیاری دەکات. کەشەوی1989/8/18.17بووە.

پتر لە 260 ئۆتۆمبیلی ئاگرکوژێنەوە هەوڵی دامرکانەوەیان داوە.

تا8/25 تەرمی سەدان کوژراولە ژێردارو پەردوو دەرەێنراوە، کەگوایە پتر لە (700 جەنازەو1200 ) بریندارببووە.

لەکۆتایی دا ئاواتەخوازن کەرۆژێك دابێت تەکنەلۆژیا..

تەکنەلۆژیا تەفروتونا نکات ورژێمیش بەخۆی وھەموودەست وپەیوەندە تاوانبارەکانیەوە لەناوبچن ومیژۆیش ریسوایان بکات.

# دەوری کاک جەباری حاجی رەشید و هاوڕێکانی

کاتێ ئێمە باس لەقارەمانییەتی ودلێری پارتیزانەکانی دوای ئەنفال دەکەین ،ناشێ وناکرێ دەوری پڕلەسەروەری شەهید حەباری حاجی رەشید فەرامۆش بکەین، ئەم سەرکردە تێکۆشەرە خۆی وهاوسەری لەگەڵ هەڤاڵانی ڕێکخستنەکانی رێکخراوی سلێمانی وگەرمیان..لەدوای ئەنفالەکان رۆڵی دڵسۆزانەوجوامێرانەیان هەبووە لەهاوکاری پارتیزانەکانی کوردستان هەمیشە لەنێوان شاری سلێمانی وکفری دا پێیەکی نێوماشێنەکەی وپێیەکەی تری لەدەواجینەکان بووە ئەویش بۆمەبەستی هاوکاری پارتیزانەکانی گەرمیان.هەوڵ وکۆششی بەردەوام و ماندووبوونی شەهیدجەبارو هاوکارەکانی بەتایبەت چاونەترسی وهاوخەباتی(شەمام خان)ی هاوسەری لەفریاکەوتنی کاك ئازادی سەگرمەدا لەدوای بریندرابوونی لە گەرمیان.. دواترگەیاندنی بەشاروبردنی بۆشاری بەغدا بەشێوەیەکی نهێنی وچارەسەرکردنی بەهیمەتی هەڤاڵ (د.خەسرەوگوڵ محەمەد) و خوالێخۆشبووان کاك (حەمەنووری)و کاك (حەمەرەشیدباریکەیی ) کاریکی هەروا سووك وئاسان نەبوو ،دوتریش جارێکی ترهێنانەوەی بۆ کوردستان وگەیاندنەوەی بەبارەگاکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) هەر لەپیاوی رۆژیتەنگانەی وەك شەهید جەباردەوەشایەوە.ئیستا لەهەل ومەرجی شێنەییدا هەرچی بنووسین وهەرچی بڵێین هێشتا کورتی دێنێ لەئاست هەوڵ وخەبات وفیاکاری ئەم تێکۆشەرە.بەداخەوەلەرۆژی22/10/ 989لەنێوان سلیمانی□کەرکوك لەلایەن رژێمی دژبە کوردەوە گیراو لەگەل چەندهەڤاڵێکی دا لەرێکخراوی سلێمانی راپێچی زیندان کران بێگومان وەك لەشاروشاخ پیاوێکی قارەمان بوو لەزیندانیش دا نموونەی خۆڕاگری و نهێنی پاراستن بوو..

لە رۆژی1990/10/16 بریاری لەسێدارەدانی بۆدەرچوو..

لە 1990/11/18 گەیشتە کاروانی سەروەرانی رێگای رزگاری وسەرفرازی.

# نامەی کاك ملازم عمر بۆکاك حەمەڕەش

برای خۆشەویستم کاکە شێخ محمد

سلاوێکی گەرم

هیوام باشی وسەرکەوتنتە،زۆربەگەرمی لەهەواڵتان دەپرسم.

سلاو وهەواڵ پرسینم بۆئەوبرادەرانەی لەگەڵتا ماوون.

کاك کۆسرەت وبرادەران بەعام سلاو وهەواڵ پرسینیان بۆت هەیە.

کاکەمانەوەتان وخۆراگریتان لەو زروفە سەختەی لای ئێوە نیشانەی پیاوەتی و جوامێریتانە،هەمووبەچاوی نەقدیرەوەسەیری سەبروتەحمل وخۆڕاگریتان دەکەین. واکاك ئازادیش هات و زۆرمان قسەکردووە، دەڵێ من موشکیلەیش بووبێ لەگەڵ سەرکردایەتی ومەڵبەندا بووە وکاك حەمەرەش و ئەو برادەرانە وەك ئەو زەمانە سەیردەکەم کەپێشترپێکەوەکارمان کردووە وهەتاپێکەوە بین ناهێڵم هەست بەوەبکەن کەشتێك هەیە لەنێوانماندا.دڵنیاین تۆیش هەروادەبیت. جائەگەرصحەتت ووەزعی عائیلیت ڕێگەت نادات بمێنیتەوە،ئەوائەگەر بێیت بۆسەرسنوورەکانیش کەس گلەیی نبەوئەم ماوەیەواجبی خۆت بەزیادەوەبەجیهێناوە.بەهەرحاڵ لەسەر مانەوەت یان گەڕانەوەت لەگەڵ کاك ئازادیش قسەبکەوچۆنتان پێ‌باش بوو وابکەن.

هەر بژین...

برای دڵسۆزتان

عمرعبدالله

1988/8/7

# جەماوەر و ڕێکخستن
# لە هاوکاری پارتیزانەکاندا

ڕێکخستنەکانی ناوشار وئۆردوگاکان لەساڵی1988تا ڕاپەڕینیساڵی1991 دەوری کاریگەر و چالاکیان هەبوو لەهاوکاری پارتیزانەکانی گەرمیان ناکرێ ڕۆڵی جوامێرانەیان لەیادبکرێ .دەواجنەکانی (حەمەی وەلی)و(برایمی مەلا بەنزین)دوو شوێنی جێی متمانە وجێگای بەیەك گەیشتنی پارتیزان و ڕێکخستنەکان بوون، ئەم هەڤاڵانە هەریەکەو لەئاستیخۆیانەوە ئەوپەڕی ئازایەتی وقارەمانەیان دەنواند لەڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانیان(کاك حەمەرەشیدوهاوڕێ کامیل وحەمە نوری (هاوڕێ مراد)وکاك جلال عبداللەوکاك خلیفە وکامەران عبداللە)وچەندهەڤاڵێکی تر، هەمووئەمانەبەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی (کاك جباری حاجی رشید)بوون...

ناکری هاوکاری ودەوری ئەم هەڤاڵانە یش فەرامۆش بکرێت :

سدیقی حاجی علی(ابوو علی)و (احمد کوڵکنی)و (حاجی علی)و (انور)و (شهاب)و چەند هەڤاڵێکی تر لەدەوروبەری کفری هەڤاڵان (مەلاتەها ،اسماعیل ،مام خورشید، کاك نازم، مامۆستامحمد، مام حەمهامین،کاك فایقیحاجی حسن لەهێڵی سەرقەلا *

* ئەگەرزۆرتێکۆشەرودڵسۆزیترکۆمەك وهاوکاریپارتیزانەکانیان کردووە ، با ببوورن کە ناوەکانیان نازانین .



## شەهید احمد محمد وتمان
## (مامۆستا ئەحمەدی سناعە)
## شەهیدانی ڕێکخراوی سلێمانی

. شەهید احمد محمد وەتمان ناسراو بە (مامۆستا ئەحمەدی سناعە )

. ساڵی ١٩٥٠ لە شارۆچکەی چوارتا لەدایك بووە، لە ناوچەی شارباژێڕ بووە بە مامۆستای شۆڕش. لەسەرەتای شەستەکانوە تێکەڵ بەکاروانی خەبات بووە .

- لەساڵی ١٩٧٦دا پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە بە(هاوڕێ سوورە) وپاشان بە (هاوڕی گمۆ) ناسراوە .

- لە 1987/4/12 ڕێکخراوی سلێمانی،ئەکەوێتە بەرشاڵاووپەلاماری دائیرەی ئەمنی سلێمانیەوە بەهۆی چەند خۆفرۆشیەکەوە زۆر لەئەندامانی چالاك وبەتوانای ئەوڕێکخراوەبەلێپرسراوەکەیانەوە ( ئەمر جەباری حاجی رەشید) ئەگیرێن، لەپێش هەموبانەوە مامۆستا احمدی صناعە ئەگیرێت، ئەوکاتەمامۆستااحمد لێپرسراوی چاپەمەنی وبلاوکراوەی ڕێکخراوی سلێمانی بووە، لە مالەکەیدا تابیعە و رۆنیو و کۆ مەلێك بەڵگەنامەی کۆمەڵە و یەکێتی ئەگیرێت .

لەکتێبی شەهیدان(جەباری حاجی رشید) وهاورێکانی بەشیکی زۆر لەو زیندانیانە کە حوکم ئەدرێن ، دوای ڕاپەڕین ئازاد ئەبن ،یاداتشت و بیرەوەریەکانی ئەو رۆژگارەی ناو زیندانیان گێراوەتەوە بە تایبەتی رۆژانی ئەمنەسورەکە ، کە چۆن بێ بەزەیی ودرندانە جەلادەکان رەفتاریان لەگەڵ کردوون، چۆن دائیرەی ئەمن ویستویەتی بە هەر نرخێك بیت تەواوی ڕێکخستنی سلێمانی یان پێ ئاشکرا بکات ،هەروەها هەر لەو کتێبەدا بەشیوەیەکی گشتی باس لە خۆراگری و وورەبەرزی ئەو

پۆلە تێکۆشەرەی ناو زیندان کراوە،لەناویاندا مامۆستا احمد وەك هاورێکانی باسیان کردوە، هیچ شێوازیەکی لێدان و ئەشکەنجە و هەڵواسین نەماوە کە لەگەڵ یا بەکارنەهێنن ،لەماوەی نۆ مانگ دا کەم رۆژ هەبوە هەڵواسین و لێکۆڵینەوەی نەبێ ،بەلام لەگەڵ ئەو هەموو زەبر وزەنگەش دا جەلادەکان نەیانتوانیوە سەری بەرزی پێ نەوی بکەن و قەلای وورە و خۆراگری بلەرزێنن ،بە جوامێری و ئازایەتی خۆی جەلادەکانی سەرسام کردوە و ٔهەر ئەوانیش ناوی پاڵەوانی زیندان یان لێ ناوە ،تا ئەو کاتەی لە سێدارە ئەدرێت و خۆی ئەکات بەقوربانی رێکخستن و هاورێکانی تاقە ووشەیەك نادرکێنێ .

هەڤاڵ نەمر مامۆستا ئەحمەد لەگەڵ چوار هاورێی قارەمان و خۆراگری تردا لە ١٦/١٠/١٩٩٠ حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەردەکرێت و لە ١٨. ١١ .١٩٩٠ لە سێدارە ئەدرێن . شەهیدان (جەباری حاجی رشید ، وەستا بکری دارتاش ، حمەرەحیم حەسەن، عەتا حاجی ئەحمەد).



سەرچاوە :فەیسبووکی Razhan Haji



## شـەهید وەسـتا بەکری دارتاش

ابوبکرمحمدسالح ناسراو بە ( وەستا بکری دارتاش )
سالی 1947 لەگەڕەکی صابونکەرانی سلێمانی چاوی بەدنیا هەڵهێناوە
خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی تەواو کردوە لەتەمەنی لاویەوە لەیەکێتی قوتابیان پەیوەندی بەریزەکان پ.دك سالآنی 1967 بۆ1970 پ.م بووە
سالی 1972 پەیوەندی بە کۆمەڵەی مارکسی لینینی کردوە پلەکانی ڕێکخراوەی یەك لەدوای یەك بڕیوە تا دوای ئەنفال کراوە بە ئەندامی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵەو ڕێکخراوی سلێمانی بووە و لێپرسراوی ڕێکخراوی بابەگوڕگوڕی کرکوك بوە سەرپەرشتی هەموو کارەسیاسی وسەربازیەکانی ئەو سنورەی کردوە تا ڕۆژی 1989/11/5 لەدوکانەکەیدا لەلایەن ئەمنی سلێمانیەوەدەستگیر دەکرێت
لە 1990/10/16 لەگەڵ 31 هاوڕێی تریدا لە دادگای بەناو شۆڕش دادگای دە کرێن ، وەستا بکر لەگەڵ چوار هاوڕێی تریدا حوکمی سێدارە دەدرێن
1990/11/7 حوکمەکەیان جێبەجێ دەکرێت ، دوای تێپەڕبوونی 13سالْ و کاتی پرۆسەی ئازادی عێراق ڕوفاتی پیرۆزی لەگەڵ هاوڕێکانیدا گەیەندرانەوە کوردستان و ڕۆژی ٢٤/٥/٢٠٠٣،لەرێوڕەسمێکی پڕشکۆی جەماوەری بەرفراوانی گەورەدا. بەئامادەبوونی ژمارەیەك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی(ی.ن.ك) و کاربەدەستانی حکومی و حزبی و مامۆستایانی زانکۆو سەرۆکی دەزگای شەهیدان و نوێنەری رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکان و بنەماڵەی سەربەرزی شەهیدان و جەماوەرێکی زۆر، تەرمی شەهیدان (جەباری حاجی ڕەشید، مامۆستا ئەحمەدی صناعە،عەتای حاجی ئەحمەد،وەستا بەکری دارتاش،حەمەڕەحیم حەسەن) لەگۆڕستانی ئەبوغرێبی بەغداوە گەیشتەوە شاری سلێمانی و ڕۆژی دواتر لە ڕێوڕەسمێکی شکۆداردا لە گردی سەیوان بەخاك سپێردرانەوە.



# ژیاننامەی هەڤاڵ

# حەمەڕەشید شارەزووری

. ڕەشید شەریف محمد ناسراو بە هەڤاڵ ( حەمەڕەشیدی باریکە ) یان (حەمەڕەشیدی شارەزووری)

. لەساڵی (1944)لەگوندی (بادەرە) چاوی بە دونیا هەڵهێناوە،پاشان لەگوندی باریکە نیشتەجێ بوون،خوێندنی سەرتایی وناوەندی هەر لەوەێ تەواوکردووە..

. لەسەرەتای شەستەکانەوە پەیوەندی بە( پارتی دیموکراتی کوردستان) ە وە کردووە لە ڕیزەکانی پارتیدا پلەی ئەندام ڕێکخراوو ئەندام ناوچەو تا پلەی لێپرسراوی ناوچەی بڕیوە..

- لەشۆڕشی ئەیلول دا لەسنووری(شارەزوور،وارماوا،خورماڵ،سیوەیل) پیشمەرگایەتی کردووە

- لەدوایی نسکۆی شۆڕش ئاوارەی وڵاتی ئێران بووە ، دوایی گەڕانەوەی لەئێران پەیوەندی بەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە و لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بووە لەناوچەی شارەزوور

- لە ساڵی( 1988) ئەندامی ڕێکخراوی سلێمانی وبەرپرسی کەرتی (شەهیدسەرکەوت)وئەڵقەی پەیوەندی ڕێکخستنەکانی ناوشارو مەفرەزە پارتیزانەکانی گەرمیان بووە ..

- داویی ڕاپەڕینە مەزنەکە یەکەم کۆمیتەی لە شارەزوور دامەزراندووە و خۆی بووە بە لێپرسراوی ، دواتر کراوە بەئەندامی مەکتەبی عەسکەری و دواپلەی لیپرسراوێتی(جێگری لێپرسراوی مەڵبەندی شارەزوور) بووە..

- لەساڵی (2001) بە نەخۆشی وەستانی گورچیلە گیانی سپاردووەو لە گۆرستانی (باریکە) بەخاك سپێردراوە...

سەرچاوە : فەیسبووکی مەحمودی مامە حەمە



## هەڤاڵ اسماعیل مردان

## نـاســراو بە( سامی )

**بیرەوەری خۆی ئاوا یاداشت کردووە :**

**. لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول و مەنفی کردنی بۆ (شاری ناصریە) ی خواروی عێراق بە ناوی عائدون لەمانگی10ی 1976 دەگەڕێتەوە بۆشاری کەلار ، لە 1976/10/15) پەیوەندی دەکات بە(کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)ەوە لەپاش (6مانگ) تاقیکردنەوە (امتحان) پرسیار و وەڵامێکی زۆر سەرکەوتوو دەبێت و دەبێت بە(بەئەندام)**

**. لە ساڵی 1979 دەبێت بەلێپرسراوی پۆل لە ساڵی 1985 دەبێ بە بەئەندام لیژنە ئەوکاتە لەجیاتی کۆمیتە یان ناوچە لیژنە بوو..**

. لەساڵی 1988 پاش ئەنفالەکان بەهەڵبژاردن لەرێی هەڵبژاردنەوەدەبێت بە لێپرسراوی لیژنەی کەلار..ئەندامانی لیژنەکە ئەم هەڤاڵانە بوون:کاک صدیق سعید ناسراو بە (ابوعلی) ، کاک جلال عبدالله ، مامۆستا احمد شوکت .

هەتا ئەوکاتە ژمارەی ئەندامانی لیژنەکەیان دەگەیشت بە(600ئەندام) ئەوسا ئیش و کارەکان زۆر قورس و گران دەبێت،هەربۆیە رێکخراوی سلێمانی داوایان لێدەکات بۆ ماوەیەك ئیش وکاری ئەندامان رابگرن،تەنیا چەندهەڤاڵێك کارەکان بکەن.. ئەوانیش بریارەکە جێبەجێ دەکەن،بەچەند هەڤاڵێك ئیشەکانیان جێ بەجێ ئەکەن، بابزانین لەوبارەیەوە هاورێ (سامی ) دەڵێ چی..؟

ـ لە دوای ئەنفالەکانیش سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بریاری دا لەهەمووکوردستاندا پێشمەرگەکان درێژە بە خەباتی پارتیزانی بدەن، لەناوەند و رێکخراوی سلێمانیەوە بەهۆی کاك (حمە نوری) یەوە نامەیان بۆ ناردین، داوایان لێ کردین پەیوەندی بکەین بە پێشمەرگە پارتیزانەکانەوە، لەنامەکەدا شاخی(ئاشداخ) دیاری کرابوو، کە لەوێ یەکتر ببینین، ئێمەش هەڤاڵ محمد محمود ناسراو بە(خەلیفە)مان ناردمان بۆ ئەوسنورە،بەهۆی کاك(صالح حمەخان)کە ئەویش لەرێکخستندا بوو لەوسنورە بوو،خەلیفەمان کردە نەخۆش ، شەخسێك ،مەرقەدەکەی لەو سنورە بوو ناوەکەیم بیرنەماوە،خەلیفەبەهۆی کاك صالحەوە رۆیشت بۆسەرمەرقەدەکە،بۆچاو پێکەوتنی برادەران ،لەوێ چاوی کەوت بە شەهیدی نەمر کاك حمە رەش و کاك عوسمان حاجی محمود و چەند برادەرێکی تر،ئەوێ رۆژێ ناوچەکە هەمووی رەبیەی جاش بوو، پاش کۆبوونەوەو ئاڵوگۆری بیرورا شەهیدی نەمر نامەیەکی نارد بۆ ئێمە لەنامەکەدا هاتبوو( ئەگەر بکرێت لەباوەنورەوە هەتا گردەگۆزینە ریگایەك بدۆزنەوە چونکە ئەو سنورە بۆ ئێوەو بۆ ئێمەش دوورە) من وخەلیفە یش بیرمان لەرێگایەکی تر کردەوە،لەئاوەخوێری چەند دەواجنێك هەبوو، ئەمان ئەناسین ،دەواجنەکەی کاك

حمەی ولی لەویٚ بوو لەڕیٚگای خەلیفەوە داوامان لیٚکرد یارمەتیمان بدات، جاربەجار هەندیٚ ئیش و کارمان هەیە لەگەڵ پیٚشمەرگەدا ئەنجامی ئەدەین، کاک حمەی ولیش قوبوڵی کرد، ئیتر زۆربەی ئیش و کارەکان لەگەڵ پیٚشمەرگە پارتیزانەکان لە ڕیٚگای ئەویٚوە ئەنجام ئەدرا یەکیٚك لەوانە کاك ئازادی سەگرمە بوو بەبریندارى وبە نهیٚنی لەویٚوە هیٚنامانەوە و ناردمان بۆ سلیٚمانی، لەسلیٚمانیش کاك حمەنوری و کاك حمەرشید لەگەڵ چەند هەڤاڵیٚکدا سەرپەرشتی ئەو کارەیان کرد..

. لەساڵی 1989بەیارمەتی و هاوکاری کاك ابراهیم علی رەزا ڕیٚگایەکی ترمان دروست کرد، لەهەڵەتەکانی کفری لەدەواجنەکەی( ابو علی)یە وە ، هەر (ابوعلی) خۆی سەرپەرشتی ئەو کارو بارەی ئەکرد،0بۆزانیاری پیٚشمەرگەکان ژمارەیان زۆر بوو بەلاٚم ئەوانەی لەگەڵ ئیٚمەدا پەیوەندی و کارو باریان ئەنجام ئەدا پاش شەهید بوونی (حمە ڕەش ، کاك عوسمان حاجی محمود و کاك عدنان حمەی مینا و کاك کوردۆ بوون، ئیش و کارەکانمان بەباشی ئەڕۆیشت ، دیسان لەناوەند و ڕیٚکخراوی سلیٚمانیەوە نامەیان بۆ ناردین بۆ دروست کردنی سوپای ڕزگاری کوردستان (سرك) ئیٚمەش دروستمان کرد،لەوکاتەدا چەند چالاکیەکمان ئەنجام دا ، لەڕاپەڕینەکەی (1991) دا لەگەڵ ئەو پیٚشمەرگانەی لەسەرەوە هاتنەوەو لەگەڵ پارتیزانەکانی دوای ئەنفال دەوریٚکی بالاٚیان هەبوو لەرزگارکردنی ئۆردوگا وشارو شارۆچکەکانی گەرمیان.

# کاك نەوشیروان

**چۆن باس لەکاك حەمەنوری( هاوڕێ موراد )دەکات**

کەسێ بەناوی هاوڕی موراد کەمن لەخەباتی نهێنیدا ناسیم و، لەناو کەسوکاری داناوی کاك حەمە نوری کوڕی کاك ئەحمەدبوو،ئەوپیاوە قارەمانەبوو:

. لەکاری ڕێکخراوەییدا،شارەزاوبەرپرسی ڕێکخراوێکی نهێنی چالاك وفراوان بوولەکفری وکەلارەوەتاشارەزووروسلێمانی..

. لەکاری پارتیزانیدا،ئەلقەی پەیوەندی نێوان پارتیزانەکانی گەرمیان و ڕێکخستنە نهێنیەکان وسەرکردایەتی بوو،دابینکەری خۆراك ودەرمان وپێویستییەکانیان بوو..

. لەکاری پێشمەرگەییدا،یەکێبوو لەدامەزرێنەرانی دەیان شانەی چەکداری ((سرك))و((شالاو)).

لەراپەریندا،یەکێبوولەسەرکردەکانی سازدانی شانەچەکدارەکانی

شالأو وکۆمەلانی خەڵك لەسەرانسەری گەرمیان دا...

گیانی هاوڕێ موراد شادو یادی هەمیشەزیندووبێ !

نەوشیروان مستەفا ئەمین

* بڵاوکراوەی مۆردانە 2005/6/6 /ژ تایبەت / لەکۆڕی چلەکەیدا دابەشکرا

# نـامەی
# کاك نەوشیروان
# دەربارەی کاك حەمەنووری :

**کەسیٚ بەناوی هاوڕیٚ موراد کەمن لە خەباتی نهێنی دا ناسیم و، لەناوکەسوکاری دا ناوی کاك حەمەنوری کوڕی کاك ئەحمەد بو، ئەوپیاوە قارەمانەبو:**

**. لەکاری ریچکخراوەیی دا، شارەزاو بەرپرسی رێکخراوێکی نهێنی چالاك و فراوان بو لەکفری وکەلارەوە تا شارەزوور وسلێمانی،**

**. لەکاری پارتیزانی دا ، ئەلقەی پەیوەندی نێوان پارتیزانەکانی گەرمیان و رێکخستنە نهێنی یەکان و سەرکردایەتی بو، دابینکەری خۆراك و دەرمان وپێویستی یەکانیان بو،**

**. لەکاری پێشمەرگەیی دا، یەکیٚ بو لەدامەزرێنەرانی دەیان شانەی چەکداری (سرك) و(شالاو)**

**. لەراپەڕین دا ، یەکیٚ بو لەسەرکردەکانی سەروانی شانە چەکدارە کانی شالاو وکۆمەلانی خەلك لەسەرانسەری گەرمیان دا...**

**گیانی هاوڕیٚ موراد شاد و یادی هەمیشە زیندووبیٚ !**

**نەوشیروان مستەفا ئەمین**

# مەلابەختیار:

## حەمەنوری:

## ماڵی بارەگا،ژوری بروسکەخانە،هاوسەری نهێنی پارێز، سەرێکی لای پارتیزانەکان وسەرێکی تری لەگەڵ رێکخستنە نهێنیەکان بوو*

(..کاکە موراد..

هاورێکانی باسی خەباتی نهێنی وئەوگیانەکوڵنەدانەبێوێنەیەیان کردووە کەلە رۆژگاری ئەنفالەکاندا، بەخۆی وماڵ ومناڵی نواندویەتی، ئەوەی دەشگێڕێتەوە لەم جۆرە تێکۆشەرانە،لەئەفسانەوچیرۆکی خەیاڵی دەچێ، بەڵێ...

کاریکردەنەبووە، لەسەردەمی ئەنفالدا ماڵت بارەگاو، ژوورت بروسکەخانەو، هاوسەرت نهێنی پارێزو، کەسوکارت پۆستەچی و، خۆشیت سەرێکت لەگەرمیان و سەری ترت لەکوێستان، دەستێکت لەگەڵ پارتیزان ودەستەکەی ترت لەگەڵ رێکخستنە نهێنیەکان بێ، ئەم کارانە بەراستی ئاسان نییە باوەڕبکرێ لەدەست مرۆڤ هاتبێ، بەڵام بەسەداز نموونە هەن کە مرۆڤی وەکو کاك حەمەنوری، کاری ئەفسانەییان لەدەست هاتووە.)

---

* مۆردانە / 2005/6/6 ژ تایبەت / لەکۆڕی چلەکەی دا دابەشکرا



## حەمەنوری؛
## جوامێری رۆژگاری سەخت بوو*

سەرەتای مانگی دەی ساڵی(1988)دوای رۆژە رەشەکانی ئەنفالی بەدناوبوو، بۆیەکەمجار کاك (حەمەنوری)م دیوناسی لەسلێمانی لەماڵی شەهیدی نەمرجەباری حاجی رەشید لەگەڵ بەریزان،خوالێخۆشبووان (حەمەرەشیدشەریف باریکەیی) و کاك (مستەفا دەرویش، شاسوار، ئاکۆ محمد وەهبی، سامان مولود، ئەورۆژەی پارتیزانە تێکۆشەرەکان منیان سپارد بەخوالێخۆشبووکاك حەمەرەشید وکاك کارزان اسماعیل لە دەواجنەکەی بەرێزکاك حەمەی وەلی، کاك حەمەنوری و کاك(حەمەلەتیف)یش بەئوتۆبێلێکی تربۆئاگاداری رێگاوبان وئاگاداری ئێمە لەگەڵمان هاتبوون تا بەسەلامەتی گەیشتینە سلێمانی.

پیاوێکی بە بڕوا،تێکۆشەر،نەترس،بە ورە،جوامێر،لەورۆژەسەختانەدا رێگای تێکۆشانی خەباتی فیداکاری کوردوکوردستانی هەڵبژارد،رۆڵێکی دیاری هەبوو لەرێکخراوی سلێمانی وهاوکاری پارتیزانەکانی دوای ئەنفالدا، لەسەر بڕیاری شەهید جەباری حاجی رەشید،کاك حەمەنوری وکاك حەمەرەشید بە ئۆتۆمبێل لەسلێمانییەوە منیان گەیاندە بەغا، لەوێش برایبەرێزکاك د.خەسرەوگوڵ محەمەد ئاگادارو ئامادەبوون.منیان بردەنەخۆشخانەیەکی ئەهلی(مستشفی نینوی للکسور)

لەگەڵ دکتۆرەکەقسەیان کردبوو،رێکیان خستبووکەچارە سەربکرێم،کاك حەمەنوری ووتی:برادەران باکامیرەیەکی ڤیدیۆبەێنین هەندێ وێنەی ئەم بریندارەمان بگرین، بۆیادگار،بەداخەوە رێکنەکەوت،کاك جەباری حاجی رەشید، حەمەرەشید شەریف، حەمەنوری عەبدوڵا، هەموو ئەوبرادەرانە پێپێشترناوم بردبوون، رۆژ عەمەلیاتەکە ئامادەبوون، دواتربرای تێکۆشەرو بەرێزمان کاك حەمەنوری لەشاری سلێمانی بەوە خوشکی گەورەم وخێزان ومناڵەکانی هێنا بۆلام،پاش ماوەیەکی تریش دایکم و باشان گەڕانەوە،ئەوانەهەموجوامێریی ئەوپیاوەتێکۆشەرەدڵسۆزە خۆنەویستەبوو، لەو رۆژگارە رەشەدا،کەتاقە تروسکایی،تەنها پارتیزانەکان بوون،پارتیزانەکانیش شەریان بەمەرگ دەفرۆشت.

ئەوبرابەرێزەلەگەڵ من هەرباسی رێکخستن و کاروباری پێشمەرگایەتی وشۆرشی ئەکرد، هۆشیارانە زۆر هیمەتی ئەنواند بۆ سەرخستنی کارەکان لەگەڵ رێکخراوی سلێمانیدا،بڕوای تەواوی بەسەرکەوتنی خەباتی رەوای گەلی کوردستان و شۆرشەکەی هەبوو،بەداخەوە کۆچی ناکاو وناخۆشی ئەم تێکۆشەرە بەئەمەك و جوامێرە،دڵتەزێن بوو پیاوی رۆژانی سەخت و تەنگانەبوو،تێکۆشەرێك بوو، شایانی نازناوی تێکۆشانی بەهەق پاراست، هەرزیندووبێت گیان ویادو ناوت.

هەزاران سلاو وڕێزو چەپکەگوڵ بۆگیانیبەرزرفرت و

بۆهەمیشەیادت بەخێر

برای دڵسۆزتان

ئازادی سەگرمە

2005/5/9

---

* مۆردانە / 2005/6/6 /ژ تایبەت /لەکۆڕی چلەکەیدا دابەشکرا



# مەلا بەختیار:

## با رۆحی پاکی ئەم شەهیدانە، بکەینە هەوێنی هەڵوێست و رێگەی خەباتی شەهیدانی رێکخراوی سلێمانی بەردەوامە، هەتا ئەو رۆژەی دوا ئامانجەکانی دیموکراسی بەدی دێت...

رۆژی 2013/11/18 لەگردی سەیوانی شەهیدان، لەشاری سلێمانی، کەسوکاری شەهیدانو ئەنفالکراوان، رێوڕەسمیساڵیادی شەهیدانی رێکخراوی سلێمانی (جەباری حاجی رەشید، وەستا بەکری دارتاش، مامۆستا ئەحمەدی سەناعە. حەمەڕەحیم، عەتا حاجی ئەحمەد)ی بەڕێوەچوو.

لەمەراسیمەکەدا، کە هەڤاڵان شۆڕش ئیسماعیل، مەحمود سەنگاوی، ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو وەسفییە بەنی وەیس،لەتیف شێخ عومەر،بڵێسە جەبار فەرمان. ئەندامانی سەرکردایەتیو ژمارەیەك لەلێپرسراوانی ئۆرگانە جیاوازەکانی یەکێتییو هەڤاڵانو هاوسەنگەرانی شەهیدان ئامادەیبوون،لەو مەراسیمەکەدا. چەندین چەپکە گوڵی وەفاو رێزلێنان لەسەر گۆڕی شەهیدانی رێکخراوی سلێمانی (جەباری حاجی رەشید، وەستا بەکری دارتاش، مامۆستا ئەحمەدی سەناعە. حەمەڕەحیم، عەتا حاجی ئەحمەد) دانرا. هەڤاڵ مەلا بەختیار، لێپرسراوی دەستەی کارگێڕی،وتەیەکی پێشکەشکردئەمەی خوارەوە دەقی وتەکەی هەڤاڵ مەلا بەختیار. لێپرسراوی دەستەی کارگێڕی،مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە.:

**کەسوکاری سەربەرزی شەهیدانی ڕێکخراوی سلێمانی..**

**ئامادەبووانی ئەم مەراسیمە**

زۆر سوپاس بۆ ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئابوری کەسوکاری شەهیدان و ئەنفالکراوان، کە ئەمڕۆژەی بۆ ساڵڕۆژو ڕێزلێنان لەشەهیدانی ڕێکخراوی سلێمانی دەستنیشان کردو ئێمەو مانانیشی داوەتکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ ویژدانی خۆماندا، پەیمان لەگەڵ شەهیدەکانماندا نوێبکەینەوە، بەهیوای ئەوەی بتوانین، لەپێناو بەدیهێنانی ئاواتەکانیاندا. درێژە بەڕێبازەکەیان بدەین.ئەم پۆلە شەهیدە، کە(23)ساڵی تەواوە،لەسەردەستی جەلادەکانی بەعس لەسێدارە دران،پۆلێك لەشەهیدی قارەمان،کەهەریەکێکیان پێش شەهیدبوونی،زیاتر لە(20بۆ 25)ساڵ، لەکۆڕی خەباتوتێکۆشاندا.خەباتی ئاشکرا،خەباتی ژێرزەمینی،خەباتی ڕێکخستنە نهێنی یەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی، بێ پسانەوە، سەختترین ئەرکی شۆڕشگێڕانەیان، لەدژی داگیرکارانی کوردستان ڕاپەڕاندووە.بەعس، سەرەنجامی ئاشکرابوونی هێڵە نهێنییەکان، ئەم پۆلە شەهیدەی دەستگیرکرد. کە گرتنیشی، ئەشکەنجەیەکی زۆر زۆریدان، بەلام سەر بڵند، لەبەردەم جەلادەکانی بەعس، خۆیان ڕاگرتو جەلادەکانیش ئەوەندە لەم پۆلە شەهیدە ترسان، بۆیە لەسێدارەیاندان.

شەهیدەکان، لەجەلادەکان نەترسان، بەپێچەوانەوە، جەلادەکان لەو شۆڕشگێڕانە ترسان، بۆیە لەسێدارەیاندان. چونکە کاتێك جەلادێك، کاربەدەستێك بڕیاری شەهیدکردنی تێکۆشەرێك دەدات، ئەوە جەلادەکە لەتێکۆشەرەکە دەترسێت. ئەگەر لێی نەترسێت، ئەوا ڕێگەی دەدا، بەئاشکرا خەبات بکات. چونکە دەزانێت ئەم تێکۆشەرانە، ئەوەندە شۆڕشگێڕ بوون، لەگەڵ هاوسەنگەرەکانی تریان، بەعسیان بەرەوسەرنگومبوون دەبرد.بۆیە بەعس،یەکێك لەسیاسەتەکانی، هەمیشە پەنابردنی بووە بۆ لەسێدارەدانی قارەمانەکانو سەرقافڵەی شەهیدانی شۆڕشی نوێمان، کاکە

شیهابو مامۆستا حەعفەرو کاك ئەنوەرو قارەمانەکانی تربوون، کە بەدروشمی کەم بژیو کەڵا بژی، چرای خۆبەختکردنو چرای ڕێگەی تاریکی خەباتیان بۆ هەموو تێکۆشەرانی دوای خۆیان هەڵکرد.

من، شەرەف ناسینی هەموو ئەم تێکۆشەرانەم هەیە، لەخەباتی ژێرزەمینی، لەماڵەکانیاندا خۆم حەشارداوە، ئاگاداری وردو درشتی چۆنێتی خەباتکردنیان بووم. دەزانم کە هەریەك لەم شەهیدانە، هەر بەکردەوە یارییان لەگەڵ مەرگدا دەکرد، چونکە قارەمان بوون. دەتوانم بڵێم شادەمارەکانی ڕێکخستن، بەشێکی زۆری ڕێکخستنەکانی شارەکانی کوردستانو بەتایبەتی شاری سلێمانی، لەقۆناغی ئەنفالەکاندا، لەڕێگەی ئەم جوامێرانەوە، تانوپۆی چنراوە.

من، بۆخۆم، پێنج مانگ لەماڵی شەهید بەکری دارتاش، موختەفی بووم. لەڕۆژگارێکدا، کە ئاسان نەبوو، کەسێك، کەسێکی تر داڵدە بدات. پێنج مانگی رەبەق، لەماڵی ئەو شەهیدە قارەمانە، موختەفی بووم. بۆیە هەریەك لەشەهید جەبار، شەهید عەتا، شەهید بەکر، شەهید مامۆستا ئەحمەد، حەمە ڕەحیم، باش باش دەناسم. چونکە زیاتر لە(7)ساڵ کاروباری ڕێکخستنە نهێنییەکانم لەئەستۆدابوو، دەزانم ئەم پۆلە شەهیدەو سەدان قارەمانی تر، کە هێشتا قارەمانی خەباتی ژێرزەمینی گومناون. هێشتا هەن کەمیان کردووە بەئاشکرا، بەڵام زۆریان بەرکەوتووە، بەڵام ئەمان زۆریان کردووەو جاری کەمیان بەرکەوتووە. چونکە لەخەباتی نهێنیدا، هەمیشە تێکۆشەرەکان، کەم بەش دەبن لەخەبات، ناویان لەخەباتدا کەمترگەشدەبێتەوە، لەکاتێکدا ئەوان زۆرزیاتر دەکەن لەهەندێك تێکۆشەر، کە زیاتر لەبارستایی خۆیان، لەخەباتی شاخو ئاشکرادا ناو دەردەکەن.
ئێستا،کە ئێمە لە (23 ساڵەی شەهیدبوونی ئەم قارەمانانەدا، لەسەر گڵکۆکانیانو لەگردی سەیوانی شەهیدان وەستاوین، هەمووتان دەبینم، کە وەفاتان هانیداون.

لێرە رابوەستن، چ کەسوکاریان، چ هاوسەنگەرەکانیان، چ ئەو چەپکە گوڵو ئاڵا جوانانەی کوردستان،کە بەدەستانەوەیە، بێگومان ئەمە هەم وەفایە بۆ شەهیدەکان، هەم پەیمان نوێکردنەوەیە بۆ سەنگەرەکانی شەهیدان، کە تێبکۆشین، بەهەموومان، بەهەر بیروباوەڕێك کە هەمانە، تێبکۆشین بۆ ئەوەی ئامانجەکانیان، ئامانجە دورەکانیان کە هێشتا ماوە بەدیبێت، بەدیانبهێنین. کە بێگومان ئێمە (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان)، هەمیشە خۆمان بەقەرزارباری شەهیدەکانمان دەزانین.

من، لەو بڕوایەدام، کە ئەگەر شەهیدەکان نەبوایە، یەکێتیی نیشتمانی، نیوەی ئەو سەرکەوتنانەشی بەدەستنەدەهێنا، کە تائێستا بەدەستی هێناون. هەر قەرزارباری یەکێتییو مەکتەبی سیاسیو سەرکردایەتی یەکێتییە بۆ شەهیدەکان، کە دەبێت وایلێبکاتو ئەنجامەکانی هەڵبژاردنیش رای بچڵەکێنێتو بزانێت، ئەگەر زیندوانیش وەك پێویست لێپرسینەوە لەگەڵ یەکێتی نەکات، ئەوە شەهیدەکانو رۆحی شەهیدەکان، قەتماغەی زامی شەهیدەکان، دەبێت ئازاری یەکێتیی بداتو ناچاری بکات، بەهەڵەکانی خۆیدا بچێتەوە، بۆ ئەوەی لەناو میللەتەکەمانو لەناو دەنگدەری میللەتەکەماندا. لەناو پرۆسەی دیموکراسی، ئەم خەباتە دورودرێژەی بەدیهێنانی دیموکراسی یەکێتیی نیشتمانی، دەبێت هەڵەکانی چارەسەر بکاتو هەڵبسێتەوە. ئەمەش ئەرکی سەرشانی هەموومانە. چونکە پەیمان لەگەڵ شەهید، پەیمان نییە بەسۆز، پەیمان لەگەڵ شەهید، پەیمانی بەردەوامی خەباتە، سەنگەر چۆڵنەکردنەو هێشتنەوەی حزبی شەهیدەکانە.کە هەمیشە لەسەرکەوتندابێتو هیچ کاتێك چاوپۆشی لەهەڵەکانی نەکات.

یەکێتیی (17)هەزار شەهیدی سەنگەری هەیەو (1628) شەهیدی لەسێدراە دراوی هەیە، ئەمەش بۆ خۆی فێرگەیەکی مێژووی ئێجگار گەورەیە. ئەمە جگە لەوەی کە کۆمەڵێك شەهیدیش هەیە. کە هەم لەناو شۆڕشو لەدەرەوەی شۆڕشیشدا غەدری

لێکراوە، ئەمانەیش ئەگەر قەتماغەکانیان هەڵبدەینەوە، برینێکی ئێجگار گەورە بۆ هەمووومان دروستدەکەن، کە بەداخەوە، ئێستا کاتی ئەوەنییە وردو درشتی کۆمەڵێ لەکارەساتەکانی ناوەوەو دەرەوەی شۆڕش باس بکەین، بۆ ئەوەی بزانین، کە هەم لەشاخ هەڵەی زۆرکراوە،هەم لەشاریشدا،وەکوپێویست ئەرکەکانمان رانەپەڕاندووە.
بۆیە، من لێرە، بەناوی مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانی یەوە، بەناوی ئەنجومەنی سەکردایەتی یەکێتی یەوە ئەو بەڵێنەتان دەدەینێ، کە بەرەو چوارەمین کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی دەڕۆین. لەم کۆنگرەیەشدا، پێش ئەوەی وەکو زیندووەکان بچینە ناو هۆڵی کۆنگرە، پێشئەوەی بە بەرژەوەندی بچینە ناو کۆنگرە، پێشئەوەی بیر لەوە بکەینەوە، کە چی لەیەکێتیی دەکەین، یان نا، بەڵێن دەدەین، کە ئێمە خەمی ئەم شەهیدانە ببەینەناوکۆنگرەو لەراستکردنەوەی هەڵەکانی یەکێتیی.ڕۆحی پاکی ئەم شەهیدانەبکەینە هەوێنی هەڵوێستو سیاسەتە راستەکانی خۆمان. بۆ ئەوەی یەکێتیی بۆ قۆناغی ئاییندە ئامادە بکەین.
هەزاران سڵاو لەگۆڕی پاکی ئەم شەهیدە قارەمانانە ، کە(23)ساڵە بەجەستە بەجێیانهێشتووین.بەڵام بەرۆح، بەقارەمانێتی، بەنەمری، بەسەروەری، بەسەربەرزی کەسوکاریان، لەناوماندان، لەویژدانماندان.ڕێگەی خەباتیان بەردەوامە،هەتا ئەو رۆژەی دوا ئامانجەکانی دیموکراسی بەدیدێت، هەتا ئەو رۆژەی هەمووومان، دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، بەدیدەهێنین.

لەگەڵ رێزمدا....



# پەیوەندی پارتیزانەکان بەسەرکردایەتی شار و شاخەوە و رۆلی کاك نەوشیروان لەوبوارەدا



# ڕۆڵی کاک نەوشـیروان لە خەباتی پارتیزانی

کاك نەوشیراون لەسەر سنور لە زەڵێ وقاسمەڕەشەوە پلانی خەباتی پارتیزانی دادەڕشت بۆ ئەوی ڕۆژێی خەباتی کوردایەتی بەڵێ کاك نەوشیروان مەفرە پارتیزاانەکانی پێشمەرگەی لە شێوەی ڕەتڵ ڕەتڵدا ڕێکخستەوە بۆبەڕێکردنەوەی هەر ڕەتڵێکیان بۆ ناوچەیەکی جیای کوردستان کەئەو کات تەواوی کوردستانی باشور لە ژێر دەستی هێزە زۆرو زەبەلاحەکانی ڕژێمی بەعسدابوون جگە لە چەند ناوچەیەکی زۆر کەم نەبێت پلانی دامەزراندنی مەفرەزە پارتی زانەکانی یەکێتی لەلایەن کاك نەوشیروانەوە بۆئەوەبوو تا بەدوژمنی بەعس بڵێت کەتۆ چەند بەهێزبیت بەڵام هەرگیز ناتوانی کوردو شۆڕشەکەی لەناوبەری لەلایەکی تروە دامەزراندنی مەفرەزە پارتی زانەکانی یەکێتی بۆ ئەوەبوو تا کۆمەلانی خەڵکی کوردستان ئومێدو هیوایەکیان بەشۆڕشی نوێ و پێشمەرگە بۆدروست بێتەوە لە وە هەست بکەن پشت و پەنایان بۆ دروست بۆتەوە کە هێزی پێشمەرگەیە لە لایەکی تر دروست کردنی مەفرەزە پارتی زانەکانی یەکێتی بۆ ئەوەبوو تا ڕێکخستنە نهێنی یەکانی ناو شاری یەکێتی زیندوکاتەوەو گرێیانداتەوە بەسەرکرایەتی یەوە لە قاسمەڕەش من لەبیرمە سالی 1989مەفرەزە پارتی زانەکانی ڕەتڵی سورداش کە ئەوکات شەهیدی نەمرکاك غەریب هەڵەدنی سەرپەرشتی دەکردن لەبناری شاخی پیرەمەگرون وڕێگای سلێمانی دوکان وسەرگەڵوو بەرگەڵو و دوڵی جافایەتی و لەدەشتی مەرگە وشاربازێڕ چەندین جار گورزی کوشەندەیان لەهێزەکانی بەعس وەشاند هەموو خەڵکی پیرەمەگرون و دوکان ناوچەکە ئەوڕاستی یە باش ئەزانێ کەپێشمەرگە پارتی زانەکانی ڕەتڵی سورداش چ ترسێکیان لەدڵی دوژمندا دروست

کردبوو ئەمە بێجگە لە مەفرزەپارتی زانەکانی تری یەکێتی لە ناوچەکانی تری کوردستاندا کەتەواوی ناوچەکانی کوردستان پێشمەرگەی پارتی زانی یەکێتی بۆ ڕەوانە کرابوو وەتەواوی مەفرەزە پارتی زانەکانی یەکێتی کاك نەوشیروان سەرپەرشتی دەکردن لە دوای ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفالیش کە رژێمی رووخاوی سەدام ئەنجامیدا کرامە فەرماندەیی هێزە پارتیزانەکانی گەرمیان، سالێك لە گەرمیان مامەوەو دوای ئەو سالە چووومە ئێران، ئەوکاتە هێزەکانی ئێمە لە دزلی جێگربوون و پاش ماوەیەك جارێکی تر هاتمەوە بۆ گەرمیان بۆ کاری پارتیزانی تا ئەوکاتەی راپەڕینی 1991، لە دوای ئەوەی لە راپەڕیندا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە سەرپەرشتی سەرۆك مام جەلال بەرنامەیەکی تۆکمەی هەبوو، لەو بەرنامەیەشدا ئەرکی من لە باوەنور بوو لەگەڵ هاوڕێیان کاك فەرەیدون عەبدولقادرو مامۆستا عەلی عەبدولاّ و کاك عەدنانی حەمەی میناو کوردۆ قاسم هەمووومان هاتینە ناو شاری باوەنور، لەوێشەوە هەڤاڵان بەرەو کەلار رۆیشتن و من گەڕامەوە بۆ دەربەندیخان کە سەلامی کۆیخا عەزیزو شەهید مەحمودی مامە عەزەمان دانا بوو بۆ دەربەنیخان، من گەڕامەوە سەرپەرشتی دەربەندیخانم کردو دواتر چووم بۆ جەبهەی جەلەولا لە گوندی ئیسلاّح جێگیر بووم کە یەکەمین رۆژ شەڕەکە زۆر توند بوو لە کەلارەوە لەگەڵ عەدنانی حەمەی مینا بەرێکەوتین و گەیشتینە لای کولەجۆ. لەوێ شەڕەکە گەرم بوو و برایەکی کاك عەدنان هەبوو کادرێکی زۆرباش بوو لەوێدا شەهیدبوو، بەلاّم کاك عەدنان بەدیار مەیتەکەیەوە دانەنیشت و لەگەڵ ئێمەدا بەردەوامبوو لە شەڕکردن تا کۆتایی شەڕەکە، لەو رۆژەدا چەندین تانکمان گرت و سەربازێکی زۆری سوپای عیراقیمان بەدیل گرت بە پێشمەرگەیەکی زۆر کەمەوە..

* ماڵپەڕی ستاندەر/ تاریقی مەڤاڵ سەرگەلۆیی/ ئینگلتەرا..

# کۆبوونەوەی پارتیزانەکان
# لە گوندەکانی باوان وپاریۆلە

ئەگەرچی لە کێومالکردنی مانگەکانی مایس وحوزەیران وتەمموزدا ڕژێم چەند جارێك بەکاولکردنەوەی هەمووگوندەکانداچووبووەوە ،لە هەرشوێنێك کەلاوەیەکی، ڕاچاو کردبوو وێرانی کردبوو،لەگوندی(خانی سەروو)دەستی لەپارتیزانەکانی حیزبی شیوعی وەشاندبوو و شەهید وبرینداریان هەبوو ..

کۆپتەرەکان دۆڵ بەدۆڵ وێرانە بەوێرانە دەگەڕان...لەوسەرو بەندەدا بوو،جارێکی ترهەڤاڵ(نەوشیروان مستەفا)ئاگاداری پارتیزانەکان دەکاتەوە:

(لەڕۆژانی دواترچاوەڕوان بن لێپرسراوێکی ترتان بۆدەنێرین.)

دوای ئەم بروسکەیەجارێکی ترکاك حەمەڕەش لەپەیوەندییەکدا(کاك نەوشیروان) پێی رادەگەیەنێ:

( ئیترلەڕێی کاك(محمدمحمود) ناسراو بە (خەلیفە)وە پەیوەندی دادەمەزرێت.*)

- لەشەوی 1988/6/15 لەنێوان گوندەکانی(باوان) و(پاریولە)کۆدەبنەوە،نامەی هاوڕێ (بەمۆ) تەسلیم بەدەستی(کاك عوسمان حاجی محمود)و (کاك عدنان حەمەی مینا) دەکرێ، ئەوانیش بەپەلە نامەکە دەگەیەنن بەکاك(حەمە ڕەش) .ناوەڕۆکی نامەکە باسی ڕۆڵی پارتیزانەکانی تیادەبێت وئامادەیی هەڤالانی ڕێکخستن بۆ پارتیزانەکانی تیادادەبێت. جگە لەدیارییەکی بەنرخ کەبریتیدەبێت لە یەك کارتۆن پێداویستیو دەرمان وخواردن.شوێنێکیش بەناوی (هەنارە) لەسەرڕێگای( قەرەداغ سەنگاو) دەستنیشان دەکەن بۆ پەیوەندیداهاتوویان.لەوە بەدواوە تا ئابی 1988 بەردەوام هاوکاری ڕێکخراوەکانی ناوشارگەیشتووە بە پارتیزانەکان.



# دوو بروسکە لە نێوان
# کاك نەوشیروان و کاك مولازم عومەردا

چەند رۆژێك بەر لەدەستپێکردنی هێرشەکان، کاك نەوشیروان مستەفا داوای لە رێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان کرد کە سەردانی بکەن. ئەوەبوو شەهید جەباری حاجی رەشید (هاوڕێ باوەڕ) کە بەرپرسی رێکخراوی سلێمانی کۆمەڵە بوو لەگەڵ کاك عەبدولعەزیز عومەر (هاوڕێ بەرانان) ئەندامی رێکخراو، شەهید رزگاری مامۆستا محەمەد (هاوڕێ پاوەن) ئەندامی کەرتی شەهید ئارام هاتن بۆ بەرگەڵو، دو شەو مانەوە. لەوێ بەرنامەی ئەوەیان دانا کە سەرکردایەتی ناوخۆ دروستبکەن تا لەحاڵەتی شەڕو پچڕانی پەیوەندی نێوان شاخ و شاردا، خۆیان سەرپەرشتی کاروباری رێکخراوەیی، سیاسی و پێشمەرگانەی ناوشار بکەن، دواتر هەرواشیانکرد هەر لەو سەرو بەندەدا جهیازێکی راکاڵی محەسەن لەرێی کاك مستەفای سەیدقادرەوە کە ئەوکات مەسئولی تەنزیمی کۆمەڵە بوو لە تیپی 63 جوتیاران کە بارەگاکەیان لە گوندی هەڵوەنە بوو، نێردرایەوە بۆ ناوشارو،بەداخەوەلەرێگەدا جیهازەکەو،هاوڕێ کەش گیران.هەرپێش دەستپێکردنی هێرشەکان کاك نەوشیروان ئەنجومەنی گوندەکانی دۆڵی جافایەتی بانگکرد بۆ بەرگەڵو و، ئاگاداریکردنەوە پێش دەستپێکردنی هێرشەکان، خۆیان سەرپشك بن لە چونیان بۆ ناو شارەکان، یان بەرەو ئێران و لەوێ چیان پێبکرێ بۆیان دەکەن. خۆشبەختانە پێش دەستپێکردنی شەڕ، خەڵکی ناوچەکە تەگبیری خۆیانکردو بەسەلامەتی ناوچەکەیان چۆڵکردو بەتەنها هێزی پێشمەرگە مایەوە. ئەوەبوو شەوی 22/21 ی مانگی شوباتی ساڵی 1988 یەکەم هێرشی سوپای بەعس بە پەلاماردانی کلکەی زنجیرەچیای پیرەمەگرون لەقوڵەسەوزو قوڵەپوشینەوە دەستی

پێکردو،شەوی 18/19ی مانگی مارتی 988 کۆتایی هات و، بەعس یەکەم بەیانی سەربازی بەناوی ئەنفالی یەك وداگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی و دۆڵی جافایەتی دەرکرد.

هێزەکانی پێشمەرگە کە ئەو 25 شەو و رۆژە لەشەڕی قارەمانەدا بوون، دواتربە بریاروبەشیوەیەکی مونەزەم بەرەوسنوری رۆژهەلاتی کوردستان پاشەکشەیانکردو، پەلەیان بوو کە بەزوویی بگەنەوە سنوری مەڵبەندەکانی یەك و سێ، هێزەکان بەهیلاکی و شەونخونی و شەکەتی بەشێکیان گەیشتنەوە سنوری مەڵبەندەکانی سێی هەولێر و یەکی گەرمیان. رژێم لە قۆناغی دوەمی ئەنفال دا پەلاماری ناوچەی قەرەداغ و شاخی زەردەی دا و، ناوچەکەی کۆنترۆڵکرد، هێشتا تازە بەرایی هێزەکانی مەڵبەندی یەك کە تازە گەیشتبوونەوە سنوری خۆیان و، دوری رێگەو بێ خەوی و بێ ئیسراحەتی و، خراپی باری دەرونی شەکەتی کردبوون، یەکسەر قۆناغی سێی ئەنفال بۆ سەر ناوچەی گەرمیان دەستی پێکردو، لەوێش رژێم پاش شەڕێکی سەخت توانی ناوچەی گەرمیان بەتەواوی کۆنترۆڵ بکا و، گەورەترین تاوانی ئەنفالی بەرامبەر خەڵکی سڤیل ئەنجام دا. هێزەکان لەجادە بەرەو ناوچەی ئاغجەلەرو تەقتەق و شوان و دەشتی کۆیە پەڕینەوە، دیسان رژێمی بەعس لە ژێرناوی پرۆسەی ئەنفالی چواردا ئەم ناوچەشی کۆنترۆڵکردو، لێرەش تاوانی جەنگ و جینۆسایدی بەرامبەر دانیشتوانەکەی ئەنجامدا و، هێزی پێشمەرگەی کوردستانیش شەری جوامێرانەیان کردو،باقی هێزەکان جگە لەچەند مەفرەزەیەکی بچوك کە لە ناوچەی چەمی رێزان مانەوە، بەشی زۆری بەرەو سنوری مەڵبەندی سێ بەدەم شەڕەوە پاشەکشەیانکرد. سوپای داگیرکەری بەعس یەك لەدوای یەك قۆناغەکانی ئەنفالی پێنج و شەش و حەوتی لە تەواوی سنوری مەڵبەندی سێ دا. جێ بەجێکرد. سوپای ئیحتلالی بەعس لەهەمو پرۆسەکانی ئەنفالدا، سەدان تەن

گازی کیمیایی وهەزاران تۆن گولەتۆپ وبۆمبی فڕۆکەی بەرامبەر خەڵك،پێشمەرگە، زیندەوەر و ژینگە بەکارهێناو، شەڕی سوتماککردنی خاك وجینۆسایدی دژ بەگەلی کوردستان پیادەکرد.

## ئاڵوگۆڕکردنی بروسکەکان:

هیشتا هێرش و پەلامارەکانی سوپا دڕندەکەی بەعس نەگەیشتبووە دەوروبەری مەڵبەندی سێ، کاك مولازم عومەر عەبدوڵا کە بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، لەگەڵ کاك کۆسرەت رەسول کە بەرپرسی مەڵبەندی سێ بوو، لەدوای پرۆسەی ئەنفالی یەك گەڕابوونەوە بۆ مەڵبەندی سێ ی هەولێر لەوێ سەرپەرشتی هێزەکانیان دەکرد.

کاك نەوشیروان لە کۆتایی مانگی حەوت دا لە سەر دوندی قەندیل، رێك لە پشتی گۆمی کرمەسوران کە دەیڕوانی بەسەر ناوچەی باڵەکایەتی و دۆڵی خانەقا و بۆڵێ دا، لەوێ خێوەتەکانمان هەڵدا جێگیربوو. من عەدەد جیهازی کاك نەوشیروان بووم، جیهازەکەمان لە خێوەتێکدا (وەك لە وێنەکەدا دیارە) جێگیرکرد. رۆژانە لەهەمو بەرەکانی شەڕەوە دەنگوباسەکانمان وەردەگرت. ئەو رۆژەی کە ئیعلانی وەستانی شەڕی نێوان ئێراذ عیراق (988.8.8) کرا، هەمان رۆژ چەند فڕۆکەیەکی جەنگی ئێران زۆر بە نزمی بەسەرماندا فڕین و، هێرشیان کردە سەر بارەگاکاکانی سەرکردایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە بۆڵێ، ئێمە بەچاو دوکەڵ و تەپوتۆزی بۆمبارانەکەمان دەبینی. بەداخەوە شەهید و برینداریان هەبوو. بەدروستی رۆژی وەرگرتنی بروسکەکەم لەیاد نیە. بەڵام هێرشەکانی بەعس نەگەیشتبووە دەوروبەری مەڵبەندێ سێ. کاك مولازم عومەر بەناوی خۆی و کاك کۆسرەت و کاك حەسەن کوێستانیەوە، بروسکەیەکی نارد بۆ کاك نەوشیروان، من بروسکەکەم لە کاك نەوزاد و کاك ئامانج وەرگرت، بۆ ئەو برادەرانەی کە عەدەد جیهاز بوون دەزانن، زۆرجار عەدەدجیهازەکان کە بروسکەکانمان ئەدا بەیەکتر، دەمانوت بنوسە (لە برادەرەکەی منەوە، بۆ برادەرەکەی خۆت)، کاك نەوزاد و کاك

ئامانج یش وایان بە من وت. دەقی بروسکەکەم لەبەرو لەبەردەست نیە، بەڵام ئەمە ناوەرۆکی بروسکەکەیە:

لە / کاك مولازم عومەرەوە

بۆ/ کاك نەوشیروان

ئێمە ئێستە لە مەڵبەندین لەگەڵ برادەران، رژێم زۆربەی ناوچەکانی گرتوەو، هێرشەکان بەرەو لای ئێمەیە. ئێمە ئێستە هێزێکی باشمان لەبەردەست دایە، هەم ئامادەییمان تیایە. هەم دەتوانین پەلاماری شاری هەولێر بدەین وبیگرین، پێمان خۆشەهەمومان لەوێ بکوژرێین،چونکە نامانەوێ نە تەسلیم بین،نەئاشبەتاڵ بکەین.

بروسکەکەم برد بۆ کاك نەوشیروان، دوای خوێندنەوە، وەڵامی دانەوە، وەك ئاماژەم پێدا دەقی بروسکەکەم لەبەرو، لەبەردەست نیە،بەڵام ئەمە ناوەرۆکی بروسکەکەیە:

لە/ کاك نەوشیروانەوە

بۆ/ کاك مولازم عومەر

سلاوم بۆ خۆت و برادەران. هەڵوێستی ئازایانەی ئێوەو فەرماندەو پێشمەرگەکان بەرز دەنرخێنم. بەڵام لەم هەلومەرجە سەخت و ناخۆشەدا، کە رژێم لەروی سەربازییەوە باڵادەستە و، لە حاڵەتی هێرشی بەربڵاودایە و زۆربەی ناوچەکانی گرتوە، ئەرکی ئێمە بە پلەی یەکەم پاراستنی هێزەکانی پێشمەرگەیە، بۆیە داواتان لێ دەکەم بە پەلە تەگبیری کشانەوە بۆ لای ئێمە بکەن، رێگاکانی کشانەوە پێش ئەوەی رژێم لێتانبگری تەئمین بکەن. کاك فەرەیدون عەبدولقادرو مامۆستا عەبدوڵا عومەر دەنێرم بۆ لاتان تا بیروڕای ئێمەتان باشتر بۆ رونبکەنەوە. ئێستە کاتی خۆپاراستن و، پارێزگاریکردنی هێزەکانمانە، دواتر بەرنامەی خۆ رێکخستنەوە بۆ هەلومەرجی نوی تاوتوێ دەکەین.

کاك فەرەیدون و مامۆستا عەبدوڵا بەرێکەوتن بۆ مەڵبەندی سێ و، لەوێ مانەوە لەگەڵ برادەران پێکەوە کشانەوە.ئەوەبوو هێزەکانی مەڵبەندی سێ و، ئەو پێشمەرگانەی کە لەناوچەکانی تری ئەنفالەکانەوە بۆ ئەو سنورە کشابوونەوە، پاشەکشەیەکی مونەزەمیان کرد، گەرچی لە کاتی کشانەوەدا توشی شەڕی قورس بوون و، قوربانی گەورەشیاندا، چونکە رژێم دەیوسیت پشتیان لێبگرێ و رێگاکانی

پەڕینەوە لە دۆڵی خانەقا و باڵەکایەتی بۆ بەری قەندیل کۆنترۆڵ بکات. بەشەڕی دەستەویەخەو، ئازایەتی پێشمەرگە قارەمانەکان لێیان سەندرایەوەو، هێزەکان بۆ بەری قەندیل پەڕینەوە.جێگەی ئاماژە پێدانە، لەناوچەی دەشتی هەولێرو سنوری هەردو مەڵبەندی سێ وچوار، چەندین فەرماندەو مەفرەزەی بچوك بچوکی پارتیزانی لەوێ مانەوە، لەوانە شەهیدان حەسەن کویستانی، شەهید رێباز، شەهید هاشم شەمامکی، شەهید تەحسین کاوانی، شەهید سەلاح دیلمانی ...

دواتر بۆ پشودان ئەوانیش ئاڵوگۆڕیان پێکراو، پەڕینەوە بۆ بەری قەندیل و سنوری رۆژهەلاتی کوردستان. ئەو بروسکەیە لەو روەوە مێژوییە، چونکە گێڕانەوەی روداوێکە کە فەرماندەو پێشمەرگەکانی لە سەختترین کاتدا ئامادەی مردنی بەکۆمەڵ بوون، لەهەمانکاتدا دوربینی سەرکردەکانی هێزێك پیشان ئەدا لە تەمتومانی شکستدا،ئەوان بیریان لای خۆرێکخستنەوەوهەستانەوەوگەرمکردنەوەی سەنگەرەکانی بەرگری بووە. نەك چۆك دادان و تەسلیم بوون و ئاشبەتاڵ. ئەوەی سەرەوە مشتێکی ترە لە مێژوی زێڕینی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان، کە سەرەنجام شکستی ئەنفالی بە راپەڕین گۆڕی. سڵاو بۆ ئەو پێشمەرگە شەهیدانەی کە لەوپێناوەدا گیانی پیرۆزی خۆیان نەزری نیشتمانکرد،سڵاو لەو تێکۆشەرو رێکخستنە دێرینانەی لەناو زیندانەکانی بەعسی فاشی دا، وانەی کەم ژیان و کەڵ ژیانیان فێرکردین. سڵاو لەو پێشمەرگانەی ئەوێ رۆژێ شەڕیان لەگەڵ مەرگ، بۆ ئازادی کوردستان دەکرد و لەو پێناوەدا، کەم ئەندام بوون، یان ئێستە بە سکێ تێرو بەدو برسین.. نەفرەت لەهەمو ئەوانەی تاوانەکانی بەعسیان لەبیر دەچێتەوەو، بەعسیانە بیردەکەنەوەو، بەعسیانەش رەفتاردەکەن. ئێستا لە هەرکاتیکیتر زیاتر پێویستیمان بە ئیلهام وەرگرتن لەو رۆحیەتی پێشمەرگانەی جاران و نکران زاتیەی جارانە لە پێناوی ئازادی و دابینکردنی دادپەروەری کۆمەلایەتی و سەروەرکردنی یاسا و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەلانی خەڵکی کوردستان.

---

* سەرچاوە : خالید رەزا



# پارتیزانەکان
# لە بیرەوەری خالید رەزا دا

**لەخەباتی ئاشکرای شاخەوە بۆ خەباتی نهێنی ناو شار!**

بەیادی هەردووشەهیدی ئەمروکەڵمل شەهید غەریب هەڵەدنی و،شەهیدئاکۆ سورکەرکوکی. نزیك بونەوەی یادی راپەرین و، ئەم وینەیە ،هۆی نوسینی ئەم چەند دیرەن!کاتیك صدام و بەعس لە2ئابی1990 دا،ولاتی کوەیتی داگیرکرد ،بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکیتی نیشتمانی کوردستان لە قاسمەرەش بو. لەگەل بلاوبونەوەی هەواڵەکە وسەرلەبەیانی هەمان رۆژ کاك نەوشیروان ئەو نەخشە سەربازیانەی کەلەکاتی ئەنفالەکاندا گیرابو،لەژورەکەی خۆی رای خستبوسەیری دەکردن،وەك بلێی ئەمەدەرفەتە زیرینەکەی کوردە، دەبیت کاریك بکەین!

داگیرکردنی کوەیت سەرەتای نەخشەریژی بو بۆ راپەرینەکەو، لە قاسمەرەشەوە رەنگ ریژ دەکرا .!پیش روداوی داگیرکردنی کوەیت و، دوای ئەنفالەکان دیسان لە قاسمەرەشەوە،لە لای سکرتیری کۆمەڵەوە،پایە ستراتیژیەکانی خەبات داریژرانەوە. ئیرە شوینی تەفاسیل نیە ئەگینا هیندە دۆکۆمینتم لەبەردەستە کە بەشی نامیلکەیەکی قەبارە گەورە دەکات !

کاتیك صدام کوەیتی داگیرکرد،رەتلەپارتیزانەکانی گەرمیان، چەمچەماڵ، کەرکوك ، دۆڵی جافایەتی، شارباژیر، دەشتی هەولیر بەژمارەی بجوك و بە نەوعیەتی زۆر باش لە ناوجەکانی خۆیاندا بارگەو بنەیان خستبو، لەگەڵ ریکخستەکانی ناوشار پەیوەندی توندوتۆلیان هەبو.!

روداوەکان زۆرن و،فەیس بوکیش بەشی هەموو ئەمانە ناکات .

بۆیە بەناچاری کورتەیەك لەسەر وینەکە دەنوسم !

بەندە نوسەری ئەم جەند دیرە لەسەرداوای ریکخراوی سلیمانی و،بە بریاری سکرتیرو ناوەندی کۆمەڵە ، لەگەڕمەی ئەم روداوانەدا ، دەبو بگەمە سلیمانی.

. رۆژیك كاك نەوشیراون كاك غەریب هەلەدنی بانگ کرد بۆسەرکردایەتی، داوای لیکرد کە بەندە(خالید رەزا)ش لەگەڵ خۆیان بەرن بۆ رەتڵی سورداش و، لەویوە چاوساغی بکەن تا دەگاتەوە ناوشار...هەر ئەورۆژە کاك غەریب هات پیی وتم کەلەم هەفتەیە خۆت ئامادە بکەو. کەهاتمەوە بەشوینتا یەکسەر ئەرۆین...

رۆژی 1990.9.21 کاك غەریب هەڵەدنیٚ وکاك عوسمان گیچینەیی هاتن و، وتیان برۆ بابرۆین،لەویٚ خوا حافیزیم لەهاوریکانم کرد، بەلام پیم نەوتن کە دەچمەوە بۆ ناوشار وتم،دەچم بۆ رەتڵی سورداش،یادی بەخیر کاك غەریب سەعید بەپیکەنینەوە پیی وتم، ئاگات لەخۆت بیت لوغمێکت پیا نە تەقیتەوە،مەگەر لەو چۆلەوانیە داقاچی(بزن)یکت بۆ دابنێن .

. لە هەرزنەوە پەرینەوەو، بەجۆلەوانیدا هاتین، کۆلەپشتەکانمان پرکردبو لە خواردن ومعلباتی سەبزی و.خورما و..کردەیی و شارەزایی و ئازایەتی شەهید غەریب بەجۆریك بو مەگەر لە فیلم دا بینیبیتم...

لە هاتنما ندا دەبوو بە(هەڵەدن)دا تێپەرینایە،لە گەروەکەی هەلەدن دا فەوجیك سەربازی صدام هەبو.کاك غەریب کاتی نان خواردنی دەزانین ،هەرسیانمان بە هەستەوە دەرۆیشتین.... کاك غەریب لەپیشەوە بوو،بەسەد مەتریك لەدوری سەربازەکان وەستیاین وتی.ئەگەر بەشاخەدا هەلگەرین و بەردیك لەژیر پیماندا دەربچیٚ وخلۆر ببیتەوە،رەبایەکان بەدۆشکەو بیکەیسی دامان ئەبیژن، بۆیە دەبێت لیرە بوەستین هەتا دەست بە(قزعە) خواردن دەکەن وسەرکانی و چەمەکە بەرئەدەن ، لەو کاتەدا فرسەت دێنین و. دەپەرینەوە. هەرسیانمان چەکەکانمان سوارکردو بەدوای كاك غەریب دا کە گوێمان لە دەنگی قاپ وکەوچکەنیان بوو ، بەسەلامەتی تێپەرین، کە 500 سەد مەتریك دور کەوتینەوە، وتی ها خۆ نەترسایت، وتم بەری وەلا زۆر ترسام ... ئینجا وتی هەرلیرەدا و لەناو ئەم رەزانەدا، لەنزیك ئەمان سەرخەویك دەشکێنین، چونکە ئەگەر تەمشیت (کیوماڵ) بکریت ، نایەن بۆ نزیکی فەوج ورەبایەکان!!دوای سەرخەوێك هەستاین ورێمان گرتەبەر،بەرەو پیرەمەگرون ..

کە لەشاخی ژیلوان بوین، چەند (بزن)یك مان بینی کە هی گوندەکان بون، لەدوای ئەنفالەکان، کێوی بوبون... کەئێمەیان بینی رایان دەکرد... لەویا قسەکەی کاك غەریب سەعیدم بیرکەوتەوە، وتم قاچی بزنیشمان دەست ناکەوێ...

. بەرەبەیان بو لەژیلوانەوە سەیری دۆلەکەمان دەکرد شەهید غەریب وتی ئەمشەو عەسکەر کێومالّیان کردوە،وتم چۆن دەزانی وتی سەرمایان بوە،ئەها ئەو دوکەلانەی دوای ئاگرەکانیان دەبینی...!!

بۆیە دەبێت بەوریایی برۆین و،نەوەك لەگەرانەوەیاندا توشیان ببین...

لەکاتی پەرینەوەمان لە جادە خاکیەکە ، واز یکی عەسکەری ئەوەی پێیان دەوت جێب قیادە نزیکمان بوەوە،بەهۆی چری داربەروەکانەوە نەیان بینین و بەسەلامەتی دەربازمان بو..بەپیرەمەگروندا هەلّگەراین بەرەومقەری رەتلّی سورداش لە(کانی بی) چیای پیرەمەگرون

کە گەیشتینە سەرەوە سەرمامان بو، کاك غەریب چەند فیشەکیکی تەقاند وتی ئیستە برادەران دێن بە پیرمانەوە...ئەوە بوو کاك ئاکۆ سور و،کاك خالیدی کاروباری کۆمەلاّیەتی و برادەریکی تر هاتن و، کە پێك گەیشتین ئەوەندەی بلّیی یەك و دوو شەهید غەریب ئاگرەکەی کردەوەو، خۆمان گەرمکردەوە.کە چوینە بارەگای رەتلّی سورداش لەوێ کاك سەرکەوتی هاوریم ، سەرکەوتی عەینەك کە پێش من بەچەند مانگێك لەگەلّ رەتلّی سورداش هاتبو، یەکتریمان بینیەوە. ماوەیەك لەگەلّیاندابوم هەتا، پەیوەندیەکانم لەگەلّ رێکخراوی سلیمانی دروستکرد.

لە پیرەمەگرون بویز نامەیەکی ریکخراوی سلیمانی م پێگەیشت کە هەوالّی گرتنی کاك مستەفای سەید قادر(هاورێ عەزیز)یان بۆ نوسیبوم (کە ئێستا کاك مستەفا وەزیری پێشمەرگەی هەرێمە)، دەست بەجێ بروسکەیەکم بۆ کاك نەوشیروان بە جفرە و مجفرە لەرێی کاك سەرکەوتەوە نارد و، هەوالّی گرتنی کاك مستەفام پیگەیاند و، بۆم نوسی من لەنزیکترین کاتدا دەگەمە ناوشار بۆلای هاورێیان.

شەوی6/5ی مانگی10ی سالّی 1990 هاورێ غەریب هەلەدنی و، هاورێ ئاکۆسورکەرکوکی من یان گەیاندە ناو ئۆردوگای پیرەمەگرون بۆمالّی هاورێی کۆمەلّە مام رەسولّ و. ئەوان گەرانەوە بۆ پیرەمەگرون و، منیش بەچاوساغی مام

رەسولٚ ی تیکۆشەر بە جێبێك بەرەو سلیمانی بەڕێکەوتم . گەیشتمە سلێمانی دنیا روناك بوو، بۆیە بەناچاری چوم بۆماڵی پورم بۆ ئەوەی کاك ئاکۆ محمەد وەهبی ببینم. لەدەرگامدا ماڵی پورم لەسەربان نوستبون، کە سەیریانکرد منم و لەبەردەگام، زۆریان لاسەیربو، بەپەلە هاتن و دەرگایان لێکردمەوەو، وتیان ئەوە چۆنە هاتویتەوە، منیش بۆ ئەوەی ئاساییان بکەمەوە، وتم مەفرەزەیەکین هاتوینەتە ناوشار و، رۆژمان لی بوەوەو، نەماتوانی دەرچین بۆیە چەکەکانمان شاردۆتەوەو، ئەم شەو یەك دەگرینەوەو، دەگەرینەوە. من دەمویست کاك ئاکۆ ببینم ، چونکە کاك ئاکۆ لەدوای گرتنی هاورِیٚ جەباری حاجی رەشیدو هاورِێکانی ، ئەم سەرپەرشتی ریکخراوی سلێمانی و کوردستانی دەکرد، وتیان ئاکۆ لەماڵەوە ناخەویٚ لە خۆی ئەترسیٚ، بەناچاری تا ئێوارە لەماڵی پورم واتە ماڵی باوکی کاك ئاکۆ وەهبی چاوەڕێم کرد ، تا شەوهات و . پێکەوە رۆشتین و، بردمی تەسلیمی هاوریٚ مورادی کردم لەماڵی خۆیان، بەندە بۆماوەی نزیکەی شەش مانگ بە ئیختفا لەناوشار ماوەو، لەگەڵ هاورِێکانم لە رێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەو، بە هەماهەنگی لەگەڵ رەتڵەکانی پارتیزانەکان،ئامادەکاریمان بۆراپەرین کردو،شەرەفی راپەراندن وسەرپەرشتیکردنی شانەچەکدارەکانی شالاٚ و، رێکخستم پیٚ برا. لەرۆژی هاتنە ناوشار هەتا 1991/3/7 رۆژی راپەرینی سلێمانی،لەماڵی هاورِێی هەمیشە لەیادو جوانەمەرگم کاك حەمنوری مام ئەحمەد(هاوری موراد) لەگەرەکی (دورالامن) مامەوە ،کە هاوریٚ مراد ئەندامی ریکخراوی سلێمانی کۆمەڵەو، سەرپەرشتیاری سوپای رزگاری کوردستان (سرك )ی دەکرد.ئەوەی زۆرتر ئازارم ئەدات ئەوەیە، کە ئەم شەهیدە سەربەرازنە بەعس وسپای داگیرکەر نەیتوانی زەفەریان پیٚ ببات، ئەفسوس شەرِی نەگریسی ناوخۆ زەفەری پی بردن !!

نەمری بۆشەهیدان غەریب هەلەدنی وئاکۆسور و، هاورِیٚ مورادوتێکرای شەهیدانی رێگای ئازادی و رزگاری

*See moreat:

http://www.knnc.net/Drejey.wtar.aspx?Articleid=3241&AuthorID=1363#sthash.YoNW54XP.dpuf



## پارتیزانی و کۆڵنەدان.. پێش ساڵی ١٩٩١

**کاتی ئامادەکاری و خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین..ئەشکەوتی بارەگای سەرەکی پارتیزانەکانی گەرمیان (بارەگای شەهید حەمەرەش) لەزنجیرە چیای سەگەرمە پشتی گوندی قەڵای تەپە گەروس..**

**لای ڕاستەوە، ئاوات شێخ جناب، لوقمان چاوڕەش،**

**هەڤاڵ مامۆستا جلال شێخ کریم، جلال شەممەیی..**



**ئەم شوێنە ناوچەی قەرەداخ نزیک گوندی کانی ڕۆشنایی و هەرگێنەیە، مانگی 1 سالی 1991واتە دو مانگ پێش ڕاپەڕین ئەم ئەشکەوتە ناونرا بارەگای مریشکەکە ،چونکە لەم ڕۆژەدا شەهید شێخ کریم لەتەینالەوە ئەو مریشکەی بۆ هاوردبووین .کردمان بەو جەژنەی ئەم رەسمەمان تیدا گرت بەدەوری دا دانیشتوین 7 پیشمەرگە**

* مامۆستا جەلال شێخ کریم Facebook Jalal Karim



ناوەکان لەراستی بینەرەوە :

شەهید (ئاکۆسور) کەرکوکی فەرماندەی رەتڵی کەرکوك،

شەهید (غەریب هەڵەدنی) فەرماندەی رەتڵی سورداش،

خالید رەزا، ناوەکەی نەزانراوە،

خالیدی کاروباری کۆمەلایەتی.

وێنەگر: کاك عوسمان گێچینەیی

# محسن علی خان

# مامۆستا سۆران



باس لەجوامێری یەکێك لەهاوکاری پێشمەرگە و پارتیزانەکان دەکات:

## مامە حەمەی قادر و بیرەوەریەك ...

محمدقادر(مامەحەمە)باوکی شەهیدعەتاومام وخەزووری هەریەك لەڕەحمەتی مەلائەحمەدی دەلوجەیی ، و کاك عقید جەزا بوو .پیاوێك بوو سەراپا پاکی و ڕێز و گورج وگۆڵی و خزمەت بە بەگەل ونیشتمان . بە درێژایی ساڵانی هەشتاکان هاتوچۆی ناوچەی قەرەداخی ئەکرد بۆ سەردانی مەلا ئەحمەد و خزمان. منیش بە هۆی و هاوڕێتی و دراوسێتیم لەگەڵ ماڵی مەلا ئەحمەد دا مامە حەمەم دەناسی . مامە حەمە وکاك جەزا هەمیشە لە خۆشی و ناخۆشیدا بەشوێنمانەوە بوون و ئەهاتن بۆ سەردان و هەواڵپرسین ، تەنانەت لە گەرمەی شەڕو ئەنفالەکانیش دا.هەر لەقەرەداخەوە بۆ دەشتی کۆیە و خۆشناوەتی و قەندیل و سەر سنورەکانی ئێران ..

پاش ئەوەی ناوچەی قەرەداخ بە کیمیاوی وێرانکرا و سەدان شەهید و برینداری لێکەوتەوە وحکومەتی دڕندەی سەدام لەچوارلاوە هێرشی بۆ کردین، ئێمەش بەدەس ماڵ ومناڵەوە تووش بوبووین،نەماندەزانی بچینە بەرەکانی شەڕ. یان ماڵ و مناڵمان ڕزگار بکەین. بۆ شەوی دوەمی هێرشەکە کاتێکمان زانی مامەحەمە و کاك جەزا شێرانە پەیدا بون، و بەناو هێزەکانی دوژمندا و بە چەندین سەعات پیادەڕۆیی توانیبویان بگەنە گوندی (نەوتی).

من وشێخ ئەحمەد سالحی کۆمەڵایەتی لە ترسی کیمیاوی مناڵەکانمان دەبردە شاخی دەلوجەوشەوان ئەهاتینەوە ئاوایی شێخ مستەفا، کە زۆر دڵسۆزانە خزمەتیان دەکردین.هەڵبەتە هەموشمان شەوی پێشووتر لە گوندی دوکاندا کیمیاوی لێی دابووین و شەلوکوێری کردبوین ..



کاک مەلائەحمەد هەواڵی بۆ ناردین کە وا مامەحەمە و کاک جەزا هاتوون و با هەوڵبدەین منداڵەکان رزگار بکەین ئێمەش بەو شەوە هەریەکەو و منداڵێکمان بەستەکۆڵ خۆمان و بە نارەحەتی گەیشتینە گوندی (نەوتی) چونکە چاومان باش نەیدەبینی..درەنگانێ گەیشتینە ئەوێ ، لەوێشەوە بە رێکەوتین بەشاخی بەرانان و میریاسیدا کەزۆر بە ئەستەم و نارەحەت بوو.چووین بەرەو گوندی وێلەکە . بە درێژایی رێگاکە مامەحەمەوکاک جەزا منداڵەکانیان بە قەڵودۆشکان لەگەڵدا هەڵدەگرتین ویارمەتییان ئەدادین.پەیتا پەیتا خەڵکی ناوچەکەشمان لەو رێگایەدا دەبینی کە لە کیمیاوی هەڵهاتبون وبوین بە کاروانێکی دوور و درێژ . بۆ سەعات چواری بەیانی گەیشتینە گوندی وێلەکە و چیتر نەمانتوانی پێشبکەوین چونکە هێزەکانی دوژمن ئەوناوەیان تەنیبووەوە..

ئەوان منداڵەکانیان لێ وەرگرتین و لەگەڵ خۆیان و بۆ ماڵی خۆیان بردیانن و رزگاریان کردن وئێمەش گەڕاینەوە بۆ بەرەکانی شەڕ دژی درەندەکانی بەعس. هەتا ماوم نەئازار و مەینەتی ئەوشەوەو نە پیاوەتی و ئازایەتی و شەهامەتی مامەحەمە و کاک جەزام لە بیر دەچێتەوە

ڕووحی مامەحەمە شاد و تەمەندرێژیش بۆ کاک جەزا ...

# بەشی سێیەم



## پارتیزانەکانی شارباژێڕ



**بیرەوەری پێشمەرگەی دێرین و**

**پارتیزانی دوای ئەنفال**

**ئازاد حاجی سەعید سەراوی**

# خۆڕێکخستنەوە

لەدوای ئەنفال ودوای کشانەوەی هێزی پێشمەرگەبۆ سنورەکان، هێزی پێشمەرگەو سەرکردایەتی یەکێتی سەرقاڵی خۆسازدانەوەبوون بۆخۆڕێکخستنەوە تا بگەڕێنەوە ناوچەکان،لەهەولێر و پیرەمەگرون وگەرمیان ،هێزەکان گەڕانەوە ناوچە سوتماك و وێرانەکان و درێژەیان بەخەباتی پارتیزانەکانی دا..

تیپی ٣٧ ی شارباژێڕیش لە بلەکێ کۆبوونەوەیەکیان پێکرا،زۆری پێنەچوو گەڕانەوە ناوچەی شارباژێڕ ولەنزیك گوندی(سەراو)بارەگایان دانا،ڕۆژانە جەولەی ناوچەکەیان دەکردودواتردەگەڕانەوەبارەگاکەمان،پارتیزانەکانی شارباژێڕ بەچەند مەفرەزەیەك دەچنە خوارەوە،مەفرەزەی :

دەستەی یەکەم بە سەر پەرشتی(وەستا فاروق)بۆ ئیستتلاع ،کاك گۆران سەراوی و عادل سەراوی و شەهید حمە دێگەڵی لەگەڵی دەبن..

دەستەی دووەم بە سەرپەرشتی کاك (خاڵە سەراوی) دەبێت، خالق ماوەتی و تەهاماوەتی وسردارشارەزوری وشەهید ڕەحمان شاناخسێیی لەگەڵدادەبن...

دەستەی سێیەم بەسەرپەرشتی( سەیدئەحمەد)دەبێت، کەپێشتر سەرپەرشتیاری تیپ بوو،خالید گەلاڵەیی،تەها ماوەتی،لەتیف مام علی سەراوی، ئازادحاجی سعید سەراوی لەگەڵدادەبن...بۆدۆست ودوژمنانی دەسەلمێنن کە شۆڕش درێژەی هەیە.

پێشمەرگەکانی تیپی71بەتالیۆنی حەوتی سلێمانیش لەچەند قۆناغێکدا لە بارەگاکانی خۆیانەوەبە شێوەی پارتیزانی بەرەو ناوچەکانی (شارباژێڕی سەخت)و (شارباژێڕی تەخت) شۆڕبوونەوە، چەندین جارچالاکییان ئەنجام دا..

چەندجارێکیش خۆیان گەیاندەوە ناوشاری سلێمانی ولەو پێناوەیشدا ڕووبەڕووی چەندین مەترسی بوونەوە..

## لیستی ناوی
## چەند پارتیزانێکی سلێمانی و شاربازێر :

لەدوای قۆنەغەکانی ئەنفال پێشمەرگەکانی تیپی71بەتالیۆنی حەوتی سلێمانیش لەچەند قۆناغێکدا لەبارەگاکانی خۆبانەوە لەسنووری ئێرانەوە بەشێوەی پارتیزانی دەچنەوە(شاربازێری سەخت)و(شاربازێری تەخت)چەندین چالاکی ئەنجام دەدەن. چەندجارێکیش خۆیان دەگەیەننەوەشاری سلێمانی..

1 . ئەحمەد سەیدحەمەلاو مستەفا (سەیدئەحمەد اوەتی) فەرماندەی تیپ
2 . مەحموود عومەر (مولازم محمود) * ج . ف . ت
3 . فاروق عزیزقادر (وەستافاروق) فەرماندەی کەرت
4 . محمد علی مستەفا (حاجی سەراوی) * فەرماندەی کەرت
5 . کامەران علی امین ( مامۆستاکامەران) هەواڵگری
6 . گۆران بایزشەریف (گۆران سەراوی) فەرماندەی کەرت
7 . محمدرشید احمد (خاڵەسەراوی) فەرماندەی کەرت
8 . سەردار سعید حەبیب (سەردارەسوور) فەرماندەی کەرت
9 . محمد إسماعیل قادر(حمە ماوەتی) فەرماندەی کەرت
10 . عادل محمدمستەفا (عادل سەراوی) سەردەستە
11 . عوسمان علی إبراهیم (ئاپۆ) فەرماندەی کەرت
12 . نامیق تۆفیق سعید (نامیق نۆرکی) سەردەستە
13 . تەها مەعروف قادر (تەهاماوەتی) پ . م
14 . رەحمان رسول محمد * پ . م
15 . حسن عزیز عبدالرحمن (حسن ماوەتی) * پ . م
16 . محمد علی امین (حمە دێگەلی) * پ . م

17 . مجيد قادرعبدالله (مجيدماوەتی) * پ . م

18 . عبدالخالق على معروف (خال ماوەتی) پ . م

19 . میران احمد کریم پ . م

20 . تەحسین عبدالله سعید پ . م

21 . رزگارقادر عبدالله (رزگارەعەرەب) پ . م

22 . جمال عزيز رسول * پ . م

23 . عبدالرحمن عبدالله امین (رحمان گردگاشەیی) پ . م

24 . اسکەندەر محمد علی (اسکەندەرماوەتی) پ . م

25 . ئازاد سعيد عبدالله (ئازادسەراوی) پ . م

26 . کاوە علی قادر (کاوەسەراوی) * پ . م

27 . لەتیف علی رسول (لەتیف سەراوی) پ . م

28 . دکتۆر موحسین یاریدەدەری پزیشکی

29 . على سعيد حسن (مام علی) * پ . م

30 . انور مەلا عبدالله پ . م

31 . دەرویش عبدالله فەرەج (درویش بارەیی) پ . م

32 . انور احمد قادر (انورسیرەبی) پ . م

33 . رسول هەمزە (رسول ئاوەکورتێ) پ . م

34 . محمد حسن قادر (حمەقەلاچۆلانی) ف . م

35 . عزيز ئاوەکورتێ پ . م

36 . یاسین عبدالله سعید پ . م

37 . خليل غريب سعيد پ . م

38 . محمد علی محمد جوارتایی(حمەعلی پورەخاتون) پ . م

* ئەم ناوانە لەپێناو بەرگری لە دەسکەوتەکانی شۆرش گەیشتنە کاروانی سەروەری

# یادەوەریەکانی ڕۆژانی پێشمەرگایەتی

بەر لە پەلاماری عێراق بۆ سەر کویت سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەشێوەیەکی زۆرباش خەریکی تەشکیلات و گۆڕانکاری لەهێزی پێشمەرگەدا بوو، خەریکی ئامادە کردنی مەفرە پارتیزانەکان بوو،دەورەلەسەر دەورە دەکرایەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ پێشمەرگە بەشداری لەو دەورانەدا دەکرد.. دەورەکان چەند مانگێکی دەخایاند، لەسەروبەندی گۆڕانکاری و دروستکردنی مەفرەزە پارتیزانەکان و خۆئامادەکردنی یەکێتیدا بەبڕیاریی سەدام لە ڕۆژی ٢/٨/١٩٩٠ لەشکری عێراق لە ماوەی ٢٤سەعاتدا کوێتیان داگر کرد.داگیرکردنی وولاتی کوێت لەلایەن عێراقەوە ، ڕژێمەکەی خستە گەورەترین هەڵەو سەرپێچی نێودەوڵەتی،کە چاوەڕوان نەدەکرابە ئاسانی لێی دەرباز بێت، داگیرکاریەکەی حوکمەتی عێراق ٧٠٪ لەشکرو سوپاکەی لەکوردستان کێشایەوەو بەرەو کوێتی بردو بەشێکی کەمی هێشتەوە،ئەم هەڵە گەورەوکوشندەیەی حوکمەتی عێراق، بووە باشترین هەل، بۆخەڵکی کوردستان و شۆڕشەکەی. بۆ ناردنەخوارەوەی پتری پارتیزانەکان..

لەم هەلومەرجەدا سەرکاردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دەستی کرد بە ناردنەخوارەوەی زیاتری مەفرەزەوپارتیزانەئامادەکراوەکان بۆناوچەجۆڵکراوەکانی کوردستان،تاببنە پردی پەیوەندی خەڵکی ئوردوگاو شارەکان و سەرکردایەتی، تاببنە داینەمۆی چۆشدانەوەی خەڵکە دیلکراوەکەی کوردستان. بۆ ئەم مەبەستە زوربەی زۆری ناوچەکان مەفرەزەی پارتیزانی شارەزای بۆ ڕەوانەکرا .

لەڕۆژی ١٣/٨/١٩٩٠ سێ مەفرەزەی پارتیزان بەسەرپەرشتی کاك سەرکەوتی کوببە لەژێر چاودێری سەرکردایەتی بەڕێ دەکرێن بەرەو ناوچەی شارباژێر لەدەوروبەری شاخی(لەرێ) و گووندی (دێگەلە) جێگیر دەبن.. تاڕاپەڕینەکە لەوێ دەمێننەوە

## بردنی مەقەر بۆ گوندی پاشبەرد .

لە دوای گرتنی کوێتەوە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە هیوای ڕزگاری خەڵکی کوردستان لەئاسۆدا دەبینرا، دوای ئەم ڕوداوە سەرکردایەتی یەکێتی کەوتە چموچوڵ و کۆبوونەوەو خۆئامادەکردن بۆ هەموو ئەگەرەکان ، بەتالوێنی٧ بەهامان شێوە چەند کۆبوونەوەیەك ئەنجام دەدات،ڕۆژی١٩٩٠/٨/٢٠ لەگووندی بلەکێ لەکۆبوونەوەکەدا بڕیاردەدەن مەفرەزەیەکی پارتیزانەکانی تر ،بنێرنە ناوچەی شاربازێڕ. بۆ ئەو مەبەستە (شەهید زرار و کاك جمال ئەبووشۆرب) دەسنیشان دەکەن وبڕیاردەدەن کە مەقەرێکی نەبینراو(مەخفی)ببەنە ناوچەی زاخێ.

ڕۆژی١٩٩٠/٨/٢٤مەفرەزەکە بەسەرپەرشتی کاك جمال ئەبووشوارب دادەبەزنە خوارەوە لە زاخێ جێگیردەبن ..هەتا ڕاپەڕینی 1991 لەوێ دەمێننەوە، هەر ٢٠ڕۆژ جارێکیش گۆڕدراون ، لە هامان کۆبوونەوەدا دەستەیەك پێك دەهێنن بۆ پاڵپشتی و بۆ ڕەوانەکردنی ئازوقە بۆهەموو مەفرەزە پارتیزانەکان و مەقەڕەکەیان دەبەنە گووندی پاشبەرد لەدیووی گۆڵێ بۆ ئەوەی ئەو مەقەرە ببێتە بنکەی سەرەکی خزمەتگوزاری،بنکەی فریاکەوتن،گەیاندنی خۆراك بۆ هەموو مەفرەزە پارتیزانەکانی ناوچەی شاربازێڕ .

مامۆستا جمال دەستەکە ڕادەسپێرێ هەرجی زووە شەوێ بچنەوە بۆدیوی گۆڵی و بۆگووندی پاشبەرد،بەڕۆژ بگەڕێن شوێنێکی باش دەستنیشان بکەن تامەقەڕی کەرتەکەی لێدابنێن. ئێوارەیەك (جمال چاوشین) لەگەل چوارپێشمەرگە،هێمنە ڕەش،دوو پێشمەرگەی تر بەسەیارەکەی بەتالوێن دەچنە گوندی (کەنەسورە) لەوێشەوە شەو بەدزی سەیتەرەی پاسدارەکانەوە دەچنە گوندی پاشبەر دوڕۆژەکەی بۆ ڕۆژدوایی شوێنێکی پەناو باش دەستنیشان دەکەن. شەوی دوایی

دەگەڕێنەوە و لەگەڵ مامۆستا جمال کاك ئازاد دەرەمیانەیی و شێخ کامیل و شەهید زورار دادەنیشن تەگبیری بردنی خێمەیەك و ئەشیای مەقەڕەکە دەکەن ، وارێکدەکەون هەموو ئەشیاکان بەسەیارە بنێرنە گووندی کەنەسورە یان سارداو ، ئەوانیش بەشەو بەولاخ دوور لەچاوی پاسداران بیبەن بۆ گوندی پاشبەرد.. بەتالوێن بۆ ئەو مەبەستە چوار هێستری باشیان بۆدەکڕی...

کەرتەکە کە ٢٨ پێشمەرگە دەبن بە فەرماندەیی جەمال چاوشین و جێگر کەرت شەماڵ علی باپیر و فەرماندەی مەفرەزە جوتیار و هێمنە ڕەش . لەنێوان خۆیاندا ئیش و کارەکان دابەش دەکەن . ١٥پێشمەرگەی خۆیان حازردەکەن . کیسەخەو بەتانی،ئاردوو برنج و هەموو پێویستی مەقەڕیان دەپێچنەوەو بەچەند جارێك بەسەیارەکەی بەتالوێن دەیبەنە کەنەسورە . لە گوندی کەنەسورە لەپەنایەکدا ژووری ماڵێك بەکرێ دەگرن.. ئەشیاکانی لێدادەنێن .

لە شەوی ١٩٩٠/٨/٢٩ فەرماندەی کەرت و١٠ پێشمەرگە دەچنە گوندی کەنەسورە، چوار هێسترەکەی خۆیان و چوار هێستری تر لەگەڵ دوو پیاو بەکرێ دەگرن . خاوەن هێسترەکانیش باش شارەزای ڕێگەکە دەبن ،ئەوشەوە هەشت باری باش باردەکەن و چەکەکانیشیان دەخەنە ناوبارەکانەوە ،پاسدارەکان شتێ پارە لەوولاخارەکان وەك شیرینی وەردەگرن و ئیزنیان دەدەن و ئاودیوودەبن . هەرئەوشەوە دوای دەرباز بوون یەك یەك و دوو دوو خۆیان دەکەنە خاوەن بارێك و تێپەڕی و دیوی باشوری کوردستان دەبن.

بۆ ئەوەی شوێنی مەقەڕەکەیان کەشف نەبێت.کاتێ نزیك دەبنەوە لەشوێنی مەقەڕەکە کەدەستنیشانیان کردبوو ، دوو وولاخدارە مەدەنیەکە لە پەنایەکدا گل دەدەنەوە وحەرەس بەدیاریانەوە دادەنێن. خۆیان هێسترەکانی ئەوانیش دەبەن و بارەکانیان لێدادەگرن و هێسترەکانیان بۆدەگێڕنەوە.

بۆشەوی دوەم دوو پێشمەرگە دەنێرنەوە هەربەهێسترەكانی خۆیان چوار باری تر ئازوقە و ئەشیاوپێنچ پێشمەرگەی تریش لەگەڵ خۆیان دێنن.زۆر سەركەوتووانە بە دوو شەوو خۆیان و هەموو ئەشیای مەقەڕەكەیان دوور لەچاوی ئێرانییەكان دە بەنە گووندی پاشبەرد . بە دوو سێ ڕۆژ جێگە خێمەیەكی باش نیومەتر بەبەرد دیوار دەكەن وخێمەكەی تیدا هەڵدەدەن، شوێنی خێمەكەش لەنزیكی كانی و ئاوێك بەنەدیویی لەپاڵ بەبەرزاییەكەوە دەبێ. بەشێوەیەك كەنە لە سەربازگەی عێراقی و نە لە ڕەبیەكانی ئێرانیشەوە دیاربێت .

## گوندی پاشبەرد

گوندی پاشبەرد لەسەروی ڕۆژ هەلاتی سلێمانیە،لەپشتی گوندی (گۆڵێ)وەیە سەر بەشارۆچكەی پێنجوین و دراوسێی دێهاتەكای(گۆڵی، سیاگوێزە، شەپاڵ ، مێشەرۆ)یەوبەرانبەر شاخی تالێرە، پێنج كم لەڕەبیەكانی سەرسنوری دەوڵەتی ئێرانەوە دوورە ، لەبەر ئەوەی نزیكی سنوری دەستكردی ئێران و عێرقە . لەساڵی١٩٧٨ بەناوی 20 كم پشتێنەی ئەمنی بەرشالأوی ڕاگواستنی ڕژێمی بەعس كەوتبوو.ئەوكاتە هەموو ناوچەكە چۆڵ بوو،هەندێ شوێن سەربازگەی ڕژێمی عێراقی تێدا بوو ، وەكوو سەربازگەی ، گۆڵێ، مەخفەری گوندی سیاگوێز، بەدەوری چادەكەدا هەتاشارۆچكەی پێنچوێن ڕەبیەی تێدابوو،پشتی گوندی شەپاڵ رەبیەی سوپای عێراقی لێبوو،كەم كەمەبەشەو ولأخدارهاتووچۆیان دەكرد. دوای ئەوەی ئەمەریكاو نەتەوە یەكگرتووەكان لەتۆڵەی داگیركردنی كوێت گەمارۆ دەخەنە سەر عێراق ، بەهۆی گەماڕۆ و كەمبوونەوەی خۆراكەوە گرانی قاتوو قڕی لە عێراق و كوردستاندا دروست دەبێت ، بۆ كەمكردنەوەی كاریگەری حەسارەكە حوكمەتی عێراقی ڕێگە بەبازرگان و خەڵكە دەوڵەمندو پارەدارەكان دەدا وەرەقەی هاتوچۆیان بۆدروست دەكات ، كە لە ئێرانەوە خواردن و ئەشیا بهێنن، بۆ ئەم

مەبەستە چەندین مەرز لەسەر سنوری ئێران دەکرێنەوە،لە نزیك گوندی (گۆڵێ)یش مەرزێکی بازرگانی دکرێتەوە .جموجوڵی ولأغداری زۆرتر دەبێ،بەرەی کوردستانی بنکەی گومرگی دادەنێ . مەفرەزەیەکی سەر بەبەرەی کوردستانی کە پێکهاتبوون لە پێشمەرگەی هەمووحیزبەکانی بەرە ،خاڵە نەجم وەندەرێنەیی کە فەرماندەیەکی پارتی بوو سەرپەرشتی مەفرەزەکە دەکات ، کە پارێزگاریان لە مەقەڕی گومرك دەکرد. بازرگانەکان چەندین خێمە لەوناوە هەڵدەدەن.خانویەك بۆ چایخانەو خواردنگا دروست دەکرێ.دەبێتە مەرزێکی پڕ داهات. بەسەدان کەس هاتوچۆی پێدادەکەن، بەشەوو بە ولأغ هەموو جۆرە کالأیەك دەکەن ، بەتایبەتی خواردەمەنی وەك/ ئارد ، ڕۆن، شەکر، برنج ،هەموو جۆرە خواردەمەنیەك لە گوندی گۆڵێ وە بەئاشکرا بەئۆتۆمبیل دەگوازرایەوە بۆ شاری سلێمانی و شارەکانی تر .

شەوی واهەبوو٤٠٠ تا٥٠٠ بار کالأی ئێرانی دەگەیشتە پاشبەرد،لەوێ گومرگ دەکران،مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعی کاك(حمەڕەشید قرەداغی)بەرپرسیان دەبێ، هەر لەوێ بارەگا دادەنێن پارتییش لەبن شاخەکەدا مەقەڕێك دادەنێن و کاك شەریف سەعید(شەریفە کەچەڵ)سەرپەرشتی دەکات.بەداخەوە کاك شەریف لە سالی ١٩٩٤ لە شەڕی ناوخۆدا شەهیدبوو. ئەو بنکەو بارەگایانەی لەگوندی پاشبەرد دانرابوون دوور لەچاوی ئێرانەوە هاتبوون ، تەنها ١٠ کەسی برادەرانی پارتی لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوەو سوپای پێنچی پاسدارانی سەرسنور بەئاشکرا لەبەر ناسیاوی کاك شەریف ڕێگەی پێدابوون و بەلأم سوپا نەیان دەزانی پێشمەرگە لەوێ هەن..

## بەچەی بارزانی یان بەچەی شەریف .؟

ڕۆژێ کاك شەریف بەمیوانی دەچێتەلای هەڤالأنی یەکێتی، چەند کاتێ پێکەوە دادەنیشن. کاك شەریف فەرماندەیەکی دڵسۆزی پارتی وخەڵکی گوندی شەپاڵ و

ناوچەکە زۆر شارەزادەبێ پیاوێکی قسەخۆش، لێزانیش دەبێ،پێیان دەڵێ:

(ئێوە بەقاچاخ هاتوون بەڕۆژ بەئاشکرا ناتوانن هاتوچۆ بکەن، بەڵام ئێمە بەئاشکراهاتوین و پرسمان بەسوپای پێنجی پاسدارانی ئێران کردووە،زۆربەی دەرەچەدارەکانی سوپای ناوچەکە دەناسم و ئەوەندەم هەدیە بۆ بردوون دەمی هەموویانم چەور کردووە . چیان لێداوا بکەم چیم بووێت بۆم دەکەن ، بە پایەگای سەر ڕێگەکەم وتووە هەرکەسێك بەناوی منەوە هاتووچۆبکات ڕێگەی لێمەگرن ئەوانیش ڕازی بوون.ئەگەر ئێوەش ئەتانەوێت تاك تاك بەڕۆژ بەئاشکرا هاتووچۆبکەن دەتوانن بەناوی ئێمەوە بڵێن بەچەی شەریفین، یان بڵێن بەچەی بارزانین، ڕێگەتان لێناگرن. بەڵام بەکۆمەڵ ناهێڵن)..

سندوقێ فیشەکیشیان پێشکەش دەکات. ئەوانیش زۆر سوپاسی دەکەن وپێی دەڵێن: (ئێمە بەنهێنی هاتووینەتە ئێرە ئەو هاتوچۆ زۆرە نەکەین،هەرکارێکمان هەبوو بەشەو دەیکەین ، سوپاس.

## گەیاندنی ٢٥ تەن خواردەمەنی .

ئیدارەی بەتالوێنی[٧] لە (بانە) و(بلەکێ) وە بەسەیارە ئەشیاو خواردەمەنیان دەنارده گووندی کەنەسورە .پارتیزانەکانیش هەموو شەوێك بە هێسترەکانی خۆیان چوار بارلەئەشیاو خواردنیان دەگەیاندەپاشبەرد، بەسەرە ئەو پێشمەرگانە دەچوون کەلەبارو بارکردنیان دەزانی.. بەزۆری شەهید(مام واڵی)و( دلێرە بچکۆل ماوەتی) دەچون.بەو شێوەیە بەدوو مانگ،نزیکەی ٢٥تەن خۆراك دەبەنە گوندی پاشبەرد، لەوێشەوە بۆ مەفرەزەکانی خوارەوە. مەفرەزەکانی شاربازێڕیش بە دوو هێستری خۆیان بەشە ئازوقەی خۆیان دەگوازتەوە.مەفرەزەکانی(کاك سەرکەوتی کوبە)یش (نەوزادکریم وحەمەشوکێی)کە دووپێشمەرگەی ئازاوگورج وگۆڵ دەبن.ئەم برادەرانە بەشەو بەناو ئەڵغام و ئەو هەموو سەربازگە و ڕەبیەی دوژمندا

ئەو هەموو ڕێگەیە کە نزیکەی ٥سەعات ڕێگە دەبوو خواردنیان بۆ برادەرەکانیان دەبرد ، زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کەژەمێ یان دووژەم تێر برنج و شلەیەیان دەخوارد ودەگەڕانەوە.مەرزی گۆڵی و گوندی پاشبەرد ڕۆژ بەڕۆژ قەرەباڵغ تر دەبوون . ڕۆژانە خەڵك بۆ سەردان و هەواڵپرسینی شۆڕش و پێشمەرگە لەشاری سلێمانییەوە سەردانیان دەکردن . پێشمەرگەو خەڵکی ئاوارە لەڕۆژهەلاتەوە بۆ هەواڵی کەسوکاریان ڕوویان لێدەکرد.پارتیزانەکان هەمیشە دووحەرەسیان هەبوو، پێشمەرگەکان بۆیان نەبوو بەتەنیا دووربکەونەوە.بۆهەرشوێنێکیش بچوونایە دەبوو لە سێکەس کەمتر نەبوونایە . ئاگادارکرابووەوە بەهیچ جۆرێك نابێ پێشمەرگە بچێت بۆگۆڵێ کەمەرزەکەی لێیە چونکە گۆڵێ و مەرزەکە لەژێر سەیتەرەی حوکمەتی عێراقدا بوون . سەربازگەیەکی گەورە چاودێری دەکردن . دوو پێشمەرگە ڕاسپێردرابوون کە چاودێری ئەو کەسانە بکەن لە عێراقەوە دەبونە میوانیان . تائاگاربن لەهەر ڕوداوێکی نەخوازراو . چونکە زانیارییان هەبوو دەزگا ئەمنیەکانی بەعس خەڵکی خۆیان ناردۆتە مەرزەکان بۆ زانیاری کۆکردنەوە و دەست وەشاندن لەپێشمەرگە. ئەوانەی بازرگانیان دەکرد خەڵکی باش و دڵسۆزیان تێدا بوو ، هەواڵ و زانیاریان بە پارتیزانەکان دەدا . پیاوێکی سیتەکی بازرگانی دەکرد،خزمی شەهید ( عباس سیتەکی) بوو. لەگۆڵی و پاشبەرد ئەشیای دەبرد . ڕۆژێك کاك جمال چاوشین داوای لێ دەکات فەردەیەك ئاردی بۆ ببات بۆ دایکی. ئەو بەڕێزەیش زۆردڵسۆزانە فەردە ئاردەکەدەگەیەنێت.

. ڕۆژێك پێشمەرگەیەك دەبێتە میوانی پارتیزانەکان ناوی(بەختیار ژینۆ)دەبێ ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوە .دواتر دەڕوات تا هەواڵێکی کەسوکارەکەی بپرسێت.

. ڕۆژی ١٠/١٠/١٩٩٠دەکەوێتە بۆسەی دەزگا ئەمنیەکانی عێراقەوەدەیگرن، دەیخەنە سەیارەیەکی ئەمنەوە و دەی ڕفێنن بەرەو شاری سلێمانی.

## هێرشێکی سوپای عێراقی بۆ سەرپارتیزانەکان

گەرچی ناوچەی شارباژێر،بەتایبەتی گوندی پاشبەرد،لەژێردەسەلاَت و چاودێری پێشمەرگەدا دەبێ ، ڕۆژ بە ڕۆژ قەرەباڵغ ترو . خەڵکێکی زۆر لە باش و لەخراپ ، بازرگان و ولأغاردار،خەڵکی بێکار،خەڵکی ڕاسپێراو، لەهەموو ڕەنگەکان لەهەردوو دیووی عێراق و ئێرانەوە..هاتووچۆی دەکەن.. ڕۆژانە دەنگوباسی جمووجوڵی پارتیزانەکان دەگەیشتەوە بەدەزگا ئەمنیەکانی حوکمەتی عێراق.دەستەدەستە پێشمەرگە لە بارەگاکانی سەرسنوورەوە دچنە لای پارتیزانەکان.مەفرەزەیەك لە پێشمەرگەکانی شەهید عەباس سیتەکی شێخ جمال سیتەکی و کەریم سەبری دەچنە لای (جمال چاوشین)وهاوڕێکانی دەمێننەوە.. لەئەرك و پاسەوانیدا هاوکاریان دەکەن . کاك ئازاد وەندەرێنەیش چەند ڕۆژێك لایان دەمێننەوە..

. خانوویەك وەك (چایخانە) ساز و ئامادە دەکرێ ت بۆخزمەتکردنی ڕێبووارەکان

لە ڕۆژی ٨/١١/١٩٩٠ بەیانی زوو عبدولأی چایچی نەفەرێك دەنێرێت بەدوای (جمال چاوشین) دا داوای لێ دەکات بچێتە خوارەوە لای ئەو نانی بەیانی بخوات.. ئەویش" تفەنگەکەی هەڵدگرێت ودەچێتە خوارەوە بۆچایخانەکە بۆنانوماست خواردن. کەدەگاتە چایخانەکە (ئازاد وخاڵەنەجم )هەندێ ڕێبوواری تری لێ دەبن، چایچی دەڵێ:چایخانەکە تەواو بووە،ئەمڕۆ مەڕ سەردەبڕین و کەباب و گۆشتیش دەفرۆشین . خاڵە نەجە روتی سەیری ئەو قۆری و سەماوەرە تازەو چوانە بکە ! تازە بووین بەحوکمەت ئەو نان و چاو ماست و هێلکەو ڕۆنەی لێرە ئیمە هەمانە، لە(ئەبوو سەنا)ی سلێمانیش نیە..نان وماستێکی خۆش پێکەوە دەخۆن ...... دوای هەتاوکەوتن تەماشادەکەن وا کۆمەڵێ نەفەر لەلای (گۆڵێ) وە کە سەربازگەی ڕژێمی لێ دەبێت.. بەڕیزە بەرەو لای ئەوان سەردەکەون ...

چاپچییەکە دەڵێ ( ئەرێوەڵا ئەوانە مشتەری چاپخانەکەی منن ، دیارە زانیویانە چاپخانەکە کراوەتەوەو خواردنی باشمان هەیە، بۆیە بەم بەیانی زووە دێن، بابچم خواردنیان بۆحازربکەم..) پارتیزانەکانیش بە وریاییەوە سەیریان دەکەن.هەتاباش نزیك دەبوونەوە دەبینن تادێ ژمارەیان زیاتر دەبێ، کاتێ تیشکی خۆرەکە لە چەکەکانیان دەدات ئەوجاربۆیان دەردەکەوێت کەچەکدارن.پاسەوانی مەقەڕەکەیش هاواردەکات : عەسکەر هێرشی کرد...

لەپڕ دایان دەگرنەوە بەدەستڕێژی گووللەو پەلامار دەستپێدەکەن،پارتیزانەکان لێیان دێنە دەست و رووبەروویان دەبنەوە. شەڕێکی زۆر قورس بەرپا دەبێ .. لەشکری دوژمن شپرزە دەکرێ.بەهیمەت وئازایەتی هەموولا هێرشەکە دەشکێت، چەند پێشمەرگەیەکی ئازا سەرەوخوار دوایان دەکەون . دوو سەربازیان لێ بەدیل دەگرن.. دوو کلاشینکۆفیان دەسکەوت دەبێ، حوکمەت دەکەوێتە تۆپبارانکردنی ناوچەکە ، هەموو پێشمەرگەکان بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە بۆ مەقەڕەکەی خۆیان .

## خۆ ئامادەکردن بۆ درێژە کێشانی شەڕەکە .

حوکمەت لەتۆڵەی شکستەکەی دەکەوێتە تۆپبارانکردنی ناوچەکەومەقەڕی گومرگ وگوندی پاشبەردو چاپخانەکەو خێمەکانی خوارەوە، هەموو چۆڵی دەکەن، کەسی لێ نامێنێ بەدەیان بارە ئەشیا لەو ناوەدا بەجێدەمێنن، پارتیزانەکان خۆیان ئامادە دەکەنەوەبۆ ئەگەری درێژەکێشانی شەڕەکە،شوێنەکە زۆر قایم دەبێ،گردە بەرزەکان بەدەست پارتیزانەکانەوە دەبێ، برادەرانی حیزبی شیوعی و پارتیش بەشاخە بەرزەکەوە دەبن رەبیەی سوپای ئێرانی لە پشتیانەوە دەبێت ....

دەچنە ناوسەنگەرەکانەوەو دامەزرێن،نزیکی نیوەڕۆ کاك شەریف لەبرادەرانی پارتی جواب دەنێرێ بچن سەرەوە بۆ لایان ،شزینەکەی خۆیان چۆڵ بکەن، بەڵام ئەوان پێیان دەڵێن :نەخێر ئێرە بەجێناهێڵین ، دواتر کاك ( عوسمانی قاڵەمنەوەر و

کاك شەریف ) دەچن بۆلایان . کاك عوسمانی سەرکردەی پارتی پێیان دەڵێ : ئێمە ئێستا لەشاری بانەوە هاتوین ، لەوانەیە دوبارە دوژمن هێرشتان بۆبکەنەوە . دەبێ بچین بۆبلەکێ قسە لەگەڵ مامۆستا جمال بکەین هێزمان بۆ بنێرن . ئەوانیش دەڵێن ناکرێت ئێرە بەجێ بێلن. لە سەر داوای کاك ئازاد وەندەرێنەیی کاك جمال چاوشین لەگەڵیان دەروات. کاك شەریف جێبەکورتەکەی لای پایەگای ئێرانیەکان دەبێ . بەجێبەکەی دەچنە بلەکێ مامۆستا جمال وبرادەران لەوێ دەبن . ئەوانیش پێشتر هەواڵی شەڕەکەیان زانیبوو دڵنیایان دەکەنەوە کە شەوهێزیان بۆدەنێرن هەندێ فیشەکی بیکەیسی و کلاشینکۆف و گولە ئارپیجی وەردەگرن و لەگەڵ برادەرانی پارتی دەگەڕینەوە بۆ پاشبەرد. دوژمن لە نەدیویەوە دەچێتە پێشەوە گردێك دەگرێ ولەوێوە تەقە لەخێمەکان دەکات،ناهێڵن کەس بچێتە ناوخێمەکانەوە ئەو هەموو بارە ئەشیایەش بەچێ دەمێنێ، ، .

## هێرش بۆ گرتنەوەی گردە گیراوەکە.

دوای گەڕانەوەی برادەران لەبلەکێ کانێ دەزانن دوژمن لەنەدیویەوە هاتون ئەو گردەی خوارەوەیان گرتووە،بریاردەدەن لێیان بسەننەوە، کۆمەڵێ پێشمەرگەی ئازاو جوامێر(جوتیار ، شێخ جمال ، هێمن ، ئازاد ) و شەش پێشمەرگەی تری یەکێتی و دووپێشمەرگەی پارتی سەرلەئێوارە بەبیکەیسی و ئاربیجی نارنجۆك.. لەگردەکە دەدەن ، لەماوەیەکی کەمدا گردەکە دە گرنەوە . هێزێکی تری برادەرانی شیوعی وپارتییش زوو دەگەنە لایان ،دوبارە دوژمن دەشکێ و لەهەمولایەکەوە دەکەونەدوای لەشکری شکاوی دوژمن. برادەرانی پارتی دووسەرباز بەدیل دەگرن، هەڤاڵانی یەکێتیش بیکەیسیەك و کلاشینکۆفێکی تردەگرن . ئامرفەوجەکەیش بەبریندارى ڕادەکات. گۆچانەکەیشی بەجێ دەهێڵێت،چوار سەرباز دیل دەکرێن.

## گواستنەوەی ئەشیا بەچیماوەکانی ناو خێمەکان .

دوای گرتنەوەی گردە گیراوەکەو شکاندنی دوژمن ، دنیا تاریکان . ئەو خەڵکانەی شتیان چیما بوو دەچن وشتەکانیان دەگوازنەوە ، پێشمەرگەکانیش هاوکاریەکی باشیان دەکەن ، پێشمەرگەکانیش دەگەڕێنەوە سەنگەرەکانی خۆیان و بەباشی دامەزرێن . دەمەوبەیان چارێکی تر دوژمن هێرش دەکاتەوە سەر ئەو دوو بەرزایەی زاڵ بوو بەسەر مەقەڕەکاندا.بەئازایەتی ئەو پێشمەرگانەی لەوێ دەبن ئەمجارەیش تێك دەشکێندرێن ، دوای هەڵاتنیان پێشمەرگەیەك بەدەنگی بەرز هاوار دەکات: ئێرە وڵاتی کوێت نیە بە٢٤ سەعات داگیر بکەن..

1990/11/9 ئەو ڕۆژەیش هەر شەڕ دەبێ، دوژمن دەیەوێت لەناو دەوەنەکانەوە دزەبکات بەڵام پارتیزانەکان لێیان دە دەن ودەگەڕێنەوە . ئیتر لەپردەکەی گۆڵیوە دەست بە هاوەن و تۆپباران دەکەن .

ڕۆژی دووەم ، دوو پێشمەرگە هەندێ فیشەك و گولەئارپیجی یان بۆ دەهێنن و ئاگاداریان دەکەن کە مامۆستا جمال خۆی و هێزێك هاتون ،پاسدارەکان ناهێڵن بێنە ئاودیوو ببن ...

شەوی سێیەم چارێکی تر لەنیوەشەودا دوژمن هێرش جە کاتەوە بۆ سەر برادەرانی حیزبی شیوعی وپارتی، ئەمجارەش دوژمن دەشکێ، بەڵام بەداخەوە پێشمەرگەیەکی دلێری حیزبی شیوعی شەهید و یەکێکی تریان بریندار دەبێ.

ئەو ڕۆژەیش تۆپباران و وردە تەقە هەر بەردەوام دەبێ ، کاك شەریفیش هاوەنێکی پێدەبێ جارجارە گولەیەك دەگریتە دوژمن وشپرزەیان دەکات..

ڕۆژی ١٩٩٠/١١/١٠ تۆپبارن و وردە تەقە هەر بەردەوام دەبێ ، پێشمەرگەیەکی پارتی بریندار دەبێ بە ناوی(حمەڕەشید)ئەو ڕۆژە ئێران ئاگاداریان دەکاتەوە ئەگەر ناوچەکە چۆڵنەکەن ئویش لەدواوە لێیان دەدات..

کاك شەریف لە برادەرانی پارتی لەگەڵ کاك(حمە ڕەش قەرەداخی) دەچن بۆلای هەڤاڵانی یەکێتی پێیان دەڵێن:(پاسدارەکان دەڵێن ناوچەکە چۆڵنەکەن ئێمەش لەپشتەوە لێتاندەدەین ،چونکەپۆلیسی نێودەوڵەتی چاودێری ئاشتی عێراق و ئێران دەکەن  ئەمڕۆ هاتوون بۆسەیری شەڕەکەو گوتویانە ئەم شەڕە ئەگەر ڕانەگرن بەسەرپێچی ئاشتی نێودەوڵەتی دەزانین و دنیای لێئاگادار دەکەینەوە . دەبێ ئەم شەو جوڵی بکەن..

( ئەوانیش لەوەڵامدا دەڵێن: هەتا مامۆستا جمال یان برادەرانی خۆمان ئاگادارمان نەکەنەوە،ئێمە جوڵی ناکەین) کاك (حمەڕەشید قرەداخی) یش هاو ڕایان دەبێ . ئەوانیش دەڵێن جوڵی ناکەین.کاك شەریف قسەکان دەگەێنێتەوە بەپاسدارەکان... پاسدارەکانیش مامۆستا جمال ئیزن دەدەن،مامۆستا جمال هاوڕێ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك دەگەنە لایان .هەمان قسەکانی کاك شەریف دەگەیەنن ودەڵێن: دەبێ ئێرە چۆڵکەین.ئەوشەوە هەموو دەگەڕینەوە بۆ بلەکێ.

لەشکری عێراق یش بۆ ڕۆژی دواتر پاشەکشە دەکات ونەگاتە شوینی خێمەکە.

## ناوی ئەو پێشمەرگانەی لە شەڕی پاشبەرد بەشدار بوون :

(جوتیار، هێمنە ڕەش، ئیسماعیل ، دلێرە بجکۆل ماوەتی، شەهید مام والی، ئازد وەندەرێنەیی ، عوسمان باڵخەیی ، فەهمی کادر ، سەروە ، نامیق )

مەفرەزەکەی کاك عباس سیتەکی:

(شێخ جمال سیتەکی،کریم سەبری،مستەفا سەبری ، ئەنوەر ،هێرشە بچکۆل . سدیق لەگەڵ پێشمەرگە پارتیزانەکانی لای کاك سەرکەوتی کوبە.*

سەرچاوە : بیرەوەرییەکانی حەمال چاوشین

## جـەمال چاوشین پارتیزانی دوای ئەنفال :

**پایزی ١٩٨٨ چۆن سنوری دەسکردی عێراق ئێرا نمان شکاند ..؟!**

ساڵی ١٩٨٨/ دوای ئەنفالەکان کەچوینە دیووی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دوو مانگ چوین بۆ مازندەران بۆ دەورەی سەربازی، بۆ فێربوونی هەڵگرتنەوەی ئەلغام و بەکار هێنانی هەموو جۆرە چەکێك، دوای گەڕانەوەمان لە دەورەکە چوین بۆ گوندی بلەکێ مەقەڕمان لەوێ بوو، مەقەڕی مەڵبەندی دوو مەقەڕی تیپی ٣١سلێمانی وە هەندێ ماقەڕاتی تریش، حوکمەتی عێراق لێبووردنی گشتی دەرکردبوو، خەڵکوو پێشمەرگە بەلێشاوو دەڕۆشتنەوە تەسلیم دەبوونەوە بێ ئەوەی کەسیان چارەنوسی خۆیان بزانن، خۆیان دەدایە دەست چارەنوسێکی نادیارەوە،خەڵك زۆر نائومێدبووبوون، بڕوا بەخۆبوون زۆر کەمی کردبوو. هەندێ لەبەرپسەکان بە پێشمەرگەوو خەڵکیان ووتبوو بڕۆن تەسلیم ببنەوە یان بچنە ئۆردوگای ئێران ببنە پەناهەندە، شۆڕش ئەم هەموو خەڵکەی بۆ بەخێوو ناکرێت، حوکمەتی عێراق، ئێران پڕووپاگەندی خراپوو ڕوخێنەریان بڵاوەکردەوە، کارەساتی ئەنفال وکیماباران کردنی شاری هەڵەبجە کاردانەوەی خراپی کردبووە سەر دڵوو دەرونی خەڵکەکە، خەڵکو پێشمەرگە پارەیان پێنەبوو چێگەیەك نەبوو بۆژیان، ژیانی ئۆردوگاش قورسوو ناخۆش بوو هەمووکەس قبووڵی ژیانی ئاوارەی ناو ئۆردوگای نەدەکرد. هیچ تروسکایەك لە ئاسۆدا بەدی نەدەکرا، بۆیە خەڵکوو پێشمەرگە ٥٠٪ گەڕانەوە بۆ عێراق، ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی پێشمەرگە لە مەقەڕەکان کەمی دەکرد دوای ساڵێك مەڵبەند نەما، لەبەر کەمی ژمارەی پێشمەرگە جەند کەرتیان دەکردە یەك کەرت. چەند تیپێکیان دەکردە یەك تیپ، جەند تیپێکیان کردە یەك بەتالیون، مەڵبەند بوو بە بەتالوێن. مایەوە هێزێکی زۆر کەم زۆژانەش نەقیب خەلیل

کۆیدەکردینەوەو تەدریبی پێدەکردین، ئەم مەشقکردنە زۆر باشبوو لای هەندێك پێشمەرگە، لای هەندێکیش بێزارکەربوو..

گوندی بلەکی دەکەویتە ڕۆژهەلأتی کوردستان، هەلکەوتەی سەروی ڕۆژهەلأتی قەزای چوارتاوە، دەکەوێتە نزیکەی ۱۵۰ کم باکوری ڕۆژهەلأتی شاری سلێمانیەوە.

سەرەتای مانگی ۱۹۸۸/۱۰ بوو ڕۆژێکیان لەگەلّ شێخ سالاری کادر دوقوڵی دوای نیوەڕۆیەك بەڕۆژ بەدزی( پادگان) و ڕەبیەی سوپای پازدارانی ئێرانەوە، بەناو دۆڵو دارو دەوەنەکاندا سەرکەوتین بۆ بەرزای و شاخی پشتی گوندی بلەکێو چەمپاراو، چوینە ناو دەوەنێکی پڕەوە تا پازدارەکان نەمان بینن و تەقەمان لێنەکەن، بەدوربین سەیری شاخی سورکێومان دەکرد کە بەرانبەرمان بوو ڕەبیەی، سەربازەکانی حوکمەتی عێراقی پێوەبوو، شاخی ئەمبەریش کەخۆمانمان لێشاردبووە لە پشتمانەوە ڕەبیەی سوپای پازدارانی لێبوو زۆر دور نەبوون لێمانەوە، بەووردی سەیری ناوچەکەمان دەکرد بۆئەوەی ڕێگایەك بدۆزینەوە تا لێوەی بچین بۆ ناوچەی شاربازێڕ لەوێشەوە بۆ شاری سلێمانی، چونکە هەموو سنورەکان بەڕەبیەو ئەڵغام گیرابوون، چەند سەعاتێك لەوبەرزایە ماینەوە تا بەباشی چموچوڵی سەربازەکانی هەردوو دەوڵەت ئێراق، ئێران، هەڵسەنگێنین، ڕێگەیەکمان دەست نیشان کرد لەبەینی چەند ڕەبیەکی هەردوو دەوڵەتەوە، پاشان لەتاریکووڕونی ئێوارەدا گەڕاینەوە بۆ مەقەڕ. بەلأم ئەم کارەمان لای کەس باسنەکرد، ڕۆژی دواتر بە کاك ئازاد دەرەمیانەیم وت من دەمەوێت شەوو بچم لە شاخی سورکێو ڕێگەیەك تاقیبکەمەوە بۆ ناوچەی شاربازێڕ، بەلأم باکەس بەمە نەزانێ، کاك ئازاد جێگری تیپی۳۱ بوو ووتی زۆرباشە ئەگەر پێویستدەکات منیش دێم، دوای نانخواردنی ئێوارێ بەدزی هەمولایەکەوە تەنانەت مەقەڕەکەش نەیان زانی لەگەڵ شێخ سالارو دوو پێشمەرگەی تردا نانمان لەگەڵخۆماندا بردوو کەوتینەڕێ زۆر بەخێرای

لەناووچەی ژێردەسەلاتی پارێزارەکان دەرچوین گەیشتینە نزیکی ڕەبیەکانی سوپای عێراق لەبەر ئەڵغام زۆر بەوریانە هێواش هەنگاومان دەنا دووربینی شەومان پێبوو چەند ئەڵغامێکمان لەسەر ڕێگاکە دۆزیەوە هەڵمان گرتنەوە ترەقەکەیمان دەرهێناو لە شوێنی خۆی بی ترەقە دامان دەنایەوە بۆ ئەوەی سەربازەکان هەستی پێنەکەن کە هەڵگیراونەتەوە یان کەس بێرەدا تێپەڕیوە تا ئەڵغامیتر لە شوێنی دانێنەوە،لەدەورەی مازندەران فێری تاکتیکی هەڵگرتنەوەی ئەڵغام بووبووین بەباشی، کاک شێخ سالار شارەزای لەمن باشتر بوو، بەبەینی سێ ڕەبیەی عێراقدا بەسەلامەتی سەرکەوتینە شەر شاخی سورکێوو لەتەنیشت ڕێگەی (بەردە بەکۆز )ئەو شاخەی وەختی خۆی (خولە پیزەی) قارەمان باشترین شەڕی لەگەڵ پۆلیس لێکردووە لە سەردەمی خۆیدا. لە سەر شاخەوە ئاودیووی دیووی شارباژێڕ بووین لەپەنایك دانیشتین بەدووربینی شەوەکە سەیری ناوچەکەوو دەوروبەرمانو سەیری شاخی گۆیژەوو چیای ئەزمرمان دەکرد زۆر بەچوانی گلۆپی بوورچەکەی چیای ئەزمڕمان دەبینی ئەو شەوەش مانگەشەوێکی خۆشوو ئاسمان سامالْ بوو، ، یەکەمین چاربوو دووربینی شەوو بەکار بهێنین زۆر موهیم بوو بەلامانەوە دڵمان پێیخۆش بوو، ئەو شەوە شەوێکی بێدەنگوو کشوومات بوو، نیو سەعاتێ لە دیوی باشور دانیشتین پشویەکی باشماندا پاشان بەڕێگەکەی خۆماندا گەڕاینەوە بۆ مەقەڕی بلەکێ کە نزیك بووینەوە لەمەقەڕەکە حەرەسەکان دەنگیانداین ئێمەش نهێنی شەومان پێبوو خۆمان ناساند. ئێوارێ پێش ئەوەی بڕۆین نهێنی شەوم وەرگرتبوو، ، بەیانی سەردانی مەلبەندم کرد قسەم لەگەڵ کاك قادیر حاجی علی و کاك شۆڕش ئسمایل کرد. کاك قادر مەسولی مەڵبەند، کاك شۆڕش لێپرسراوی بەشی سەربازی مەڵبەند بوو. باسی چون بۆ شارباژێڕم بۆکردن زۆریان پێباشبوو ووتیان خۆتان حازر بکەن ئاگادارمان بکەنەوە بۆ ئەوەی هاوکاریتان بکەین، من

چومەوە بۆماڵەوە، ماڵمان لە شاری سەقز بوو، خۆم حازر کرد کیسە خەوێك، دوو تراك سودی گەرم، بارانگیرێك، دەزوو بەکرەوو، چەقۆیەك، نینۆکبڕێك، قۆریەك، دوو پەرداخ، چوتێ ئەدیداسی قایموو ئەسڵی باشم کڕی، پاشان گەڕامەوە بۆ مەقەڕ لە بلەکێ، دوبارە قسەمان لەگەڵ مەڵبەند کردەوە هەندێ ڕاسپاردەیان پێداین، ئیدارەی مەڵبەند مەتارەی ئاوو، کۆڵەپشتی تازەوو باشیان داینێ، چوم لای دکتۆر چەبار هەندێ لەفافوو لەزگەوو داوودەمانم وەرگرت، هەشت کەس خۆمان حازر کردبوو ناوەکانم دابوو بەمەڵبەند،بەڵام ئەوبرادەرانەی خۆیان حازرکردبوو لەگەڵمان بێنە خوارەوە زۆریان پەشێمان بوونەوە، کاتی ڕۆشتن ماینەوە سێ کەس، بەندە، شێخ سالار شێخ جەلال، تایەری حاجی سەعید، بەئاشکرا خۆمان حازر کرد ئەم شتانەمان پێ بوو یەکی کلاشینکۆفێك و حەوت مەخزەن، سەد فیشەکی زیادە، مەتارەی ئاو دوو رومانە یەك دوربینی شەوو،یەك دوربینی ڕۆژ، یەکی حەربەیەکی تفەنگ، کۆڵەپشتێ پڕ لە ئەشیاو خواردن و داودەرمان، واتا کۆڵەکانمان زۆر قورس بوو زیاد لە بیست کیلۆ دەبوو، پێسمەرگەیەکی قسەخۆش بەناوی مام مچە براکەی کاك حەمەزیاد، ووتی سەیریانکە وا خۆیان بەستووە دەڵێی باوکیان کوژراوە، خوا حاپیزیمان لە برادەران کردوو کەوتینە ڕێ، عاسمان کەمێك هەوری پێوەبوو، بەسەلامەتی ئاودیووی باشوری کوردستان بووین، چووینە دۆڵێکەوە لەسنوری گووندی زاخێ لە ناوحەی شارباژێڕ، لەژێر دار گوێزیکی گوەرەدا پشوماندا زۆر هیلاك بووین زوو خەومان لێکەووت کاتیك بەخەبەر هاتین تازە دنیا روناك بووبووە نمەنمە باران دەباری گوێمان لەدەنگی سەیارە بوو لەلای سەرومانەوە، هەستاینوو بەووریای بە دۆڵەکەدا کەوتینەڕێ، لامان نەدا تا گەیشتینە سەر چەمی گەورەی خوار گوندی، زێ، لەچەمی گەورە پەڕینەوە بەڵام ئەوبەر چەم هەمووی ئەڵغام ڕێژبوو، بەسەر بەردەکاندا خۆمان دەربازکرد چوینە سەر بەرزایەك لەناو دەوەنێکدا

دانیشتین بەدوربین سەیری ناوچەکەمان کرد بەدایان ڕەبیەوو سەربازگەوو سەنگەری حەرەسیات دیاربوون زۆر بەوردی سەیری هەموویانمان کرد هیچ جموجوڵێك دیار نەبوو هیچ ئاوەدانیەك نەدەبینرا تەنها دەنگی وەڕەی سەگێك زۆر دوور دەهاتە گوێمان، سێ سەعات زیاتر لەوو بەرزایە ماینەوەو سەیرمان کرد، دڵنیا بووین هەمووئەو ناوچەیەی لێمانەوە دیارە چۆڵەوو کەسی تێدانیە. بەڕێگەیەکی کۆندا بەوریای کەوتینەڕێ بە شێخ سالارم تایەرم ووت من لەپێشەوە سەیری ئەرزەکەوو ڕێگاکە دەکەم بۆ دۆزینەوەی ئەڵغام ئێوەش پێبخەنە جێ پێکانی من بە ووریای سەیری پێشەوەو دەوربەر بکەن . لەسەر ڕێگاکەمان بە هازاران ئەڵغام هەبوون هەندێکیمان هەڵگرتنەوەو خۆمان لە وانیتر دەپاراست ئەو هەمووئەڵغامە بەئێمە هەڵ نەدەگیرایەوە، ناوچەکە چەندین ساڵە پێشەوەی(ئەمامی) شەڕی عێراق، ئێران بووە هەردوو دەڵەوڵەت بەهەزاران ئەڵغامییان لێدانابوو، گەیشتینە سەر بەرزایی شاخی کۆپانان چوینە ناوو ڕەبیەیەکی سەربازی گەورەوە، لە ناو قوولەیەکی سەربازگەکەدا دانیشتین بەدووربین سەیری هەموو ناوچەکەمان کرد هیچ چووڵەیەك دیلاڕ نەبوو، بۆمان دەرکەوت هەموو ناوچەکە چۆڵە، ئەو هەموو دۆڵەمان بڕی تەنهاچەند بەرازێکمان بینی، وە شاخی سورکێوو شاخی سەرسیر پشتی چوارتا سەربازگەی ئاوەدانی تێدایە، کە لە ئێمەوە دوورن، کەوتینە گەڕان بەناو ڕەبیەوو سەربازگە چۆڵەکاندا پڕبوو لە سندوقە فیشیکوو تەقەمەنی پڕبوو لە خواردنی لە قوتوونراو(قوتوی مەعەلەبات) هەمووی تازە و شیاوو بوو بۆ خواردن بۆمان دەرکەوت حوکمەت چەندڕۆژێکی کەم دەبێت ناوچەکەیان چۆڵکردووە،هێشتا ڕۆژی مابوو قوتوە مەعەلەباتێکی زۆرمان کۆکردەوە لەپانایەکدا دامانناهەندێکمان لەگەڵ خۆماندابردوو کەوتینەڕێ تا تاریکی کرد چوینە سەربازگەیەکی چۆڵەوە لەدۆڵێکدا بوو نزیکی گووندی سەرخوار، لە ژوورێکی

سەربازگەکەدا ئاگرمان کردەوە خواردنمان گەرمکردەوەوو چامان لێنا خواردنێکی گەرموو خۆشمان خوارد شەوو بەوریای خەوتین . ڕۆژی دوایی دەسمان کردەوە بەڕۆشتن هەموو ناوچەکەش پڕبوو لە ئەلغام، بەناو گوندی گوێزەڕەشوو دۆڵپەموودا درێژەمان بە ڕۆشتنەکەماندا، ئەم دوو گوندەو سەدان گوندی ناوچەکە لە ساڵی ١٩٨٦ یان پێشتر چۆڵو وێرانکرابوون بەبۆنەی پەلکێشو چاوساغی کردنی سوپای دەوڵەتی ئێران لەلایەن پارتی دێموکراتی کوردستانەوە شەڕی عێراق ئێرانیان خستە کوردستانەوە، ئەم ناوچەیە بووە وێرانەو مەیدانی شەڕی دوو دەوڵەت، چوینە سەر شاخی قچی پشتی گووندی دۆڵپەموو، حاجی مامەند، چارێتر سەیری هەموو ناوچەکەمان کردەوە بۆمان دەرکەوت لە بەرزای پشی گوندی وڵیاوا سەربازگەیاکی ئاوەدان هەیە پڕیەتی لە سەربای عێراق وە دەورووبەری شارۆچکە وێرانکراوی ئالیاریز چەندین ڕەبیەی ئاوەدان هەیە، ، ئەم شوێنانەم هەمووی نوسیوو نیمچە نەخشەیەکم لێدروستکرد. ماوەیەك بەو بەرزایەوەماینەوە . دوبارە کەوتینەوەڕێ لەسەر ڕێگەی شاخی سەیەر چەند (تەستەقوڵ) پاشەڕۆی گوێدرێژ کەوتبوو تۆزێ دانیشتین بەدیاریەوە بە چیلکەیەك شیمان کردەوە تابزانین تازەیە یان کۆنە کاك تایەر وتی ئەگەر بۆنی بێت تازەیە ئەگەر بۆنی نەمابێ کۆنە دیارە بۆنی نامابوو. بە نێوقەدی شاخی کوڕەکارژاودا ڕۆشتین تا گوندەکانی وەندەرێنە، باراو، شوکێ. شاخی قەڵای گێڵەرەمان لێوەدەرکەوت، زۆر بەوردی سەیری ناوچەکەمان کرد هەمووی چۆڵبوو، کاتێ گوندی وەندەرێنەم بە تەختکراوی بینی، ئەوکێوانەم بەسوتاوی بینی دڵم تەنگ بوو، قوڕگم پڕبوو لەگریان، فرمێسك بەچاومدا هاتە خوارەوە، بیرم لەوە دەکردەوە وەختی خۆی دانیشتوانی ئەم گوندە بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکەیان، بۆ ناشتنی مێوێك، برە چوالەیەك هەلۆژەیەك، ئەوهەموو ڕەنچەو زەحمەتەیان دەدا، یان چەند دڵیان

بەرەزەو باخەکەیان خۆشبوو، لەسەر مەتریێ ئەرزوو زەوی دڵی یەکتریان ئەڕەنجان، بەلاَم ئێستا ئەو هەمو رەنچەیان سوتاوە بۆتە ویرانەوو بۆتە ناوچەی قەدەغەکراو (مەنتیقەی محرمە) خوا دەزانی خاوەنەکانی ئەم رەزوو باخانە ئێستا لە کوێنوو لە چ ژیانێکی هەژارانەدا دەژین. ئاخر ناهەقم نەبوو کەگریام لەم گوندەدا لەدایك بووم. لێرە خرامە بەرخوێندن، لەم گوندەدا فێری ئەلف بای خویندن بووم، لەم شوینە شۆڕشو پێشمەرگەم ناسیوو تێکەڵی سیاسەت بووم، لێرە پرۆسەی هاوسەرگیریم کرد، ئارامگای باوکم و خزمەکامن و چەندین شەهیدی هاوڕێم لێرە بەخاك سپێرابوون، ئێستا بێنازنوو نازانرێت کامە قەبرسانوو کامە مزگەوتوو کامە ماڵوو کامە دیوەخانە، گوندی وەندەرێنە. شوکێ، باراو، لە ڕۆژی١٩٨٧/٥/١٩ لەلایەن حوکموتی بەعسەوە خەڵکەکەی بەزۆر بران بۆ ئۆردوگای عەربەتوو باریکە دێکانیان سوتان . ئاخر چۆن بتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم کە بەم خێرایە ئەم هەموو یادگاریە بەمێشکمدا گوزەردەکات، بۆ شاردنەوەی دڵتەنگیەکەم، بەبرادەرانم ووت ناوچەکە هەمووی چۆڵە کەسی تێدانیە تەنها ئێمە و بەراز نەبێت، قسەکەم تەواو نەکرد گوێدرێژێك بەدەنگێکی کزوو نوساوەوە سەڕانی کاك تایەر ووتی دەی قەزات لەماڵم بەساقی ئەو دەنگەت بم، بە دەنگی سەڕەی گوێدرێژەکە شوێنەکەیمان دۆزیەوە لەنزیکی پەرژینی رەزێکدا لە ناودەوەنێکدا دیاربوو، زۆر سەیرمانکرد خاوەنی گوێدرێژەکە دیار نەبوو شێخ سالار ووتی ئەو گوێدرێژە خاوەنی لەگەڵدایە پرسیاری لەمن کرد وتی ئەوڕەزە کە گوێدرێژەکەی لێیە هیکێیە ووتم هینی براکانی شەهید فەرەچە. نزیك بووینەوە لە گوندەکە لەشوێنێکی بەرزیدا بە برادەرانم ووت ئێوە لێرە دانیشن من دەچم بۆلای گوێدرێژەکە بزانم کەسی لێیە، کاتێ نزیك بوومەوە لە گوێدرێژەکە دووبارە سەڕانیەوە بەلاَم دەنگی زۆر بەرز نەبوو، لەبەر ئەوەی دەنگی زۆر بەرز نەڕوات ڕەشۆکەیان تۆزێ تنگ کردبوو

تانەتوانیٚ دەمی زۆربکاتەوە، کەچومە ناورەزەکە دووبرای شەهید فەرج (کاك غریب و کاك جمال)لەوێبوون خۆم لیٚ ئاشکراکردنوو چووم بۆلایان تۆزێك دانیشتم هەندێك پرسیارم لێکردن هەندیٚ زانیاری گرنگیان دامی دەربارەی ناوچەکە ئەوانیش بۆ تریٚ داگرتن هاتبوون ئەوو ساڵە رەزاکان ترێیەکی زۆر باشوو زۆریان گرتبوو لە شاری سلێمانی پارەی باشی دەکرد، چونکە لادیٚ نەمابوو تا بەروبوومەکانیان ببەن بۆشار ئەوانیش شەووبە دزییەوە بەقاچاخ هاتبوون بۆئێرە، ووتیان لێرەشوو لە دێهاتەکانی تریش خەڵکی لێهەیە هاتوون بۆ ترێداگرتن، حوکمەتیسش پیاوەکانی ناردووە بۆ ناوچەکە بۆ کۆکردنەوەی هەواڵوو زانیاری بەوردی چاودیری ناوچەکە دەکەن،دەبیت ئێوەش زۆر ووریابن، منیش سوپاسمکردن خواحافیزیم لێکردنوو ووتم شەو دیمەوە . گەڕامەوە بۆ لای برادەران ئەوانیش هاتبوونە خوارەوە بۆ سەر کانیوو ئاوەکەی ناو دیٚ، گوندی وەندەرێنە وەکوو هەزاران گوندی تری کوردستان وێران کرابوو داری بەسەر بەردەوە نەمابوو لەگەڵ خاك یەکسان کرابوو زۆرێك لە دارتوەکانی ناودیٚ وشك بیووبوون لە بیٚ ئاویدا، ناودیٚ لەبەر گشووگیان دیواری خانوە ڕوخاوەکان نەدەبینرا تەنها چواردەوری کانی ناودێکە پاك کرابووەوە لەبەر بەکارهێنانی کانیەکە بۆ ئاو، لایەك لە سەقفی کانی ژنانی ناودێکە مابوو لایەکی ڕوخابوو لایەکای تری شانی دایابوو، واتە نیوە سەقفێکی ڕوخاو مابوو، بۆ ئاگر کردنەوە باشبوو کە لە دورەوە ئاگرەکە نەدەبینرا لەوحێکی لێبوو بەدوکەڵی ئاگر ڕەش بووبوو بۆ ئاوگەرم کردن بەکاریان هێنابوو دەموو جاومان شتوو پشویەکی باشمان دا، من چوم سەیری جێگە خانوەکەی ماڵی خۆمانم کرد داروو بەردی بووبوو بە خۆڵەمێش بە بەرزیەوە بوو شۆفلْ نەیتوانیبوو بیگاتیٚ و بیڕوخێنی سوتانبوویان من وەختی خۆی هەندیٚ فیشەکو، گولە ئاربچی، چەند ڕومانەیەك، چەند ئەڵغامێك،

کۆمەڵێ تەقەمەنیم لە ماڵەوە هەڵگرتبوو، کاتێك دایکم ماڵەکەی چۆڵکردبوو بەرمیلێك نەوت و ئەشیای تری بۆ نەڕۆشتبوو هەموی لە خانوەکەدا بەچێ مابوو کاتێ ئاگریان لە خانوەکە بەردابوو نەوتوو تەقەمەنیەکان هەمووی تەقیبوونەوە هەمووشێکی کردبووە خۆڵەمێش، ئەوکاتەش کە گوندەکەیان سوتان وات ڕۆژی ١٩٨٧/٥/١٩ لەگەڵ سێ پێشمەرگەیتردا لە شاخی پشتی گوندی شوکێوە بووین دەنگی تەقینەوەکانمان بیست. دوکەڵی ئاگرەکانمان لە ئاسمان بەباشی دەبینی، تۆزێك سەیری خانوە خاپور کراوەکەم کردوو گەڕامەوە بۆ لای برادەران، زۆری نەمابوو دنیا تاریك بکاك چوینەوە بۆ لای براکای شەهید فەرەج وەندەرێنەی، لە ناوڕەزەکەدا خانوویەکی بە وشکە کەڵەك دروست کراو هەبوو سەرەکەی لایلۆنێکی ئەستوری درابوو بەسەردا لە سەر لەیلۆنەکەشەوە بە مێولاکوو گەلاداپۆشرابوو شوێنەکەشی زۆر چاکوو پەنابوو لەدورەوە نەدەبینرا نەشدەدۆزایەوە چونکە لەپاڵ پەرژینی ڕەزەکە دروستکرابوو هەرچواردەوریشی دەوەن بوو شوێنێکی زۆر باشبوو بۆ مانەوە . لەلای ئەوەن نانی ئێواریمان خوارد سەعات دەی شەو ئەوان باریان بارکردوو گەڕانەوە بۆ شاری سلێمانی هەندێ راسپاردەمان پێدا ناردن بۆ شار کاك تایەر چوابی نارد بۆ برایەکی بەیانی بۆ ئێوارەکەی براکەی کاك تایەری حاجی سەعید گەیشتە لامان. خواردنی بۆ هێناین شەو لامان مایەوە، ڕۆژی دوای براکەی کاك تایەرمان بەڕێکردوو خۆشمان دەستمان کرد بە چەولە. شەو چووین بۆ گوندی شوکی بەدوربینی شەو روشنای ئاگرێکمان لە ڕەزێکا دۆزیەوە کەچوین چوتیارێکی خەڵکی شوکی. ناوی( محێدین) بوو هاتبوو بۆ ناورەزەکەی کەچوینەلای خەوتبوو هەڵمان ساند زۆر ترسا بەلام کە منیناسی هاتەوەسەرخۆ زۆر شادمان بوو ووتی وامزانیەوە تاقتان نەماوە ڕژێم دیعایەی کردووە شۆڕشوو پێشمەرگە نەماون ئێستا ئێوەم بینیوە زۆرئاسودەو دڵخۆشم بەمانی شۆڕشوو

پێشمەرگە، ماوەیەك دانیشتین لای چایەکی بۆ لێناین باسوخواستی زۆرمان کرد باسی مانەوەی شۆڕشوو پێشمەرگەو دروست بوونی مەفرەزە پارتیزانەکانو گۆڕینی شێوەی خەبات کردنی تازەی پێشمەرگەمان بۆ کرد، دڵنیا بووین کەگەڕایەوە بۆشار هیچ نەبێ لای ماڵوومنداڵەکەی خۆی باسی شۆڕشوو پێشمەرگەو ئێمە دەکات، چارێکی تر بەدووربینەکە تروسکایەکیترم دۆزیەوە لە دۆڵێکی تر خەڵکی شوکێ پیلان دەگوت دۆڵەزان، لای کاك (محێدین)مان بەجێ هێشت جوین بۆ دۆڵەزان شوێنێ تروسکایەکەمان دۆزیەوە، خانویەك بوو دوکەسی تێدا خەوتبوو هەڵمانساندن لەخەو کاك ئەحمەد حاجی ڕەحمان خۆیوو ڕزگاری کووڕی بوو لای ئەوان ماینەوە سێ ڕۆژ شوێنەکەیان زۆر قایم بوو دووربوو لە گوندی شوکێوە، خانوەکەیان گەورەوو زۆر ڕیکوو پێك دروست کردبوو جێگەی شەیش نەفەر دەبۆوە دەرگاو پەنچەرەی تێدا بوو نایلۆنی بەسەرەوە بوو گڵێبان کرابوو بان گێڕاندنی نەدەویست دڵۆپەی نەدەکرد سەرما کاری تێنەدەکرد بۆزستان زۆر باشبوو، ڕاخەری تێدابوو جەند بەتانیەکی لێبوو قاپوو قاجاخی لێبوو، لەبار بوو بۆ ژیانوو مانەوە. لەدورەوە نەدەبینرا چوان بەگەڵا داپۆشرابوو، کانیو ئاوێکی لێوە نزیك بوو، یەك لیژنە داری وشکی لەتەنیشتی هەڵجنرابوو زۆپای داری تێدا بوو، کاك ئەحمەد ئازوقەی باشی لەلابوو ڕۆژانە ژەمێ برنجوو ژەمی ساوەرمان لێدەنا، بڕیارماندا ئێرە بکەینە بنکەی سەرەکیمان ئەگەر زۆر ماینەوە، یان ئەگەر لەیەك دابڕاین لێرە یەکبگرینەوە، بە کاك ئحمەدمان گووت ئازوقەمان بۆ بکڕەوو بۆمان بێنێت لە شاری سلێمانی، چونکە کاك ئەحمەد کەسێکی ناسراوو دڵسۆزو جێگەی سیقەو متمانە بوو ترسمان لێێ نەبوو، کاك ئەحمەد و ڕزگار گەڕانەو بۆ شار، ئێمەش بەشەوو ڕۆشتین بۆ گوندی کارژاو لەڕێگا جەند تاقمە ولاغارمان بینی لای ناسیاوەکان خۆمان نەناساند بە ئاشکرا رامان دەگرتنوو قسەمان بۆدەکردن

باسی بەسەرهاتی شۆڕشمان بۆ دەکردن زۆر دڵخۆشوو شادومان دەبوون تەمی نائومێدیان دەرەویەوە پشکۆی هیوای ڕزگاریان دەگەشایەوە، زۆر پیلان سەیر بوو پێشمەرگە لە شارباژێڕ ببین. حەزیان دەکرد زیاتر لامن دانیشن. چوینە گوندی کارژاو لەوێش خەڵکی لێبوو لای هەندێکیان خۆمان ئاشکرا دەکرد لە هەندێکیشیان خۆمان لادەدا، کوڕو کچێکی شێخ ساڵحی کارژاوی لێبوو خزمی شێخ سالار بوو سێ ڕۆژ لای ئەوانیش ماینەوە، لە سەر شاخی پشتی کانی دڕکەوە سەیری هەموو ناوچەکامان کرد. شەو زۆر ساردی کردبوو جار جارەش باران دەباری نەمان دەتوانی لەدەرەوە بمێنینەوە دوای هەفتەیەك گەڕاینەوە بۆ خانوەکەی کاك (ئەحمەد)لەدۆڵەزان لەپشتی گوندی شوکێ کاك ئەحمەد ئازوقەی بۆ هێنابووین لە خانوەکە بۆی دانابووین، پاش ماوەیەك دوبارە گەڕاینەوە بۆ خانوەکەی گوندی وەندەرینە چەند ڕۆژێکیش لەوێ ماینەوە لەوماوەیەدا خۆشکیکم و برازایەکم خەبەریان زانیبوو من لەوێم هاتبوون بۆلام لەگەڵ دایکی شەهید مستەفا. هەندێ خواردن و پارەیان بۆ هێنابووم، زۆر شادمان بوون کەمنیان بینیەوە، چەند سەعاتێ لام مانەوە تاریکوڕونی ئێوارێ بەڕیم کردنەوە بۆ شارۆجکەی عەربەت، ئێمەش خانوەکەمان بەجێهێشت ڕۆژی دوای هەندێ خزموو خەڵکی ترمان بینی قسەمان بۆ کردن دەربارەی شۆڕشوو پێشمەرگە. چوینە خانوەکەی کاك بەکری حەمەعەلی لەکانیبارە کوڕو کچێکی کاك بەکری لێبوو ئازوقەیان پیبوو پێم وتن هەندێ ناوساچنمان بۆ بکەن بەشی چەند ژەمێك، بۆیان کردین زۆر سپاسیانم کردنیا زۆر ساردی کردبوو مانەوە سەخت بوو، جەولەیەکی باشوو سەرکەوتومان کرد ئەوەی بۆی هاتبووین کەشفکردنی ناوچەکە بوو کردمان، نەخشەیەکی شارباژێڕمان کێشاوە، لەباشوو لەخراپ خەڵکێکی زۆرمان بینیوە یان ئێمەیان دیوە دەنگوباسمان گەیشتۆتەوە بەڕژێم لەوانەیە مانەوەمان خەتەریات

دروست بکات لەسەر ناوچەکە، بۆیە بڕیارماندا کۆتای بە جەولەکەمان بهێنین بگەڕینەوە، دوای ئێمە حوکمەت هاتبوو کەشفی ناوچەکەی کردبوو هەندێ چوتیاری گرتبوو، گەڕاینەوە گوندی دۆڵپەموو شەو ماینەوە. دڵنیا بووین لەوەی ناوجەکە چۆڵە، بەڕۆژ بەڕێ کەوتین بەسەر جادەی قیری جوارتا ناڵپارێز. جەندین ڕەبیەو مەعەسکەراتی چۆڵوو پڕ لە تەقەمەنی لەو ڕێگایەدا هەبوو، سەیری زوربەیانمان کردن. گەیشتینەوە مەعسکەرەکەی سەر شاخی کۆپانان یەك تاوبارانوو تەرزەی قایم دایکرد یەك سەعات باری ئەرز تەڕبوو باشبوو زووتر گەیشتینە ناو خانووی مەعەسکەرەکە ترنەبووین ئەگەر ئەوبارانە بەخوڕە لێدابایین بەمیلاك دەچوین، .هێشتا ڕۆژ لەنیوەیدا بوو لە ژورێکی سەربازگەکە ئاگرمان کردەوە چامان لێنا خواردنی قوتومان گەرم دەکردەوە، خەریکی نانخواردن بووین زرمەو تەقەی چینکۆکانی ناو سەربازگەکە هات، پەلاماری تفەگەکانماندا زامنمان ترازان بەورییای چوینە دەرەوە سەیرمانکرد هیچ دیار نەبوو، تۆزێ گووێمان هەڵخست بینیمان دوو پشیلە کێووی لەسەر دیوارێکی مەعەسکەرەکە سەیریان دەکردین یەکێکیان میاویانی ئیتر زانیمان زرمەو تەقەی لەوحەکان ئەو دوو پشیلەیە بوون . دیار بوو ئەوانیش برسیان بوو یان لانەکەیانمان لێداگیر کردبوون چاوایوانی ڕۆشتنی ئێمەوو چۆڵکردنی لانەکەیان دەکرد، کاك تایەر دوو قوتوو گۆشتی بۆ هەڵچڕین بۆی بەجێ هێشتن، شاخی کۆپانانمان بەجێ هێشت هاتینە خوارەوە بۆ سەر چەمی گەورەو چەمی زاخێ،لە سەر چەمی زاخێوە ڕێگەکەمان گۆڕی لەو ڕێگەوە نەگەڕاینەوە کە لێوەی هاتین، بەدۆڵەکەی پشتی زاخێدا سەرکەوتین، هەندێ ئەڵغام لەسەر ڕێگەکەمان هەبوو هەڵمان گرتەوە لە ناوچەی ئەڵغام ڕزگارمان بوو لە بن دارگوێزێکی گەورە دانیشتین بندارەکە گەڕاین هەندێ گوێزمان دۆزیەوە، پشویەکی باشماندا ئەمە ئاخر لادانمانە چونکە زۆر نزیك

بووینەتەوە لە مەعەسکەرێکی عێراقی کە ئاوەدانبوو لە خوار گوندی نۆرك لەسەر چادەکەوو لەسەر ڕێگەکەمان بوو ئەبووایە خۆمان لێلابدایە، ڕێگەکامان چوار سەعاتی تری مابوو بگەینەوە مەقەڕی بلەکێ، سەعاتێ ڕۆژی مابوو ئاسمان هەورێکی ڕەشی هەبوو نمەنمە باران دەباری، کەوتینە ڕێ بەرەو بلەکی بەندە لەپێشەوە، شێخ سالار، دووەم کەس کاك تایەر سێیەم کەس کەمێك مەسافەمان هەبوو نزیك بووبووینەوە لە ڕەبیەیەکێ سەربازی چۆڵکراو کاتێکم زانی زرمەهاتوو خۆمدا بەئەرزا، خێرا هەستامەوە گوێم لەهاواری کاك تایەر بوو ووتی توخوا فریام کەون بریندارم منیش هەستمکرد ڕانموو ڕومەتم ئازاریان هەیە دەکزانەوە دەستم بۆ ڕومەتم برد دەستم پڕبوو لەخوێن، دەستم بەڕومەتمەوە گرتوو گەڕامەوە بۆ لای کاك تایەر کە سەیرمانکرد هەردوو ڕانی بە پارچەی ئەڵغامەکە بریندار بووبوو خوێنی زۆری لێدەهات، برینەکەی قوڵوو زۆر بوو بەلأم خۆشبەختانە ئێسقانی نەگرتبوو، هەڵمان ساند خۆی بەپێوە بۆنەدەگیرا چوینە بنباڵی تاگەیاندمانە ناو ڕەبیە چۆڵەکە. شەرواڵەکەیمان داکەندوو لەفافمان پێ بوو برینەکانمان بۆ بەست باشبوو خۆێنەکەی گیرسایەوە. حەپی ئازارمان دایە، ڕامان کێشا کیسەخەوەکەمان پێدادا زۆرسەرمای بوو بەخراپی لەرزی لێهاتبوو، منیش چارێتر هەستم کرد ڕانم دەکزێتەوە کەسەیرمکرد ساچمەیەکیش بەر ڕانم کەوتووە شەرواڵەکەم خوێناووی بووە، بەلأم برینەکەی من کەمبوو، شێخ سالار خوێنەکەی ڕومەتی منیشی پاککردەوە بەلافافوو لەزگە بۆی بەستم، برینەکەی ڕانیشم لەزگەیەکم لێدا، ئەم تەقینەوەیە ئەڵغامی تەڵە بوو چەند مەترێك لەنزیکی ڕێگاکە ئەڵغامەکەیان دانابوو بە سیمێکی باریك کە نەدەبینرا بەستبوویان بە سنگێکی چەقیوو تۆزێ بەبەرزی، تا هەرکەسێ یان هەر گیان دارێك بەوڕێگەیەدا بڕوات قاچی بەر بکەویت بتەقێتەوە منیش قاچم بەر سیمەکە کەوت ئەڵغامەکە تەقییەوە سەوتێکی زۆر گەورەی هەبوو،

شێخ سالار بە سوعبەتەوە ووتی من جونکە شێخم لەبەینی هەردوکتاندا هیچم بەرنەکەوت ئێوەش شێخبوونایە سەلامەت دەبوون، ووردە ووردە دنیا تاریکی کرد شەوێکی زۆر تاریکوو باراناوی بوو. زۆر نزیکیش بووین لە مەعسکەرێکەوە نەمان دەتوانی بمێنینەوە. کاك تایەر زۆر هیلاك بوو دەیگووت بەچێم بێڵن ئێوەش بابەبۆنەی منەوە تیانەچن، ئێمەش زۆر دڵخۆشیمان دایەوە پارویەك نانوو گوێزمان دایە قومێ ئاوی خواردەوە ووردە ووردە سەرماو لەرزینەکەی کەمی کرد تۆزێ هاتەوە سەرخۆی گەرم بووەوە، هەڵمان سانە سەرپێ تۆزێ باشبوو کاك تایەر پیلاوایکی ئازاوو چوامێر و بەخیرەت بوو بەلأم برینەکانی زۆر بەسوێ بوون، نەمان دەتوانی هەڵی بگرین زۆر قورس بوو نزیکەی هەشتا کیلۆ دەبوو، بەشەلە شەل کەوتینەرێ بەنۆرە لەگەل شێخ سالار دەچووینە ژێرباڵی یان دەستیمان دەگرت، . ئەویترمان تاقموو تفەنگەیەیوو کۆڵەپشتەکەیمان هەڵدەگرتو بەوریای لەپێشەوە دەڕۆیشت، شەوێکی زۆر تاریك بوو باران دەباری نەمانزانی چوبووینە بن تەلبەنی مەعەسکەرەکی سەر رێگاکرمان گوێمان لەدەنگی سەربازەکان بوو . سەربازەکان پێیان نەزانین خۆمان لێلادان، زۆر بەنارەحەت بەهەورازی سورکیودا سەرکەوتین بەچ حاڵێك لە رەبیەی عێراق و ئێران رزگارمان بوو رۆژمان لێبووە، واتە رێگای چوار سەعاتمان بە دوازدە سەعات بری، شێخ سالار چوو بەدوای پێشمەرگەکانی مەقەری بلەکێدا هاتن بەپیرمانەوە کاك تایەریان بردە خوارەوە بۆ خەستەخانەکە لەوێشەوە بۆ خەستەخانەی شاری بانە

١٤/١٠/٢٠١١ شاری رۆتەردام

---

* دێرین / کۆمەڵەی پێشمەرگەدێرینەکان 2013/1/18



## هەڤاڵ نەوزاد کەریم

## چۆن بیرەوەری سەردەمی پارتبزانی دەگێڕێتەوە لەساڵــرۆژی شەهید بوونی, کــادرو پێشمەرگەی هاوڕێ و هاوسەنگەرمان یاسین ئەحمەد مستەفا ـ مامۆستا یاسین " دا

هێشتا ماندوویەتی ئەو ١٠ مانگ مانەوەی وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزانی دوای ئەنفالەکان لە گەرمیان دەرنەچووبوو که بۆ پشوودان گەرابووەوە بارەگاکانی سەر سنوور، بریار ی دا لەگەڵ ئەو مەفرەزە ٦ کەسیە ی ئێمەش دا( کە کاك " جەمال حاجی مەمەنی" سەرپەرشتی مەفرەزەکەی ئەکرد( دیسان وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزان بێتە ناوچە چۆڵەکانی شارباژێر درێژە بە خەباتی پارتیزانی بدات و ببێتەوە بە ئێشکگری کەلاوەکانی گوندە چۆڵکراوەکان . وردە وردە لە زستان نزیك دەبووینەوە بۆیە چیتر کارێکی زەحمەت بوو کە وەك مانگەکانی پێشوو بتوانین لە پەنا بەردو لەناو کەلاوەی گوندەکان و ژێر دارەکان دا ژیانی پێشمەرگەیەتیمان بەسەر بەرین بۆیە بریارمان دا شوێنێك لە ژێر زەوی دا بۆ مانەوەی ئەو زستانەمان و بۆ حەوانەوەمان دروست بکەین بۆ ئەو مەبەستەش شوێنێك لە نزیك کەلاوەکانی گوندی ""پارەزان"" مان هەڵبژارد. بە هۆی ئەو فەوجە سەربازیە گەرۆکەی کە هاتبووە ئەو ناوچەی کە ئێمەی لێبووین تەنها بە شەو ئەمانتوانی کاری لێبکەین بەرۆژ تەنیا چاودێری جموجۆڵی فەوجە سەربازیەکەمان ئەکرد، کاری هەڵکەندنی زەویەکەمان تەواو کرد لە شێوەی ژوورێك دا لە ژێر زەوی دا، کە پێشتریش کاك جەمال و وەستا جەبارو شەهید یاسین ئیشی باشیان تیا کردبوو بەڵام چەند رۆژێك بوو کاك جەمال کە فەرماندەی مەفرەزەکەمان بوو بە مەبەستی

کۆبوونەوەیەکی فەرماندەکان گەرابووەوە سەر سنوور لەگەڵ شێخ ستاردا کە پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەمان بوو ئێمەش بریارماندا کە تاکو ئەوان ئەگەڕێنەوە تەواوی بکەین بۆ سەرگرتنی ژوورەکەش پێویست بوو پشت ببەستین بە رەبیە چۆڵکراوەکانی رژێمی ئەوکات کە دارو چینکۆی زۆری تێدابوو کە رەبیەکانیان پێ دروست کردبوو ، شەوێکی ئێجگار تاریك بریارمان دا کە هەر چۆنێك بێت ئەو شەوە بچینە ئەو رەبیە چۆڵکراوەی کە بەسەر فەوجە گەرۆکەدا دەیروانی تەوای پێداویستی بۆ ژورەکە لە دارو چینکۆ بهێنین ئەو کات ٥ کەس لە مەفرەزەکە بوون بریارمان دا کە بە دوو بەش بچین بۆ رەبیەکە وەستا جەبار حاجی مامەنی و حمە شوکیٚ ی و شازین هێرش پێکەوو رۆشتن من و شەهید یاسین بە مەبەستی پشکنینی ئەو ناوچەیەی نزیك خۆمان و هێنانی ئاوی خواردنەوە چوینە سەر ئەو کانیەی کە لە خوار خۆمانەوە بوو پاش دڵنیا بوون لە نەبوونی هیچ مەترسیەك هێنانی ئاوەکە بەرەو رەبیەکەو ئەو ٣ برادەرەی تر رۆیشتین کە گەشتینە ئەوێ ئەوان پێداویستەکانی کاروانێکی خۆیانیان ئامادە کردبوو بەلام ئەبووایە هەر یەکەمان دوو کاروانی بکردایە ئەوان بە گەیشتنی من و شەهید یاسین پێداویستیەکانی خۆیان بردو رۆیشتن لەکاتی رۆیشتنیاندا وەستا جەبار بە منی ووت ئەبێت زۆر بە بێدەنگی چینکۆ و دارەکان دەرهێنن ئەو فەوجە پێمان ئەزانن ئێمەش بەشی کاروانی یەکەمەمان لە " دارو چینکۆ "ئامادە کردوو بەرێکەوتین ئێجگار شەوێکی تارك بوو ئەو رێگا باریکەیەی کە بۆ رەبیەکە ئەچوو ترسی ئەڵغامی نەبوو ئێمە لەبەر تاریکی شەو هەڵەمان کرد ورێگاکەمان لێ تێکچوو بەڵام لە جاری یەکەمدا سەلامەت بووین گەیشتینەوە شوێنی خۆمان شتەکانمان داناو کەمێك پشوومان داو وەك بریارمان دابوو کە دوو کاروان بکەین گەراینەوە بۆ رەبیەکە کە گەیشتینە ئەوێ ئەو ٣ پێشمەرگەی هاورێمشمان گەیشتبوونەوە

رەبایەکە و پێداویستیەکانی خۆیانیان بۆ جاری دووەم حازر کردبوو هەڵیانگرتوو رۆیشتن پاش ئەوەی ئێمەش پێداویستەکانمان ئامادە کرد له رەبیەکە دەرچووین بەلام هەروەك جاری یەکەم بەهۆی تاریکی و قورسی ئەو شتانەی کە پێمان بوو رێگەی دەرچوون له رەبیەکەمان هەڵە کرد بەسەر تەلەدرکاوی رەبیەکەدا چوینە دەرەوە شەهید یاسین له پێشەوە بوو له رەبیەکە چووبووە دەرەوەو لەو دیو تەلەکەوە چاوەڕی منی ئەکرد من ئاورم دایەوە بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئەو تەلە درکاویەی بەسەریدا رۆیشتبووین بۆ ئەوەی کە هەست نەکرێت بە چی ئاراستەیەك دا رۆیشتووین بەلام کە ئاورم دایەوە لەبەر تاریکی هیچم نەئەبینی بەدەست ئەگەرام بۆ تەلە درکاویەکە لەناکاو تەقینەوەیەکی گەورەروویداو ئاگر بەسەرمدا ئەباری و هەموو لایەکمان بوو بەئاگر نەم ئەزانی چی روویداوە، بۆ ئەوەی کە ئاشکرا نەبین و فەوجە سەربازیە گەرۆکەکە پێمان نەزانن و ئاشکرا نەبین بەو " کاسکێتەی "کە لەسەرم بوو کەوتمە کوژاندنەوەی ئاگرەکە تا کۆنترۆلی ئاگرەکەم کرد هیچ دەنگێکم نەبیست بەهۆی تاریکیشەوە نەم ئەزانی کاك یاسین چی بەسەر هاتوە بەلام دەمزانی کە خۆم بەتەنیا ماومەتەوە پاشان بە هێواشی بانگم لە کاك یاسین کرد سەرەتا وەلامی نەدامەوە لە ناکاو بەدەنگی بەرز هاواری کرد ووتی "توخوا وەرە بمکوژە هەردوو قاچم پەریوە" روەو دەنگەکەی چووم گەیشتمە سەری بەلام بە چاو نەمئەبینی هەر بەدەست هەوڵمدا کە بیدۆزمەوە بە تەنیا نەمتوانی هیچی لێبکەم چونکە دڵنیا بووم کە ئەوە کێڵگەی ئەڵغامە کە ئێمەی تێیداین ئەو تەقینەوەش ئەڵغام بووە.چاوەڕێی ئەو ٣ برادەرەی ترم کرد کە دڵنیابووە ئەگەرێنەوە لامان کەوتمە قسەکردن لەگەڵی بەڵام لە وەڵامەکانی تێنەئەگەیشتم، ئەو ٣ هاوڕێیەی ترمان وەستاجەبار و کاك هێرش و حمە شوکی یی کە گوێبیستی تەقینەوەکە بوون گەرانەوە بۆ لای ئێمە بەلام

نەیائەزانی کە چیمان بەسەر هاتووە هەتا گەیشتنە لامان، پاشان توانیمان لە ناو ناوجەی ئەلغامەکان دەرببهینین بەلآم پاش کەمێك بۆ هەتا هەتایە چاوی لێکناو لەگەڵ هیواو ئومید و خۆزگەکانی بوون بە میوانی خاك ..هەر لەوێ بەخاکمان سپارد .لەساڵرۆژی شەهید بوونی دا هەزاران سلآو لە گیانی پاکی شەهید یاسین وسەرجەم شەهیدانی رێگـای رزگاری و سەرفرازی رۆحیان شـاد بێت ، سەربەرزی بۆ کەسوکارو خانەوادە تێکۆشەرەکانیان ...

وێنەکە سێ رۆژ پیش شەهیدبوونی گیراوە لە شوێنی تایبەتی و خۆحەشاردانی مەفرەزەکە کە لەژێر زەوی دا دروستمان کردبوو.شەهید یاسین سالـی 1967 لە گەرەکی خەباتی سلێمانی لە دایك بووە ...

ساڵی ١٩٨٣ پەیوەندی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانەوە کردوە و کەسێکی چالاکی رێکخستنەکانی ناو شاری سلێمـانی بووە..

ساڵێ ١٩٨٦ئەوکات کەخوێنکاری شەشەمی ئامادەیی بوو لەلایەن دەزگا سیخوریەکانی بەعسەوە ئاشـکرا ئەبن و چەند هاوریەکی ئەگیرێن ، شەهید یاسین دەربازی ئەبێت و پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە ئەکات ئەبێت بە پێشمەرگە لە تیپی ٥٥ قەرەداخ ..

ساڵی ١٩٨٨ ئەبێتە کادری رێکخستن و وەك رێکخەر لە تیپی ٥٥ قەرەداخ .

ساڵی ١٩٨٩ لە گەڵ مەفرەزەیەك ئەگەرێتەوە ناوچە چۆلەکانی گەرمیان و درێـژە بە خەباتی پارتیزانی ئەدات

لە شەوی ٦ ١١ ١٩٩٠ لە نزیك گوندی پارەزان شەهید ئەبێت .

لەگەڵ راپەرینی خەڵکی کوردستان و رزگـار کردنی سلێمانی دا تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ سلێمانی و شەهیـدان بوو بە دوا ئارامگای .

* هەمان سەرچاوەی پێشوو : نەوزاد کەریـم / نەرویج



# خاڵەسەراوی

## پارتیزانی دوای ئەنفال

## دەربارەی پارتیزانەکانی شارباژێڕ

## بیرەوەرییەکانی دەگێڕێتەوە

## سەرەتای هاتنە خوارەوەمان

ئێمە دەستەی پارتیزانەکانی شارباژێر لەسەر بریاری م.س (ی.ن.ك) لەشەوی ١٦/٩/١٩٩٠هەتا کاتی راپەرین بەم شێوەیەی خوارەوە دەستبەکاربووین :

یەکەم جار لە بەتالۆنی ٧ لە بلەکێ کۆبووینەوە ، پێداویستی پێنج رۆژمان ئامادە کردو بەرێکەوتین بەرو گوندی کیوەرۆ لەسەر سنورەکە،کەئێمە چووین بارەگای بەتالۆنی٦ی کەرکوکی لەوێ بوو، فەرماندەی بەتالیۆن هەڤال سیروانی کوێخا نەجم بوو، دیارە ئەم بەرنامەیە بەدزی حکومەتی ئێران بوو، چونکە رێگەی نە ئەدا هێزەکانی (ی.ن.ك) لەو خەتە بێنە خوارەوە چونکە شەری ئێران ئێراق وەستابوو..

لە سەعات ٦ی ئێوارە بەرێکەوتین بۆ سەر چەمی چۆمان کە دەبێ ئەوەش بلێم رژێمی ئێراق بە درێژای سنوری خۆی سەربازگەیەکی زۆری دانابوو بەلام ئێمە چونکە زۆربەمان خەڵکی ئەو گوندانەبوین کێشەمان نەبوو، بەلام ئەوەی کێشەی بۆ ئێمە دروستکردبوو کێڵگەکانی مین(حقول الغام) بوو،تەلی دڕکاوی هەرچوار دەوری رێگاکانی گرتبوو،بەلام ئەوەش رێگرنەبوو لەبەردەمی ئێمەداچونکەئێمە ئیرادەیەکی زۆربەهێزمان هەبوو.کە ئەویش ئاواتی رزگاری نەتەوەو نیشتمانەکەمان بوو...

کە هاتینە سەرچەم دەبێ بزانین دوژمن لەکوێیە بەرنامەیەکی باشمان دانا بۆ رۆیشتن، بیرمان کردەوە ئێمە هەریەکێکمان زیاتر لە ٢٠کیلۆ خۆراك و تاقم و تفەنگمان پێیە..واباشە هەرهەمووپێشمەرگەکان کە ژمارەمان ١٨ بوو شەهید حاجی سەراوی فەرماندەی کەرتەکە بوو، بەندەش جێگری کەرت بووم، ئێمە پێشمەرگەی تیپی ٣٧ شارباژێربووین، بەهەرحال(٩) پێشمەرگە لەسەرچەم مانەوە..

باقی پێشمەرگەکان کۆڵ ئازوقەو کۆڵەپشتمان پێبوو، ٤پێشمەرگە بە چەکەوە حیمایەمان بوون هەتا شوێنی مەبەست ، لە سەعات ٩ی شەودا بەرێکەوتین..

لەدوری ٢٠مەتری سەربازگەی دوژمن بۆسەعات ٢گەیشتینە شوێنی دیاری کراو، پشویەکمان داو دوبارە گەراینەوە بۆسەرچەم، ئەمجارە هەموومان چەك وکۆلەپشت و ئازوقەمان هەڵگرت و بەرێکەوتینەوە تا چوینە شوێنی خۆمان، جا دەبوو رۆژ نەبێتەوە بگەینە ئەو جێگەیەی دیاری کرابوو، یەکەم جارگەیشتینە گوندی (شاناخسێی ئالان) کە ئەو ناوچانە چۆل بوو.

لە ساڵی ١٩٧٨بەر شالاوی راگواستن کەوتبوو، لە سەعات ٤ی بەیانی بەرێکەوتین بە چیای(گمۆ)دا بۆ دیوی گوندی سەراوی ماوەت، کە گوندەکەی خۆمان بوو، لێرەدا دەبێ ئامازە بەوەبدەم چۆن بە ناو ئەو هەموو هەقلی ئەلغامەدا دەرباز بوین..

ئێمە لەدوای ئەنفال زۆربەمان دەورەی هەندەسەمان بینیبوو، کە توشی هەقل دەبوین تەلی مینەکەمان بەکەتەر دەقرتاندو دەرزی ئەلغامەکەمان دەردەهێنا و وەکو خۆی دامان ئەنایەوە. بۆ ئەوەی دوژمن فەرقی پێ نەکات، هەژێکمان لەدوای خۆمان رادەکێشا بۆ ئەوەی شوێن پێمان دیار نەبێت..بۆ پێش هەتاوکەوتن گەیشتینە گوندی سەراو، ئەو رۆژە هەتا ئێوارە خۆمان حەشاردا، بۆ شەو پشوومانداو بەیانی رۆژی دوایی لەو ناوەدا ماینەوە، رۆژی سێیەم دەبوو بگەرێین تا بزانین ئاخۆ دوژمن لەکوێیە، بەرنامەیەکمان دانا پێشمەرگەکانمان کرد بە دوو رەتڵ

. رەتلی یەکەم : شەهید حاجی سەرپەرشتی دەکرد ...

. رەتلی دوەم : خۆم (خاڵە سەراوی) سەرپەرشتیم دەکرد..

هەر رەتڵەو شوێنی خۆی قایم بکاو چاڵ هەڵبکەنێ و خۆیانی تیا حەشاربدەن، ئینجا بگەرێن و زانیاری لەسەر دوژمن کۆبکەنەوە ، لەرێگەی بێتەلەوە زانیاری بدەن به م.س (ی.ن.ك) بەو حالە بۆماوەی حەفتەیەك ئاوا گوزەراندمانکرد، ئینجا کە خواردن خەریك بوو نەمێنێ بیرمان لەوە کردەوە چۆن خۆمان رابێنین لەسەر کەم خواردن، بەندە بەرنامەم دانا کە هەر پێشمەرگە یێك ژەمی یەك نان بخوات و یەك چا

بخوات و یەك کلۆ شەکر بە چاکەوە بخوات، بیرمان لەوەکردەوە کە دەبێ گۆشت پەیدا بکەین، بەهۆی چۆلی گوندەکانەوە ئاژەلی کێوی زۆربوو، هەروەها هەنگیش زۆربوو، هەنگوین زۆربوو، میوە زۆربوو، سودی زۆرمان لێیان بینی..

ئینجا رۆژانە دەکەوتینە جەولەکردن، لەدوای دڵنیابوون لە ئارامی ناوچەکە، (م.س)مان ئاگادارکردەوە کە ژمارەی پێشمەرگە زیادبکرێ ،چونکە ناوچەکە فراوانەو شوێنی چەند مەفرەزەیەك دەبێتەوە، دیارە ئەم هێزە کە لە خوارەوەبووین واتا مەفرەزەکان پێویستیان بە خۆراك ئەبوو..بیرمان لەوە کردەوە کە ولاخی رەبایەیەکانی دوژمن بفرێنین، یەکەم جار لە سەربازگەی ناحیەی باسنێ دووانمان لێیان فراند، زۆر سودمان لێ وەرگرتن، بۆ گواستنەوە پێداویستییەکانی خۆمان، بۆ ئەوەی لە سنووری ئێرانەوە خۆراکیان پێ بهێنین بۆ خوارەوە، ئەمە فکرەیەکی زۆر باش بوو، ئیتر بریار درا کە ژمارەی پ.م زیادبکرێ، دەبوو ئەو مەفرەزانە ئەرکیان چیبووایە لەرێگەی ئەو ولاخانەوە:

. ئازوقەو پێداویستبمانییان دەگوێزایەوە بۆ خوارەوە،بەوەندەوە نەوەستان سەرکردایەتی چەند ولاخێکیان بۆمان کری.. هەر حەفتەی شەوێك، مەفرەزەیەك چواربار ئازوقەی لە هەموو جۆرەکان دەهێنایە خوارەوە، لێرەدا دەمەوێ رۆلی پێشمەرگەی قارەمانەکانی بەتالۆنی کەرکوك بەرز بنرخێنم، وەکو خۆی هەقی خۆیان پێبدەم کە چەندە ماندوو بوون پێمانەوە،بۆ ماوەی یەك مانگ زیاتر بەناو ئەوهەموو رەبایەو سەربازگەی دوژمندائەو هەموو هاوکارییەیان گەیاندۆتە ئێمە..

ئەوجا بیرمان کردەوە کە دەبێ ئازوقەیە بشارینەوەو بۆ داهاتوو پاشەکەوتی بکەین، بە شانازیەوە باسی دەکەم کە بیرۆکەی من بوو،بیرم لەوە کردەوە کەلەسەربازگە چۆلەکانی کاتی شەری ئێران ئێراق کەرەستەیەکی زۆربەجێ مابوو، وەکو قاپو قاچاخ و بەرمیلە نەوتی خاڵی..پێشمەرگەکان ٣ بەرمیلیان کۆکردەوە و

هەموو دانەیەك لە هەموو جۆرە خۆراكێك تێمان كرد، بە دوری یەك كیلۆمەتر مەسافە شاردماننەوە، بەم شێوەیە توانیمان ۳تەن ئازوقە تاقەت بكەین،بەڵام ئەوە ئازایەتی پێشمەرگەی قارەمانەكانی بارەگاكانی سەرسنوربوو،توانییان بە ناو ئەو هەمووسەربازگانەی(ئێران . ئێراق)دا ئەوهەموو پێداویستییانە بگەیەننە خوارەوە، ئێمەئەگەرچی چەندنوقتەیەكی بچوكمان هەبووشاراوەبوون،بەڵام بەباشی چاودێری دوژمنمان دەكرد،بە پێچەوانەوە ئەوان ئێمەیان نەدەبینی، هەرچەند دوژمن دەوری دابوون بەرەبایەوسەربازگەبەبەردەوامی دەگەڕاین بەشاروشارۆچكە چۆلكراوەكاندا، زانیاری تەواومان لەسەردوژمن كۆدەكردەوەو دەمانگەیاندە (م.س)ی بەڕێز، هەروەها چونمان بۆ ناوشارەكان بە تایبەتی بۆشاری سلێمانی و پەیوەندی كردنمان بە رێكخستنەكانی ناوشارەوە و هاوكاری یەكتر لە هەموو رویەكەوە..

بیرەوەریەكانی سەردەمی پارتیزانیم لەگەڵ هەڤاڵەكانم بە مانای كەلیمە تاڵ و شیرین بون، جا دەبێ شیرینەكانی چیبن و تاڵەكانی چیبن، تاڵی ئەو رۆژگارانە دور بوون بوو لە كەسوكارو كۆرپەو جگەرگۆشەو دایك و باوك دووری لە ژیانی مرۆڤایەتی كە ئینسان لەسەردەمی لاویدا هەوڵی بۆ ئەدا بەلام ئێمە دووربوین لەو بەها پیرۆزەی ژیانی مرۆڤایەتی بەلام پێشمەرگە كە ئەركی تری لە ئەستۆ بوو ئەویش ئەركی پیرۆزی رزگاری نیشتمان نەتەوەكەمان بوو..

شیرینیەكانیشی ئەمانە بوون خۆشەویستی خاك وگەل و ئازادی و سەربەستی و خۆشەویستی ئەوهەڤالانە و ئەو ئامانجەی هەوڵمان بۆ ئەدا ئەمانەهەمووی جوان و شیرین بوون، بەلام راستە ئێمە هەموو تەمەنی خۆمان سەرفكرد لەوپێناوەدا ئەوەش جێگای شانازی بوو. رۆژێك لەگەل شەهید حاجی سەراویدا چوین بۆراو بۆ خۆراكێن بۆخۆمان و هەڤالەكان پەیدابكەین، كە ئێوارە گەراینەوە بۆ گوندی سەراو لەناو چەمدا دەنگەدەنگ دەهات، وتم حاجی وابزانم ئەوە عەسكەرییە، ویستمان

دووربکەوینەوە، دوای بینیمان بەراز بوون، دەرۆشتنە خوارەوە، لەو شوێنەدا دوو ئاشی ئاوی کۆنی گوندەکەمانی لێبوون، خۆمان گەیاندە ئاشەکەی خوارەوە، هەر هەمووی کە ژمارەیان ٢٠دانە ئەبوون، دەستمان کرد بە تەقە لێیان لەئەنجامدا ١١دانەمان لێ کوشتن. کە ئەوەش دەسکەوتێکی باش بوو بۆئەو سەردەمە(ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکات) ئیتر هەمومان کرد بە قاورمە، کەبەشی ماوەیەکی زۆری کردین، بۆیە دوای ناویان ناین' پارتیزانە بەراز خۆرەکانی شاربازێر، هەتا ئێستاش هەر بەو ناوە مەشهورین ..

## ـ یەکێکی تر لە بیرەوەریەکانم

جارێك لەگەڵ عبدولرەحمان شاناخسێی چوین بۆموعەلەباد کە لەرێگادا جێمابوون لەبناری گمۆی سەراو لەناو سەربازگەدا خەریکی کۆکردنەوەی شتەکان بوین، لەپڕ دەنگی سەیارەیەك هات.رەحمان هاواری کرد وەرە دەرەوە... وتم چیە..؟

وتی گیراین وتم تەقە نەکەی.. رام کردە دەرەوە،کە سەیرم کردسەیارەی جێب قیادە پرە لە سەرباز،ئەفسەرێك لە پێشەوە دانیشتووە، لەدوری ٢٠مەتر تێپەڕین، بەلام ئەوان زۆر قسەیان ئەکرد، ئاگایان لە ئێمە نەبوو، ئێمەش خۆمان دا بە زەویدا، چونکە نەمان ئەتوانی خۆمان بگەیەنینە ناو کۆنە رەبابیەکە، سەیارەکە چووە پشتی جادەکە.کەزۆر لێماوە نزیك بوون، ئێمەش خۆمان ئامادە کرد بۆ روبەروبونەوە، سەیرمان کرد هەمویان بە دوربین سەیری گوندی سەراویان ئەکرد، هیچ جمووجولێکیان نەبینی ،هەربۆیە سواری سەیارەکە بوون چون بۆ(موچەی شەکراو) بۆ گوێزو میوە کردنەوە، ئێمەش موراقبەمان ئەکردن ، ئەمە ئەگەر بیری لێبکەیتەوە زۆر ناخۆشە بەلام لەهەمان کاتدا خۆشبوو چونکە دوژمن وا حسابی دەکرد کە جارێکی تر پێشمەرگە زاتی ئەوەی نیە بێتەوە کوردستان.



## بیرەوەریەکی تر
## لەگەڵ کاك (سەید ئەحمەد ماوەتی)

رۆژێك لەگەڵ چەندمەڤالێکی ترداچووین بۆگوندی بەربەرد،نزیك شارۆچکەی ماوەت،وابزانم مانگی ١١/١٩٩٠بوو،مەبەستمان جەولەکردن وزانیاری کۆکردنەوە بوو لەسەر هێزەکانی دوژمن، کە ئەو کات ماوەت چەندین سەربازگەی سەربازی لێبوو،بە رۆژ خۆمان حەشارئەدا بۆشەویش چوینە ناو ماوەت، ئەوسا چۆلکرابوو، لەوێشەوەچووین بۆ ئەشکەوتی بەربەرد کە پێی دەلێن ئەشکەوتی گاجووتان بۆ ماوەی٣رۆژ و٣شەو ماینەوە لەخوار ئێمەوە سەربازگەی باساوێی لێبوو، لەدووری ١کیلۆمەتر کەزۆرچرو دارستانە شوێنێکی زۆرقایمە، گوندی باساوێ دەکەوێتە ئەوبەری ماوەت دیارە دوژمن قەناعەتی نەدەکرد کە پێشمەرگەی ی.ن.ك ئەوەنە جورئەت بکەن کە بتوانن بگەڕێنەوە بۆخاکی کوردستان، بەلام بە پێچەوانەوە کە٥٠٠ مەتر دوربوین لەوێوە، ئەو چەمە بە هاوین زۆرساردە، جادەبێ بە پایز چەند ساردبێ ، لەدوای ئەوەی دلنیا بووین کە دوژمن لەکوێیە کەوتینە گەران بەدوای راوەماسی ماسیەکی زۆرمان راوکرد، ئەو رۆژە تا ئێوارە هەر ماسیمان خوارد، بۆرۆژی دوای من و خالە سەید ئەحمەد بەرنامەی راوی حەیوانە کێویمان دانا، کەهەر خۆم و خۆی بچین بۆ راوەکە، خالە سەید چوە ناو روانگەکەوە، تەنیا ٥٠م لێمەوە دوربوو، وتی حەیوانەکان گەربێنە خوارەوە بۆ ئاوخواردنەوە لای تۆوە دێنە خوارەوە، وتم باشە خەمت نەبێ سەعات ٤ی ئێوارە کاتێك سەیری سەرەوەم کرد..

بینیم 20 سەر حەیوان هاتنە خوارەوە، هاوارم کرد خالە سەید هاتن، تەقەم لێکردن، بەلام بێسودبوو، راوەکەم لێتێکدا، ئیتر هات بۆلام وتی خالە قەت راوت کردوە.؟ وتم نەخێر وتی خوابتکا بە قوربانی خۆت کە قەت راوت نەکردووە ئەگینا هەر لێرە دەمکوشتی، ئیتر سەربازەکانی رێی گوندی باساویَ کەوتنە تەقە کردن، هەتا بانگی مەغریب بێدەنگ نەبوون، بۆ رۆژی دواتر قەدەر وایکرد کاك سەید ئەحمەد نەخۆشکەوت،هەربۆیە لە سەعات ٩ی سەرلەبەیانی بەرێکەوتین گەراینەوە بۆ شوێنی خۆمان، بەلام چوینە سەرجادەی ماوەت سلێمانی لەخوار جادەکە شیوودۆل بوو، لە پردا ٢ ئیڤای سەربازی هاتن، کە پڕبوون لە جوندی، ئێمەش هەر ئەوەمان پێکرا خۆمان خستە شیوەکەوە، سەیارەکان بەهەورازەکەدا سەرکەوتن بۆ پشت ماوەت، خالە سەیدیش زۆر هیلاك بووبوو. منیش وتم برادەران با کەلوپەلەکانی بۆ هەلبگرین، بەلام نەیهیشت،چونکە دەیزانی ئێمەش هیلاکین، بەهەرحال لێمان وەرگرت و رۆیشتین بەرەو گوندی سپیداریَ لە پشتی ماوەت، لەرێگا وتم با پشوو بدەین، لەبن رەزێکی گوندەکە پشوماندا، شەو ٢٠سم بەفر باریبوو، کەسەیری رەزەکەم کرد ئەوا تریَ لەژێر بەفرەکەدارەش دەچێتەوە. هەنێکمان لێکردەوەئەوجا گەراینەوە بۆ شوێنی خۆمان..

سلاو لە شەهید مجید ماوەتی کەلەو جەولەدا لەگەلمان بووکورێکی زۆر ئازاو قسەخۆش بوو

. لە رۆژی ٢١/١٠/١٩٩٠ سەعات ٤ی سەرلەبەیانی بەرێکەوتین بۆسەر شاخی (گمۆ) چوینە ناو رەبابیەکانەوە کە سەیرمان کرد چوار فەردە ئاردی تیابوو، کە هی پاشماوەی سەربازی ئێراق بوو چونکە ئەو ناوچانەی دوژمن چۆلی کردبوون بەهۆی شەری کوێتەوە، هەتا دوای نیوەرۆبەسەر شاخەوەخۆمان راگرت، ئاردەکەمان لە رەبابیەکەدورخستەوەشاردمانەوە،بۆرۆژی دوایی کەسەیری دەشتی هەزارکانیانمان

کرد ، ٣ ولاخە بەرزە لەناو مێرگاوی هەزارکانییان دەلەوەڕان ،چوین بۆیان چونکە زۆر باش بوون بۆ ئێمە ؛ پێشمەرگە بووین( شەهید حاجی سەراوی شەهید تەحسین گۆمەیی سەرداره سوور و بەندە خالە سەراوی) زۆر هیلاك بوین، یەکێکیان لوغم قاچی پەڕاندبوو، ئەوەی تریان زۆر پیربوو، بەلام دانەیەکیان باش بوو، هەرچۆنێك بوو هێنامان ، بەلام دوانەکەی تر هەر هاتن بەدواماندا زۆر گوناح بوون، هەتا ئەوەمان کرد سەعات بوو بە دووی دوای نیوەرۆ، بەرێگادا دەرۆیشتین شەهید حاجی وتی برایان دەزانن کە عەسکەرییە چوە بۆ گوندی سەراو من وتم بروا ناکەم، حاجی شارەزابوو لە سمی ولاخە بەرزە بەتایبەتی سمی ولاخی عەسکەری دوای ئەوە بەرەودوا بە جادەکەیا گەراینەوە بۆ دیوی سەراو شەهید وتی من پێشدەکەوم سەردارە سور تۆش رەشمەی ولاخەکە بگرەو تەحسین تۆش لەدوای خالەوە وەرە بە دوامانا بەدوریەکی ١٠م لەپرێکا حاجی هاواری کرد وتی خێرا وەرن ، من و تەحسین رامان کرد ٣ سەرباز بەچەکەوە بەرەو روی حاجی دەهاتن تفەنگی لێ راکێشان وخەریك بوو تەقەیان لێبکات، سەربازەکان دانەیەکیان سواری ولاخێك بووبوو، دوانەکەی تریان لە دواوە بوون ئێمە هەلمەتمان برد و خێرا داوای تەسلیم بونمان لێکردن، شەهید تەحسین عەرەبی ئەزانی، هەرسێکمان چەك کرد، پرسیارمان کرد ئێوە چەن کەس بوون..؟ گوتیان چوار کەس، کە سەیرمان کرد چوارەمیان سەربەرەو ژێر رای ئەکرد، منیش دوای کەوتم و گرتم، چەکەکەم لێ داماڵی، لەرێگا گوتی من مەکوژن من کوردم،هەر چواریان وتیان ئێمە ناچارین لەبرسان هاتوین بۆ گوندی سەراو دیارە ئەو سەربازانە لەسەربازگەی گوندی باسنێوە هاتبوون گوێزو میوە بەرنەوە بۆ سەربازگەکە، ئەوسا بە بریاری (م.س ) بەرنامە وابوو هەر پیاوێکی رژێم بگرین نەیکوژین، ئیتر کوردەکە بوو بە موتەرجیم شەهید حاجی زۆر قسەی بۆ کردن، لەبارەی شۆرشی کورد و چەوسانەوەی کورد

بەدەستی رژێمی فاشی بەغدا.. بۆی رووکردەوە کەکورد دوژمنی عەرەب نیەو کوردو عەرەب بەسەدان ساڵە لەگەل هەموو نەتەوەکانی تر بەیەکەوە دەژین، بەڵام بەداخەوە کە عەرەب زۆر بێوەفایە بەرامبەر بە کورد، ئیتر هەر تەقەی سەریان ئەهات بروایان نەدەکرد، وایان دەزانی ئێمە چەکداری رژێمین، چونکە من ئەو رۆژە جلی سەربازیم لەبەردا بوو. نایب عەریفەکە گوتی قەشمەریمان پێمەکەن ئێوە پیاوی سەید رەئیسن ، ئەم خاکە هی ئێوە نیە، چونکە ئێوە سالی ١٩٧٨پارەتان وەرگرتوە زۆرمان لەگەل وتن فایدەی نەبوو، دواجار شەهید حاجی ناسنامەکەی دەرخێناو دایە دەستی کوردەکە بۆیان بخوێنێتەوە کەناوی مەجید عیرفان ئەحمەد بوو، ئیتر کە زانیان ئێمە پێشمەرگەین رەنگیان زەرد هەلگەرا، کەوتنە پارانەوە ،گوتیان تکایە مەمان کوژن ،حاجی گوتی خەمتان نەبێ ئێمە شۆرشگێرین دیل ناکوژین، بەهەرحال خەریکبوو بمرن لەبرسان، نانمان دانێ ، نانیان خوارد، کە بێخەم بوون نایان کوژین سوپاسیان کردین، دوای گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن دەرزی تفەنگەکانمان دەرهینا چەکەکانمان دانەوە، نایب عەریفەکە زۆر پارایەوە بەکوردەکەی وت پێیان بلی ئەگەر بگەرێینەوە ئەمانکوژن، ئەلێن کوا دەرزیەکان و ئەلێن داوتانە بە موخەریب دوای پێمان دانەوە بەلام فیشەکەکانمان لێسەندن بارە گوێزەکەمان بۆ بارکردن بەو ولاخەی کە پێیان بوو خواحافیزیمان لێکردن و دوای کوردەکە وتی ئێوە بۆکوێ ئەچن ئێمە گوتمان ئەرۆینەوە بۆ سنووری ئێران، نەمان گوت لێرە مەقەرمان هەیە، ئەوانیش وەعدی شەرەفیان بە ئێمە دا کە لەمەودوا ئەگەر پێشمەرگە ببینن تەقەی لێ نەکەن، بەلکو هاوکاریشیان بکەن، ئێمەش وەعدمان دانێ کە هەرکاتێ ویستیان بێن بۆ خۆراك هاوکاریان بکەین، ئەوان گوتیان : ئامر لیوا داوامان لێ ئەکا کە بێین بۆ شت، دوو بەشی بۆ ئەو بێ بەشێکی بۆ ئێمە..بەلام بەداخەوە وەعدەکەیان نەبردبووە سەر، شەو کە رۆشتبونەوە بۆ مەعەسکەر لە

ئیستیغباراتی لیوا وتبویان ئەمرۆ موخەریبمان بینیوە ئێمە بەوە زانیمان بۆ شەوی دوای جوندیەکی کورد کە تەنزیمی یەکێتی بوو بە ناوی صدیق لە باسنێوە رایکردبوو بۆبارەگای بەتالێیۆنی ۷ لەوێ لە هەڤاڵ ماوۆستا جەمال حاجی محەمەد فەرماندەی بەتالێیۆنی ۷ی پرسیبوو: ماموستا جەمال پێشمەرگە هەیە لە دیوی شارباژێر ئەویش گوتبووی: بەلێ

ئەویش گوتبووی ٤جوندیان گرتوە و ئازادیان کردوون، دەپرسێ چۆن زانیوتە..؟ ئەلێ ئەوان ئیخباری پێشمەرگەکانیان کردوە، بۆ شەوی دوایی ماموستا بە بێتەل پەیوەندی پێوەکردین پرسی لەشوێنی خۆتان ماون.؟ گوتمان بەلێ ، گوتی ئیخباری کراوون، ئاگاتان لەخۆتان بێ، بۆیە هەر لەسەر قسەی ئەو جوندیانە حکومەت لە چوار لاوە لە باسنێوە بۆ بناری گمۆ لە کەناروێ بۆ گوندی گردەزبێر لە چوارتاوە بۆ گوندی قوتابیان لە کێلێ وە بۆکورەداوێ .کێومالێکی بۆ کردین، مەفرەزە یەکمان بەسەرپەرشتی هەڤاڵ وەستا فاروق توشی شەرو پێکدادان بوون، لە ئەنجاما ۲ جوندی دەکوژران و پێشمەرگە قارەمانەکان بێ زیان بوون، دواتر بە بەرنامەیەکی رێکوپێك ئەو ناوەیان بەجێ هێشتبوو، بۆ ئێوارەکەی لە لای ئێمەوە کردی بە بەفرو باران بەهۆی سەرماوەجەیش نەیتوانی زیاتر بەدواماندا بگرێ، هەربۆیە پاشەکشەی کرد بۆ باسنێ، ئێمەش سەلامەت دەرچوین...

یەکێکی تر لە بیرەوەریەکان، رۆژێك بەرەو گوندەکانی کورەداوێ و کونجرین و کێلێ رۆشتین بۆئەوەی بزانین کەدوژمن جموجۆلی هەیە لەسەر جادەی سورەقەلات و ماوەت شەوێکی زۆر سارد بوو مانگی ۱۲بوو سالی ۱۹۹۰بەفر دەباری شەو کە گەراینەوە بەرەو کورەداوێ لەرێگا لاماندا بۆئەوەی پشوو بدەین ئاگرمان کردەوەو لە سەعات ۲ی شەو لەبەر ئاگر لە خانوەکە بەربوو بەپەلە وتم هەستن بابرۆین چونکە ئەگەر نەرۆین دوژمن بزانێ تووشی کێشە دەبین هەر بەو شەوە گەراینەوە

شوێنی خۆمان کە ماوەی ٢ سەعات زیاتر بوو بەو سەرماو بەفرە ئەمە یەکێکی تر لەناخۆشترین ڕووداوەکانی ژیانی ئێمەبوولەسەردەمی خەباتی پێشمەرگایەتیمدا.. . لە شەوێکی ساردی ڕەشەبایدا لە١٩٩١/٢/٢٤ لەگەل ٢ خزمی خۆم بە ناوەکانی سەلام ڕەشید ئەحمەد و ئازاد عبدولرەحمان کە لە شاری سلێمانی لەدەست رژێمی فاشی ئێراق رایان کردبوو بەرەو بانەی ئێران بەرێکەوتین لەگەل شەهید مەجید ماوەتی بردمانن بۆ ئێران ٦ی ئێوارە بەرێکەوتین لە گوندی سەراو بۆ سەر چەمی چۆمان لەوێشەوە بۆ گوندی کیوەرۆ بۆ بارەگای بەتالیۆنی ٦ ی کەرکوك بۆ رۆژی دواتر بەرەو بانە بەرێکەوتین لەوێ ٢شەوماینەوە ئەو ٢ برادەرە چون بۆ بارەگای بلەکێ کە بارەگای بەتالیۆنی ٧ی لێبوو لە بانە ئیشو کارەکانمان تەواو کردو دەبێ بگەرێمەوە بۆلای برادەران بۆ شاربازێر لە شەوی ١٩٩١/٢/٢٦ لەگەل یاسین عبدولا سەعید ناسراو بە یاسین شاناخسەیی دوای نیوەرۆی ئەو رۆژە لە بانەوە هاتین بۆ بارەگای بەتالیۆنی ٦ی کەرکوك بۆ ئێوارە گەیشتینە کیوەرۆ ئەو شەوە زۆر سارد بوو لە بارەگا نانمان خواردو وتم کاك سیروان کە فەرماندەی بەتالیۆنی ٦بوو ئێمە بەتەماین برۆین بۆ دیوی شاربازێر چونکە هەڤالەکانمان چاوەرێی ئێمە ئەکەن لەبەر ئەوە ئەبێ برۆین ، هەڤال سیروان گوتی مەرۆن ساردە ئەمشەو بەفر ئەبارێ ئێمە ئینکاریمان کرد لەبەر برادەرەکانمان کەبەجێمان هیشتبوون چونکە من برا بچوکی ئەو پێشمەرگانە بووم لێیان بەرپرسیار بووم، کاك ئەحمەد کرێکار وتی ئەمشەو ناگەنە شوێنی خۆتان ساردە مەرۆن بەلام کاك سیروان وتی گرەو ئەکەین لەسەر قاتێك حل کە ئەتوانن برۆن کە خالەو یاسینم ناسیبێ ئەتوانن بگەن ئێمە رۆشتین دوای وتم کاك سیروان کە گەیشتین لەرێگەی بێتەلەوە هەوالت پێ ئەگەیەنم سەعات ٩ گەیشتینە لای هەڤالەکانمان یەکسەر بە بێتەل کاك سیروانم ئاگادار کرد کە گەیشتوین وتم کاك سیروان تۆ براوەی کاك ئەحمەد گرەوەکەی

دۆراند لە کۆتاییدا کاك سیروان وتی قوربانی ئەو دایکە بم کە ئێوەی لێبوە سوێنمان خواردبوو کە نامێنن لەسەرما رەق ئەبنەوە کە بەرێکەوتین چوینە سەر چەمی چۆمان بەدزی حکومەتی ئێران وئێراق کە چوینە سەرچەم بوارەکەمان لێتێکچوو من کەوتمە ناو چەمەکەوە هەموو گیانم تەر بوو خۆم گەیاندە ئەوبەر چەمەکە یاسین هات بەدواما وتی کاکە با بگەرێینەوەبۆ کیوەرۆ تۆ هەموو گیانت تەر بووە من ئینکاریم کرد نەگەراینەوە بەرەو روی رەبایەکانی ئێراق رۆشتین چوینە موچەی سەربەستان سەر بە گوندی مەرویَ سەگەکانی سەربازگەکە هەستیان پێکردین چونکە سەربازگەکە ٥٠م لە رێگاکەوە دوور بوو لەو کاتەدا پسکیتمان لە گیرفاندا بوو کە سەگەکان هاتن بۆمان پسکیتم بۆ هەلدان و خواردیان و تۆزیَ لە دەورەمان مانەوە و گەرانەوە تا بە راکردن خۆمان گەیاندە گوندی شاناخسیَ کە گوندەکەی کاك یاسین بوو لەدوای راگواستنی گوندەکان مامی کاك یاسین شەهید عەلی خانویەکی دروست کردبوو بە دار خۆمان گەیاندە ئەو خانووە و نەدیو بوو لە سەربازگەکانی ئێراقەوە تەمو مژ بوو بەفریش ئەباری ئیتر زۆپای داری تیابوو حکومەت پێی نەزانی بوو کە خانووە کە وەکو نوختەیەکی رەیسی ئێمە وابوو هەتا سەعات ٣ی شەو لەویَ ماینەوە پاشان رۆشتین چوینە بناری گمۆ لەوێش خانویەك هەبوو کە هی شەهید مەحمود شاناخسێی بوو لەوێش ئیسراحەتمان کرد چونکە رۆژمان لیَ ئەبۆوە سەعات ٤ بەرێکەوتین بەفریش هەر ئەباریَ بۆ ٩ی بەیانی گەیشتینە گوندی سەراو لەبەر ئەوەی گمۆ بەفری زۆری لیَ ئەباری ٣ سەعاتمان پێچوو تاگەیشتینە لای برادەران.

## پێش راپەڕین

لە ١٩٩١/١/١٢ دوو مانگ و نیو پێش راپەڕین هەڤاڵ تەها ماوەتی و هەڤاڵ خالق ماوەتی و شەهید مجید ماوەتی ناردمن بەرەو لای ماوەت، ئاخۆ جموجوڵی دوژمن چۆنە، زانیاری لەسەر دوژمن وەربگرن..بۆ ئەو رۆژەی کە هاتنەوە ٦کەس بوون وتمان ئەمانە چین لەگەڵتان..؟

گوتیان جاشن لە شارۆچکەی ماوەت گرتومانن،خۆیان گوتبوویات ئێمە جاشین، ٣ پارچە چەکیان پێبوو. زۆرمان لێ پرسین هەر وتیان جاشین،دواتر دانیان بەوەدا نا کە ٢ کەسیان پ.م سازمانی خەبات وخەڵکی بانەی ئێرانین، گوتیان کەسی سێیەم جاشە، لەگەل ئێمە دێ بۆ ئێران و ناوی (نەورۆز)ە، بێ سیمم کرد بۆ سەروو خۆمان وتیان با ئەو برادەرە لای خۆتان بمێنێتەوە .. ئەو٢ ئێرانیەکەش بەر بدەن، چەکەکانیان بدەنەوە و لەکۆل خۆتانیان بکەنەوە، ئەوان بەرەو ئێران رۆشتن و نەورۆز لای خۆمان مایەوە، ئیتر رۆژانە قسەمان لەگەل ئەکردو چاودێریمان ئەکرد، رۆژێکیان گوتی: خاڵە سەراوی من خەلکی کەرکوکم ،باوکم نایب زابتە خانەنشینە ئێستا ماڵمان لە سلێمانییە، وتم ئەو دوو برادەرەت چۆن ناسی.؟گوتی هاتوچۆی ماڵی ئێمەیان ئەکرد، وتویان ئێمە ئەچینەوە بۆ ئێران تەسلیم ئەبینەوە ،تۆش وەرە لەگەڵمان بۆ ئێران زۆر خۆشە منیش زۆر حەزم ئەکرد بێمە دەرەوە وببم بە پێشمەرگە،بەلام نەمدەزانی چۆن بگەمە پێشمەرگە، ئێستا من جاشم بەلام دەمەوێ ببم بە پێشمەرگە..ئێمەیش کردمان بە پێشمەرگە وخستمانە ژێر موراقەبەوە، هەتا جوان لێی ئەمین بووین.دواتر کە زانیمان ئەم کورە زۆر باشە، قسەمان بۆ دەکردو باسی شۆرشمان بۆ دەکرد هەتا وای لێهات بەتەواوی لێی دلنیا بووین، هەتا راپەرین لەلامان مایەوە. لەدەسپێکی راپەڕینەکە یەکسەر داوای بیکەسی لێکردین، زۆرکورێکی بە تاقەت ئازا بوو، تا رزگارکردنی کەرکوك و گەرانەوە بۆ سلێمانی لەگەڵمان بوو،بەداخەوە ئەورۆژەی کەسلێمانی چۆلی کرد،لە روبەروبوونەوەیەکدا لەگەڵ عەسکەرو قوات خاسە،لەسەر جادەی٦٠مەتری، لای پردەکەی دەباشان پاش شەرێکی قارەمانانە شەهیدبوو، بووبە سومبولی راپەڕین..



# پارتیزانی دوای ئەنفال

## ئەیوب ڕەشید خورشید ناسراوبە(چیا)

. ساڵی1959لەگوندی(حاجی جەرجیس)ی ناحیەی شوان،لەبنەماڵەیەکی جوتیاری نیشتمانپەروەری چاوی بۆژیان هەڵهێناوە.

. لەساڵی 1975چۆتە بەرخوێندن لەقوتابخانەی گوندی( ناپروجە)ی گەورە، بەڵام لەهەمان ساڵدا بەهۆی شەڕکردن لەگەڵ منداڵێکی هاوتەمەنی خۆی ڕەحلەیەکی خوێندنگایەکەی لەدەست دەشکێ ،لەترسی مامۆستاکان نەچۆتەوە بۆقوتابخانە..

. ساڵی 1978کەلەگوندەکەی خۆیان قوتابخانە دەکرێتەوە،دەچوێتەوە بەرخوێندن قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی لەگوندەکەی خۆیان تەواودەکات ، بۆخوێندنی قۆناغی ناوەندی چۆتەگوندی(ناپروجە)یگەورە،پۆلی یەکەمی ناوەندی تەواودەکات، پاشان چۆتە نەحیەی شوان بۆئەوەی دریژە بەخویندن بدات..

. لەساڵی 1985وە پەیوندی کردووە بەڕێکخستنەکانی یەکیتی نیشتمانی کوردستانەوە ، پاش ماوەیەك لەبەردەوام بوونی لەخویندن، ڕۆژێك برادەرێکی باوکی پێی دەڵێ: کوری خۆم وام پێ باشە چیتر بۆخوێندن نەیەیتەوە(نەحیەی

شوان) لەبەرئەوەی ئەتگرن، بۆیە لەقۆناغی دووەمی ناوەندی بەهۆی ئاشکرابوون لەکاری ڕێخستن واز لەخوێندن دێنێ..

. لەساڵی 1985حکومەتی بەعسی شۆڤێنی لەدرێژەی سیاسەتی (تەعریب و تەبعیس و ڕاگواستن) بڕیاری دا سەرجەم خوێندنگای گوندەکانی کوردستان دابخات ، بۆئەوەی نەوەکانی گەلی کورد لەزێدی باب و باپیرانیان نەتوانن درێژە بەخوێندن بدەن، بەهۆی کارە قێزەونەکانی ڕژێمەوە کەدە رەهەق بەگوند نشینان پیادەیان دەکرد وەك چۆڵکردن و خاپورکردنی گوندەکان سوتانی ڕەزوو باخەکان، گوندی(حاجی جەرجیس) سێ جار لەلایەن ڕژێمەوە سوتێنراوەو تالاّنکراوە لەسالاّنی 1953، 1974، 1987

. ساڵی 1985چەکی شەرەف و پێشمەرگایەتی کردۆتە شان لەتیپی (93) کۆیەو پاشان تیپی( 29)کەلکەسماق..

. لەساڵی 1987کەرژێم بڕیارێکی دەرکرد بۆچۆڵ کردن و وێرانکردنی سەرجەم گوندەکانی کوردستان و بڕینی سەرچاوەی یارمەتی و هاوکاری پێشمەرگە، کەخەڵکی گوندەکان وچیاکانی کوردستان باشترین پەناگەو پشتیوانی هێزی پێشمەرگەبوون.

. لەساڵی 1988ڕژێمی بەعس هێرشێکی دڕندانەی بەناوی (ئەنفال)کردە سەر خەڵکی کوردستان،لەدرێژەی قۆناغەکانی پرۆسەکەدارژێم چەکی کیمیایی لەچەند ناوچەیەك وەك(هەڵەبجە،گۆپتەپە،بالیسان،شێخ وەسان وسێوسێنان..) بەکارهێنا.

## مانەوەی هەڤاڵ ئەیوب وهاوڕێکانی

هەستی نەتەوایەتی و وورەی پۆلاّینی پێشمەرگە، ئەوهەستە لای خۆی هاوڕێکانی دروست دەکات، کەتادواساتەکانی ژیان بمێنینەوەو بەرگری بکەن،لەسنووری گوندەکانی بناری خاڵخالاّن و شوان و شێخ بزێنی دەمێنێنەوە، ڕۆژێکیان پێیان

ڕادەگەیەنن کەئاگاداری خۆیان بن.چونکە جاش نیازیان وایە بێنە سەریان، بۆرۆژی دووەم پێش نیوەڕۆلەبەرزایەکانی دەوروپشتیانەوەنەفەرێك دەردەکەوێت، سەرەتا وادەزانن کەمەفرەزەی جاشە هاتونەتەسەریان ،بۆبەرگری لەخۆیان و ئەوخێزانانەی لەسنورەکەبوون، سەنگەر دەگرن.بەلاّم ئەو خۆی پێ نەگیرێت ولێی نزیك دەبێتەوە، چەکی لێ ڕادەکێشن، ئەویش لەبەرخۆیەوە هەر خەریکی قسەی ئەکرد دەبێت، دواجار بۆیان دەردەکەوێت کەچەکی پێنیە، قسەی لەگەلّ دەکەن، پێیان دەلّێ:من خەلّکی مەنتیقەی گەرمیانم،کاتێك هەموومانیان لەزیلی عەسیکەری بارکردولەکاتی گواستنەوەمان بۆچەمچەمالّ خۆم لەزیلەکەوە فڕێ دایەخوارەوە، لەبەر ئەوەی دنیا تاریك بوو کەس نەمی بینی.نازانم ژن ومنالّەکانم چیان بەسەرهاتوە بۆکوێ براون؟ چۆنیش گەیشتومەتە ئێرە؟ ئێرەکوێیە؟ چەندڕۆژیکە لەوهەردانەوە بەڕێگاوەم، ئینجا بۆیان دەردەکەوێت ئەم پیاوە تەواو تێك چووە، چونکە هەرکەسێکی ئەبینی بەناوی خێزان و منالّەکانی خۆیەوە بەگریان و هاوارەوە بانگی ئەکرد،زۆر دلّیان پێ دەسووتێ و دەست دەخنە سەرملی ودلّی دەدەنەوە،دوای نانی نیوەڕۆ زۆر ڕێزەوە بەرەو گوندی مەرزیخە بەرێی دەخەن...

## مانەوە لە هەردەی نەیبەسەرو حەسەنقەباغ

## هەڤــالّ ئەیوب مام ڕەشــد بیرەوەری ئەو سەردەمە ئاوا دەگێڕێتەوە:

. لەوسنورەی ئێمە زیاترلە(25)خێزان مابوونەوە، هیچ ڕێگایەك نەمابوو بۆ دەربازبوونیان لەچنگی ئەنفال چیەکان،ئێمەش مەفرەزەیەك بووین، بڕیارماندابوو شەڕی مان و نەمان بکەین لە پێناویاندا، جێیان نەهێلّین تادەربازیان دەکەین، ئەوەی جێی سەرنج بوو بۆئێمە لەو کات و ساتەدا کەمیللەتی کورد لەلایەن ڕژێمی گۆڕبەگۆڕی بەعسەوە بەهاوکاری هەندێ جاش ومستەشارەوە ئەنفال دەکران ، کۆمەلّێك جاش لەڕەبیەکانی(بانی نەیبەسەرە و شیوە سور) بوون، بەفەرماندەی

(سید تاهیری گچکەی جباری) لەڕێگەی برادەرێکەوەپەیوەندیان پێمانەوە کرد،جوابیان ناردبووەزانین کە ناتوانن بەڕۆژ جمو جۆڵ بکەن، بەڵام بەشەو هەرچۆنێك لەم جادەوە بێن و بڕۆن خۆمان هاوکارتان ئەبین، ئێمەش وڵام مان دانەوە ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە ڕزگارکردنی ئەم عائیلانەیە کە لەم لاشیوو دۆڵانە ماونەتەوەو گیریان خواردووە، ئەوە بوو مەوعیدێکیان بۆمان دانا وتیان لەکاتژمێر(سێ)ی شەوبەدوارە چەند عائیلە لەوناوچەیە هەیە بۆمانیان بنێرن ئەگەرخۆشمان تیابچین ناهێڵین ئەوان تیابچن و ڕزگاریان ئەکەین، لەو کاتەدا بۆئەوانیش زۆر سەخت بوو کە هاوکاری دەربازکردنی ئەو عائیلانە بکەن، بەڵام بۆ مێژوو ئەیڵێم بەوپەری دڵسۆزییەوە هاوکاریان کردین،کەزیاترلە(25) عائیلە ئەبوون، لەکاتی دیاری کراودا ئێمە گەیاندمانە شوێنی مەوعیدەکەو ئەوانیش دەربازیان کردن، ئەوە جێگەی خۆشحاڵی بوو بۆئێمە کەتوانیمان هاوکاری ئەوعائیلانە بکەین،چونکە چواردەوری سنورەکە زۆر بەچڕی گیرابوو، هیچ ئەمەلێك نەمابوو بۆ ڕزگارکردنیان. بۆیە ئەو هەڵوێستەم قەت لەیاد ناچێت.

هەرچەند بارو دۆخەکە زۆرسەخت بوو،بەڵام من وەك پێشمەرگەیەکی پارتیزان هیچ دەربەست نەبووم. بڕیاری خۆم دابوو بەهێزوو هەستی کوردایەتی مل کەچی ئیرادەی بەعس و ئەنفال چیەکان نەبم، وەك و پێشمەرگەیەکی پارتیزان لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆمدا بمێنمەوە، تاله دەرفەتێکدا بەرەو سنورەکانی ئێران بڕۆم، بەمەبەستی بەردەوام بوون لەخەباتی ئەپساوەم لەپێشمەرگایەتیدا،ئێمە تەوجیهی عائیلەکانیشمان واکردبوو بڕۆن بەرەو سنورەکانی ئێران ، دوای فەترەیەك مانەوە بەپارتیزانی لەناوچەکەدا، بۆئێمەش زۆر سەخت بوو بە بێ نان و خۆراك لەسنورەکەدا درێژە بەکاری پارتیزانی بدەین ، ئەوەبوو لەدوایدا ئێمەش بەرەوسەر سنورەکانی ئێران بەرێکەوتین،لە سنور لەگەڵ عائیلەکانماندا یەکمان گرتەوە و

چوینە ناوخاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە،لە باروو دۆخێکی سەختی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی لەو ماوەیەدا ژیانمان دەگوزەراند، هەرچەندە باروو دۆخەکە پڕلە ئازاروو مەینەتی بوو، بەڵام بەهۆی بە هێزی هەستی نەتەوایەتی و ئامادە نەبوونمان بۆئەوەی سازش بۆ دوژمنی گەلەکەمان بکەین، بەرگەی نەهامەتیەکانمان گرت، پاشان گەیشتینە گوندی (ئاڵوەتان) لەنزیك شاری سەردەشت، لەوێ نیشتەجێ بووین، بەدوو سێ خێزان لەخێمەیەکدابووین، لەباروودۆخێکی پڕلەمەینەتی ولێوان لێو لە بەسەرهاتی ناخۆش، لێرەدا حەزدەکەم باسی چەند وتەیەکی بەنرخی باوکی شەهیدم بکەم : لەوڵامی پرسیارێکی کاك( احمدزامدار) کەنوێنەری یەکێتی بوو لەعبلاقات لەگوندی ئاڵوەتان.کاك ئەحمد پرسیارێکی لەباوکم کرد وتی: مام ڕەشید چۆن دەروانیتە ئەم باروو دۆخە سەخت و پڕلە ئازارو مەینەتیەی واتێی کەوتووین ؟

باوکم لەوڵامدا بەورەیەکی پۆڵاین و هیواو ئومێدێکی زۆرەوە ووتی: پێشمەرگە ماوەو شۆڕش بەردەوام دەبێت ئەوە من دووکوڕم پێشمەرگەیە ئەگەر کوڕەکانی تریشم توانای چەك هەڵگرتنیان هەبێت و نەبن بە پێشمەرگە ئەوە ڕۆڵەی ئەم خاك و نیشتمانە نین...

من ئومێدم زۆرە هەموو ناخۆشیەك خۆشی لەدووایە، ئەبێت بەردەوام بین لەخەبات ، ورەتان بەرز بێت ئاسۆیەکی ڕوون چاوەڕێمان ئەکات، کاك ئەحمەد زامدار کە گوێی لەم ووتانەی باوکم بوو، پڕقورگی لەگریان بوو، لەوڵامدا وتی: مام ڕەشید هیچ ووشەیەك نیە بیڵێم کە شایەنی ورەی بەرزو هێزی پۆڵاین و هەڵوێستی جوامێرانەی تۆبێت،چونکە ورەت بەئێمەش وەدەوروبەرەکەتیش بەخشی، تەنها ئەتوانم ئەوەندە بڵێم زۆر سوپاس بۆ ئەو هەستە نیشتمانپەروەریەت مام ڕەشید...!

لێرەدا ئەو مەوقیفەی باوکم بۆئێمە مایەی شانازی و دڵخۆشیەکی زۆربوو، پاش ماوەیەك لەخێمەدا ژیانمان بەسەربرد، پاشان گواسترابینەوە بۆ ئۆردوگای ( نەژاوە) لەنزیك شارۆچکەی (نەلاس) لەوێ هەرخێزانەو خێمەیەکیان دا پێمان، کەس هیچی تری پێنەبوو، چونکە لەکاتی پرۆسەی بەدناوی ئەنفال ئاوارەکان تەنیا خۆیان سەڵتە خێزان ڕوویان لەسنورەکان کردبوو، خانو و ماڵ و سەروەت و سامانیان سوتێنرابوو،ئیتر لە ژێرخێمە وبە نەبوونی خۆراك وکەلوپەلی پێویستی ژیان، گوزەرانمان دەکرد، بۆ پەیدا کردنی نانی ڕۆژانەو بژێوی ژیان ڕۆژانە ئەچوینە شارۆچکەی (نەلاس) لەوێ پێداویستی ڕۆژانەمان دابین دەکرد، لەناو خێمەکاندا بەجۆرێك ئەژیان چۆنی بڵێی ناخۆش بوو(سەرینمان ئەرزبوو، دۆشەکی ژێرمان کارتۆن بوو،ئەمەژیانی پێشمەرگەو کەس وکاری پێشمەرگە بوو، بەڵام دواتر کەمێك ئازوو قەیان داپێمان، پاشان هێزی پێشمەرگە ڕێکخرایەوە و بەرەو قەندیل بەڕێ کراین، لەوێ بارەگاکانی مەڵبەندی(یەك و،مەڵبەندی دوو)،لەبەرامبەر هێزی دووژمن جێگیرکران،بەمەبەستی درێژەدان بەخەبات وبەرگریکردن لەخاکی کوردستان. هێرش و پەلامارەکانی دوژمن بۆسەر سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە زۆر بەچڕی دەستی پێکرد، بەشێوەیەکی بەردەوام بۆردومانی ئاسمانی زەمینی دەکراین، هێزی پێشمەرگە بەورەیەکی پۆڵاینەوە بۆدوژمنناني دەسەلماند کە ئێە ماوین...

کۆڵمان نەدا، درێژەمان بەخەباتی ڕەوای گەلەکەمان دا ، سەرماوگەرماو برسیەتی هێزوو تانکی ڕژێم نەیان توانی سەنگەرەکانمان پێ چۆڵ بکەن، ئەوەی جێی داخە لەوشەڕانەدا لە دەستدانی شەهیدی سەرکردە ( ئازادهەورامی ) و دوو شەهیدی مەفرەزەکەی بەناوەکانی شەهید (عبدالرحمان)و شەهید(فەلاح)زۆر خەمباری کردین، پاش ماوەیەك لەمانەوەمان بەمەبەستی ئەنجامدانی چەند خولێکی سەربازی گەڕاینەوە، بارەگامان لە گوندی (بلەکێ) لەوێ خولێکی سەربازیمان

بینی، دواتر چوینە(گەیلانی غەرب) دەستمانتکرد بەمەشق کردن بۆماوەی (45) ڕۆژ، دواتر گەڕاینەوە گوندی بلەکێ.. هەڤاڵ مام جەلال کۆبوونەوەیەکی پێمانکرد، باسی سیاسەتی ناوچەکەو ئەو پێشهاتانەی بۆکردین کە لەعێراق وناوچەکە ڕوودەدەن،ئەو وتانەی مام جەلال جێگەی سەرنج و خۆشحاڵی بوو بۆئێمە،پاش فەترەیەك لەوە بەدواوە تەشكیلەی نوێ کرا،هێزی پێشمەرگە لەسەر بنەمای بەتالیۆن ڕێکخرایەوە، ئێمە کەوتینە' نێو بەتالیۆنی (7)ی سلێمانیەوە،دواتر لەسەرداوای خۆمان، گوێزرابنەوە بۆبەتالیۆنی(5)ی کەرکوك کە(کوێخاسیروان) فەرماندەیی دەکرد، لەمانگی 1990/9 مەفرەزەیەك ڕێکخرا بەپارتیزانی ئازووقە بەپشتی وڵاخ بەرێت بۆسنوری پارێزگای سلێمانی،خۆم یەکێك بووم لەو پێشمەرگانەی کەنزیکەی (10) کاتژمێر ڕێگەمان دەبڕی ودەڕۆیشتین، چەند ڕۆژێك دەماینەوە و دواتر دەگەڕاینەوە، بەردەوام بووم لەو ئەرکەپارتیزانیە،لەدوایدا لەسەرداوای کوێخا سیروان کرام بە فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە، درێژەمان بەئەرکی پارتیزانی خۆماندا بەمەبەستی ئامادەسازی بۆ ئەوگۆڕانکاریە سیاسی وسەربازیانەی لەناوچەکەدا ڕوودەدەن، چونکە هەڤاڵ مام جەلال پێشبینی گۆڕانکاری ڕیشەیی لە عێراق و ناوچەکەو بەتایبەتی کردبوو. لەو ڕۆژگارەدا هەرمەفرەزەیەکی پارتیزان لەسنورەجیا جیاکانی کوردستان ئەرکوو ماندووبونی خۆی هەبوو، من ناتوانم لەم بیرەوەرییەکورتەدا گوزارشت لەمەینەتی و ماندوو بوونی خۆم وهەڤاڵانم بکەم بەهەرحاڵ تامانگی(3)ی ساڵی1991 بەوشێوەیە درێژەمان بەمانەوە لەژیانی پارتیزانی دا، تادەستپێکی ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەهاری 1991کەگشت شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتەوە ، لەڕاپەڕینی شاری سلێمانی و چەمچەماڵ و قەرەهەنجیرو کەرکوك، شانبەشانی براپێشمەرگەکانم و جەماوەری ڕاپەڕیوی خەڵکی کوردستان هێرشی سەردام و دەزگاو مۆڵگەکانی

داگیرکەرانی خاکی کوردستان مان کرد تا ئازاد کردنی شاری کەرکوك، بەلأم ئەوەی جێگەی باسکردنە (باوکم و برایەك)ی پێکەوە لەئازادکردنی شاری کەرکوك شەهیدبوون. لەو ڕۆژگارەدا کەخەڵکی بەدڵ خۆشیوە بەشداریان لەڕاپەڕیندا ئەکردو سوپای ڕژێمیان لەخاکی کوردستان وەدەرئەنا، ئەوەی بۆئێمەی پێشمەرگە جێگەی خۆشی بوو لەساڵ یادی سەری ساڵی کوردی و جەژنی نەورۆز لەشەوی 1991/3/21.20 شاری کەرکوکی قودسی کوردستانمان ئازادکرد، بەلأم ئەوەی بۆمن جێگەی غەم وپەژارەبوو، شەهید بوونی پۆلێك پێشمەرگەی قارەمان بوو لەرزگارکردنی کەرکوکدا کەلە نێویشیاندا شەهید بوونی( باوکم و مامێکم) بوو، لەوەش ناخۆشتر هەڵکردنی گلۆپی سەوز بوو لەلایەن ئەمریکاوە بۆ حکومەتی عێراق کەتوانی بەشێك لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان داگیر بکاتەوە، لەدوای ئەم ڕووداوانەوە کۆڕەوی جەماوەری خەڵکی کوردستانی بەدوای خۆیدا هێنا، گلۆڵەی ڕووداوەکان لەشاری ڕانیە گیرساندینەوە، لەگەڵ ئەوەی عایلەکانیشمان لەودیوی سنوور بەجێهێشتبوو، تادواتر دەرفەتێکمان بۆڕەخسا بۆماوەی(15) ڕۆژ توانیمان سەردانیان بکەینەوە، بۆ خانەوادەکەمان زۆر جێگەی خۆشحاڵی بوو، چونکە وایان زانی بووئێمەیش شەهید بووین....

## ئەرکی پارتیزانی ساڵی 1990

لەپایزی ساڵی 1990 تاکو دەست پێکردنی ڕاپەڕینی گەلی کوردستان لەبەهاری ساڵی 1991 سەرکردایەتی یەکیتی نیشتمانی کوردستان بەرنامەیەکی چڕوپڕی دارشت، بڕیار وابوو هەموو بەتالیۆنەکان دابەزنە خوارەوە بۆ ناو شارەکان، بەلأم لەدوایدا پارتیزانەکانیان ناردە خوارە بۆ هەموو سنورەکان، لەو چوار چێوەیەدا بەتالیۆنی (5)ی کەرکوك یش مەفرەزەیەکی پێکهێنا بۆسنوری شارباژێڕ، ئەرکی

ئەو مەفرەزەیە بریتی بوو لەوەی خواردن و پێدوایستی ببات بۆسنورەکان لەئەشکەوتەکاندا دای بنێ، بۆئەو پێشمەرگانەی کەلەسنورەکە بوون..

. لەپایزی ساڵی1990 لەگوندی (چیوەرۆ) لەسەر سنوری(عیراق . ئێران) بەفەرمانی فەرمانەدەی بەتالیۆن(سیروان کوێخا نجم) مەفرەزەیەك پێك هات نزیکەی( 12.10 )پێشمەرگە دەبووین، ئەم پێشمەرگانە دەبوو لەشەوەتاریك و ئەنگوستەچاوەکاندا بەوناوچە شاخاویی و سەختانەدا کەلە سنورەکەدابوو، نزیکەی 10 کاتژمێر رێگا بڕین، لەگەڵ خۆشماندا باری 3) هێستر خواردن و ئازووقە و پێداویستی بگەیەنینە گوندی سەراو و دەوروبەری لە ناوچەی شارباژێر ، بۆهاوکاری ئەو برا پارتیزانانەی کەلەسنورەکەدا بوون و بۆهەر حالەتێکی تر.

لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی پارتیزانیماندا کەبەسنوری ئەم گوندانەدا تێدەپەڕین، وەك( سورەدزێ، سورەبان، سێرێ،دێرێی سەرو،شابەدین، مەروێ، شانەخسێ) پاشان بەشاخی (گمۆ)دا تێدەپەڕین، جارو بار مەفرەزەکەمان گۆڕان کاری بەسەردا دەهات، بەڵام بەهۆی شارەزایی تەواوم لەرێگایەکەو سنورەکە خۆم چاوساغی مەفرەزەکەبووم، لە ئەرکێکی پارتیزانیماندا بۆئەم دیوو ملازم محمود ناسراو بە(ملازم خولە)کەپلەی جێگر تیپ بوو، فەرماندەیەکی پارتیزانی سنورەکەبوو، دوو پێشمەرگەی خەڵکی سنوری گوندەکانی ناوچەی(شارباژێر) لەگەڵ بوو، پێی وتم: ئەیوب ئەگەر ئەم سەفەرە گەراینەوە دوو پێشمەرگەم لەگەڵە خەڵکی ناوچەکەن زۆر شارەزان، با ئەوان چاوساغمان بن، ئەوان خەڵکی گوندەکانی بناری (گمۆن) رێگایەکی تر شارەزان ، ئیتر ئەو رێگا دوورە نابڕین، بەڵام دوای ماوەیەك رۆیشتن تاگەیشتینە سنوری ئەم دیوی شاخی (گمۆ) بووین، سەیرم کرد ئەو دوو پێشمەرگەیە خەڵکی ناوچەکەش بوون، بەڵام بەداخەوە رێگایەکی هەڵەیان گرتەبەر، وتم: ملازم محمود ئەم رێگایە هەڵەیە،وتی: ئەیوب چۆن ئەزانی هەڵەیە..؟ برا ئەمانە

خۆیان خەڵکی ئەم سنورەن، وتم: کاك محمود هەرچەندە من بەشەو بەم ڕێگایەدا هاتووم بەڕۆژ نەمبینیوە، بەلاّم زۆر شارەزام،ئەو ڕێگایەی ئەم برادەرانە گرتویانە دەچێتە ناو ڕەبیەکانی دووژمن، زۆر مەترسیدارەو تیا دەچین، من ئامادەنیم بەدوایاندا بڕۆم، بەلاّم (ملازم خولە) وتی: بائەوان لە پێش ئێمەوە مسافەیەك بڕۆن بۆ دڵنیایی کردنی ئێمە، ئەگەر هیچ مەترسیەك نەبوو ئینجا ئێمە دەڕۆین، ئێمە لەشوێنی خۆمان دانیشتین ئەو دوو پێشمەرگەیە ڕۆیشتن دوای نزیکەی چارەکە سەعاتێك بەپەلە پروسکێ گەڕانەوە، (ملازم خولە) وتی: هاچی بوو؟ بۆ وا پەشۆکاون، وتیان: لە پێشمانەوە ڕەبیەی دوژمنی لێیە، ئەگەر بەم ڕێگایەدا بڕۆین تیادەچین. دواجار (ملازم خولە) وتی: کاك ئەیوب خۆت چی بەچاك ئەزانی..؟

منیش وەك پیشەی لەمێژینەی خۆم پێشیان کەوتم بەو ڕێگایەدا بردیانم کە پیشتر پێیدا دەڕۆیشتبووم، دوای نزیکەی( 2 )کاتژمێر لە ڕۆیشتین، گەیشتینە شوێنێکی گونجاو بۆ پشودان، وتم: لێرە دانیشن پشوبدەن جگەرەئەخۆن زۆر ئاساییە، ئەو دوو پێشمەرگەیەی کەخەڵکی ناوچەکە بوون، وتیان ئێستا لێرەوە ئێمە ئەتوانین بەئاسانترین وقەد برترین ڕێگادا بڕۆین، بەلاّم وتم: من ئامادەنیم بەو شوێنەدا بێم ، ئەوان وتیان ئێمەدڵ نیان هیچ مەترسیەك لەپێشمان نیە، (ملازم خولە) وتی: ئێوە سەرکەونە سەر گردەکە باوەك جاری پێشومان لێ نەیە ئەگەر هیچ نەبوو ئەوا ئێمەش دێین،ئەودوو پێشمەرگەیە سەرکەوتنە سەرگردەکە ئەوەندەی پێنەچوو بەهەڵ هاتن هاتنە خوارەوە لەکاتی ڕاکردن لەغرەی قوتوی معەلەباتی دەورویشتی ڕەبیەکە سەربازەکان ئاگادار بوونەوە، دوو فیشەکی گرداریان تەقاند بۆسەر مقەر فەوجەکەی دەشتی (مەرویّ) لەوێشەوە وڵام درانەوە بەفیشەکی گردار. ئیتر ئێمە زانیمان شوێنەکەمان خەتەریاتی لەسەر دروست بوو، (ملازم خولە) وتی: ئەیوب چیبکەین، وتم: کاك محمود لانی کەم دەبێ نزیکەی

کاتژمێرێ بەغاردان بڕۆین، تائەگەینە شوێنێکی سەلامەت، دووای کاتژمێرێك لە راکردن گەیشتینە شوێنێکی گونجاو بە پێشمەرگەکانم وت: دانیشن..!ویستم قسەبکەم: ملازم محمود وتی: ئەیوب هەرچیەك بڵێی حەقی خۆتە..

وتم: نازانم ئێوە چۆن ئەڵێن خەڵکی ئەم سنورەین..؟ کاك محمود وتی ئەیوب لێم گەڕێ باهەندێ ڕەزیلیان بکەم ، وتی:(عەیبە بڵێن پێشمەرگەین ،عەیبیشە بڵێن خەڵکی ئەم ناوچەیەن و شارەزای سنورەکەین.؟ کەبە حیساب ئێوە منالی ئەم سنورەن)، بەڵام کاك ئەیوب خەڵکی ناوچەی (کەرکوك) ە تەنها بەشەو ئەم سنورەی بینیوە هەقە هەموومان مەمنوونی بین،ئەو نەبوایە ئەمشەو هەموومان تیا ئەچووین.

لەدوایدا هەستاین بەرێکەوتینەوە بەرەو بارەگای بەتالیۆن لەگوندی (چیوەرۆ) لای بەیانی بوو نزیکی سێ و نیو بۆ چواری بەیانی گەیشتینەوە بارەگای بەتالیۆن، زۆر شەکەت و ماندوو بوین، ئەوشەو زۆر خراپمان لی قەوما، بۆ بەیانیەکەی لەدەوری کاتژمێر 10 بوو (کوێخا سیروان) بانگی کردم وتی: ئەم شەو چیتان بەسەر هاتووە بۆمی باسکە، منیش هەموو بەسەر هاتەکەم بۆ باس کرد، لەوڵامدا وتی: (ملازم خولە) بۆی باس کردووم بۆیە بانگتم کردووە، وتی:لێرە بەدواوە تۆ ئەبیتە فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە، منیش وتم بۆ؟ وتی: (ملازم خولە) وەسیەتی بۆم کردووە وتویەتی ئەگەر ئەیوب نەبوایە ئەم شەو تاقەکەسێکمان دەر نەئەچووین، من سیقەم بەو پێشمەرگانە بوو کە لەگەڵ خۆم بوون بەناو خەڵکی ناوچەکە بوون، بۆیە وەسیەتم بۆت هەیە (کوێخا )مەفرەزە تەسلیمی کەس نەکەی لە ئەیوب زیاتر، یەکەم جار قبوڵم نەکرد، لەبەرئەوەی رێگاکە زۆر سەخت بوو ئەرك و ماندوو بونێکی زۆری تیابوو،هەموو دەقەیەکی لەخەتەریاتا بوو، بەڵام دوایی لەگەڵ (مام برایم )دا بانگیان کردم وتیان دەبی لە قسەمان دەر نەچیت، منیش نەم توانی دڵیان بشکێنم پێشنیارەکەیان قبوڵ کرد.. ئیتر لەوە بەدواوە تا پێش راپەرینی

بەهاری1991 من لەو ئەرکە پارتیزانیە بەردەوام بووم لە درێژەی ئەوکارە پاتیزانیەدا چەندان بیرەوەی تاڵ وناخۆش هەیەکەهەریەکەیان بۆخۆی ڕۆمانێکە.

لەئەرکێکی ترماندا کاك (یونس احمدحمه علی)برای شەهید(ئاکۆ سوور)م لەگەڵ بوو، بەداخە ئێستالەژیاندا نەماوەو لەڕزگارکردنی کەرکوك شەهید بوو،لەهەر سەفەرێکدا ئەو مەفرەزەیەی لەگەڵم بوو گۆرانکاری بەسەردا دەهات، بەڵام کاك( یونس) زۆربەی جار لەگەڵم ئەهات، جارێکیان کاك یونس وتی: ئەیوب بائەم جارە بەم ڕێگایەدا بڕۆین،نزیك ترە، منیش وتم،ئەو ڕێگایە مێرگێکی تیایە، دەرباز بونمان لەوێ زۆر زەحمەتە، کاك یونس وتی: وەرە ئەم جارە بەقسەم کە، منیش وتم: بەسەر چاو دڵم نەهات دڵی بشکێنم، هەرکە یەکەم هێسترمان داخلی مێرگەکەبوو،هەرچوار پەلی لە لیم و قور ختم بوو، بەباریك برنجەوە، وتم: کاك یونس چیبکەین نەم گوت: ئەو ڕێگایە سەختە، وتی کاك ئەیوب خۆت چی بەچاك ئەزانی بیکە، شوێنەکەش زۆر خراپ بوو، لەڕێگای سەرەکیەوە نزیك بوو، شەوانە لەنێوان کاتژمێر(8. 9)ی شەو جێب قیادەو ئیڤایەك بەرێگاکەدا ئەهاتن و ئەگەڕانەوە، کات نزیك ئەبووەوە لەهاتنی جیب قیادەو ئیڤاکان، هەرچۆنێك بوو بارە برنجەکەمان لەسەر پشتی هێسترەکە دورخستەوە،پاشان حەبلێکمان لە بن سکی هیسترەکەوەرەتکردئەم دیوو بەو دیوو گرییەکمان لیدا،بەهەر شێوەیەك بوو هیسترەکەمان لە قوڕەکە دەرکرد ، ئینجا بارەکەمان لی بارکردەوە، بەڕێکەوتین گەیشتینە جادەیەکی خاکی مەترسیدار لەبەر ئەوەی لەکات و ساتی هاتنی جێب قیادەو ئیڤاکە نزیك بوبوەوە وتم: باشترین ڕێگە چارەی دەرباز بوونمان خۆمان بدەینە ئەم قەتپالەی تەنیشت ڕێگاکە، بۆئەوەی لەکاتی سورانەوریاندا نەکەوینە بەر شەوقی لایتەکانیان، باش بوو سەیارەکان ڕەتبوون ئیمەیان نەبینی پاشان هاتینەوەسەر ڕێگاکەی خۆمان وکەوتینە ڕێ بەرەو شاخی (گمۆ) لەجادەکە

دورکەوتینەوە ئیتر ترسمان نەما، ئەوجا بەشینەیی پشویەکمان دا، لەدوایدا بەرێکەوتین بۆسنوری گوندەکانی (سەراو) لای بەیانی گەیشتینە شوێنی مەبەست کە پێیان دەگووت: (موچەی شەکراو).

## کاروانێکی تر

لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك پێکەوە بوون لەوانە(مام برایم جێگری تیپ،مەلاوەیسی جێگری تیپ، شێخ زاهیر) شەوێکی زستانی زۆر سەخت بوو هێشتا نەگەیشتبوینە ئەوشوێنەی کەمەترسی لەسەرنامێنێ،کردیە باران وسەرماو زریانێکی بەهێز.. بەتەواوی هەموومان شەکەت و ماندوو بووین، تەنانەت هێسترەکانیشمان وزەیان تیا نەمابوو، پشودان و راوەستانیش دادمانی نەئەدا، کاك مەلا وەیسی وتی: کاك ئەیوب باپشوویەك بدەین.

گوتم : شوێنەکەمان جێگای مەترسیە.. بەکەڵکی ئەوەنایە یەك دەقە راوەستین، کاتی هاتنی جێب قیادەو ئیڤاکە نزیك بۆتەوە، دەبێ لەم شوێنە دوور کەوینەوە، ئەویش وتی: کاکە تۆ ئەم زەختەمان لێدەکەی تواناکان نەماوە، سەیرکە هێسترەکان بەهێستری خۆیان لەگەڵ باو زریانەکەدا دەسورێن،چونکە باو زریانەکە روو لە ئێمەیە، گوتم: کاکە چەکەکانتان بدەن بەمن تەنیا خۆتان برۆن، چەکەکانم لە مەلاوەیسی و مام برایم وەرگرت کردمە ملم، چەك و تاقمەکەی خۆشم بەشانمەوە بوو، مەلا وەیسی وتی: مام برایم ئەگەر ئەمە بەپارە بوایە چەندیان بدایە پێت دەهاتی، مام برایم وتی: یەك فەردەی پرخەت سور بیست و پێنج دیناریان پێم بدایە نەدەهاتم، بەلام ئەمە بیروڕای کوردایەتی یە ئەیوب ئەم حوکمەمان بەسەردادەکات، هەرچی چۆنێ بوو بۆلای بەیانیەکەی گەیشتینە شوێنی مەبەست لەدەورو بەری گوندی سەراو

## لەگەڵ خاڵەسەراوی

لەو ماوەیەدا هەرلە سنوری شارباژێر لەشێوێکی زۆر قوڵدا حەرەسمان هەبوو، وەختێکمان زانی بانگی ئێشکگربانگی کردین:

. جەماعەت سەیارەیەك وا بەرەو ئەوگردەی پشتمانەوەدێ، ئێمەش لەگەڵ برادەرانی مەفرەزەکەی(خالەسەراوی)سەرکەوتینە بەرزایەکەو تەوزیع بووین بەچواردەوری بەرزابەکەدا، سەیارەکە هاتە بانابیەکە ئێمەش هیچ چارمان نەما بۆی رۆیشتین کەنزیك بووینەوە، سەیرمان کرد جێبێك بوو پێمان دەوت (جێبەکۆیی) سەیرمان کرد سێ کەس لەنزیك جێبەکە دانیشتبوون، لێیان نزیك بووینەوە نزیکەی30 مەترێك مابوو بگەینە لایان لێ یانمان خوڕی:

هەستانە سەرپێ.. کەهەستانەوە بینیمان جلی مەدەنیان لەبەردابوو، چەکیان پێ نەبوو، چوین بۆلایان سلاومان لێیان کرد، وەها ترسابوون هەر ئەوەتەو قسەیان پێدەکرا دوای ماوەیەك ئینجا هاتنەوە سەرخۆیان، کەوتینە قسە لەگەڵیان، گوتمان ئێوە چین؟ چۆن توانیوتانە بێن بۆ ئێرە؟ گوتیان ئێمە خەڵکی ئەم ناوچەیەین دانیشتوی شاری سلێمانین،لەمەقەرفەوجەکەی ماوەت تەکلیفمان کردوە برێك پارەشمان داوەتە ئامرفەوجەکە پێیانمان گوتووە کەواخەڵکی ئەم سنورەین دەچین سەرلە ڕەزوو باخەکانمان ئەدەین، بەو شێوەیە ئیزنی داوین، ئەوجا وتیان ئەی ئێوە کێن؟ وتمان ئێمە پێشمەرگەین، وتیان چۆن بزانین ئێوە پێشمەرگەن، وتمان بۆ؟ وتیان هیچ ئاوەدانیەك لەم سنورە نەماوە بەچی ئەژین، وتمان چیتان ئەوێ پێتان بدەین لە شکرو ئاردوو برنج و رۆن ، زۆریان لاسەیربوو، گوتیان ئێستا بچینەوە سلێمانی ئەگەر سێ بەسێ تەلاق بخۆین بڵێین پێشمەرگەمان دیوە

باوەڕمان پێ ناکەن، لەدوایدا یەکێك لە پێشمەرگەکانی لەگەڵمان بوو خەڵکی گوندەکانی ئەو ناوچەیە بوو، پێیانی گوت: ئێوەخەڵکی کام گوندن و لە چ بنەماڵەیەکن..؟؟ ئیتر ئەوانیان ناسی پاشان پێیانی گوت: کە لێرە ڕۆیشتنەوە ببینین جەیش وجاش وکۆپتەر و تەیارە بێتە سەرمان ، مەفرەزەمان لەناو شاردا هەیە بەشەو یەك یەك لەماڵ دەرتان دێنین و دەتان کوژین، ئەوانیش وتیان: هەرکاتێك لەلایەن ئێمەوە هەرشتێك ڕوی دا ئامادەی هەموو سزایەکین،دوای ماوەیەك لە گفتو گۆ ئیتر ئەوان خواحافیزیان کردوو گەڕانەوە و ئێمەش لەو شوێنە دوور کەوتینەوە چووین بۆ شوێنێکی تر.

لەدوای دووشەو گەراینەوە بەرەو بارەگای بەتالیۆن هەرلەنزیك ئەوگوندانەی بناری (گمۆ) بەدیوی ئێراندا گەیشتینە شوێنێك، وتمان لێرەوە راستەو راست برۆین تۆزێك ڕێگاکە نزیك دەبێتەوە، کاتێکمان زانی بەسەر ڕەبیەیکدا کەوتین جلی سەربازەکان لەسەر تەنافی دەوری ڕەبیەکە هەڵخسترابوو، دەستمان لێدا هێشتا تەڕبوو، بەوە زانیمان ڕەبیەکە ئاوەدانە، خوادا ڕەحمی کرد لوغم پێماندا نەتەقیەوە و ڕەبیەکەش ئاگادار نەبوونەوە. سەیری فانۆسەکەیانمان کرد لەناو پەنجەرەکە دیاربوو،زۆرمان لاسەیر بوو ئەم ڕەبیەیە لەهەستوو خوستی ئێمە ئاگادارنەبوونەوە، ئەگەر حەرەسیان هەبایە کەسمان دەر نەدەچووین، ئێمەش زۆربەهێواشی خۆمان دەربازکرد،چونکە نەدەبوو بەهیچ شێوەیەك هەست بەوەبکرێ پێشمەرگەی پارتیزان بەو سنورەدا دێن و دەڕۆن، لەبەرئەوەی ئەمنیەتی ڕێگاکەمان بەلاوە گرنگ بوو بۆدرێژەدان بەئەرکەکانی خۆمان، پاشان چووینەوە سەر ڕێگای خۆمان بۆلای بەیانی گەیشتینەوە بارەگای بەتالیۆن.

# تریی زستانە

لە سەفەرێکی ترماندا هەرلەسنوری شارباژێر ڕۆژێکیان مەفرەزەکەی(خاڵەسەراوی) بردیانین بۆ شوێنێك نزیکەی یەك مەتر بەفر کەوتبوو، پێیان گوتین برسیتان نیە..؟

گوتمان: بەرەوەڵا برسیمانە

گوتیان: حەزتان لەترێ هەیە..؟

ئێمەش گوتمان: چیە؟ ڕائەبوێرن، وتیان نەوەڵا وتمان: بەم زستانە تریی چی؟ مەترێ بەفر کەوتووە. وتیان ئێمە ئێستا ترێ تان ئەدەینێ، چونکە ئەوان خەڵکی سنورەکە بوون، دەیان زانی لەکوێ ڕەزی تریی باشی لێیە، ئێمەیان بردە شوێنێك پێیان دەووت: (موجەی خدری ئاودەڵێن) لەقەت پاڵێك بەهەردوو دەست بەفریان لائەدا ئێمەش زۆرمان لاسەیر بوو، ئەمانە چی ئەکەن، کاتێك بنە مێوو دەرکەوت ڕەش دەچووە لەترێ. یەك گەڵای پێوە نەبوو لەغەیری ترێ بەولاوە، هەر بنەمێوێك تەسەورم وابوو یەك دوو سندوق تریی پێوە بوو، ترێ یەك بوو لەهەموو تەمەنی خۆمدا تریی واجوان و خۆشم نەخواردبوو، تابەچاوی خۆمان نەمان دی و نەمان خوارد باوەرمان نەدەکرد، بۆئێوارەکەیشی وتیان گۆشتان بۆدێ لەشوێنێکەوە، دوو پێشمەرگەلەمەفرەزەکەی ئەوان هاتن لاکێکیان بەدەستەوە بوو،بۆیان سورکردینەوە بۆ ئێوارە، وتمان گۆشتی چیە؟ وتیان پێتان ناڵێین تانەی خۆن، لەدوای خواردن، گوتمان ئەوە خواردمان پێمان خۆشە پێمان بڵێن،گوتیان:وەڵا ئەوەگۆشتی(چەقەڵ) بوو، ئیتر ئێمەش زۆر پێکەنین وتمان دەستان خۆش بێ هیچ عەیبی نەبوو.



## لەگەڵ پارتیزان
## کاك عادل سەراوی

لێرەدا دەمەوێ سوپاسی کاك (عادل سەراوی) بکەم..یەکێك بوولەپێشمەرگە پارتیزانەکانی سنوری شارباژێر،لەمەفرەزەکەی (خاڵە سەراوی) بوو،ڕۆژێکیان بەشوێنێکدا دەرۆیشتین من لە ڕێگاکە لامدا، روومانەیەکم دۆزییەوە، ویستم هەڵی بگرمەوە،بۆی داچەمیمەوە دەستی بۆبەرم..

کاك (عادل سەراوی) هاواری کرد و باوشی پێمداکرد زگوتی:

کورە نەکەی ...! ئەو رومانەیە تەوقیت کراوە، هەڵی گری ئەتەقێتەوە، ئەڵقەکەی لە ژێرەوە قایم کراوە بەتۆڕێکی تر لەمینەوە، بۆئەوەی هەڵی گری و بەدەستدا بتەقێتەوە، ئەوجا وتی تەماشای دەورو بەری خۆت بکە..!

کەتەماشام کرد بەچەندین جۆر لوغم ئەولاپاڵ و دۆڵە تەنرابوو، ئەگەر ئەو نەبوایە، هەرلەوێ شەهیدەبووم،ئێستا من لەژیاندا نەمابووم،جالێرەدا هەرچەندە نەهامەتی وسەختی وئەرکی پارتیزانی باس بکەین ..تەواو نابێ، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزم بۆئەوبرا پێشمەرگە پارتیزانانەی کەبەشداریان کردووە،بەتایبەت بەتالیۆنی(5)ی کەرکوك بەگشت فەرماندەو پێشمەرگەکانیەوە،سەرجەم پارتیزانەکانی شارباژێر کەنەمان توانیوە ئامارژە بەناوی هەمووان بدەین.

# یادەوەریەکانی ڕۆژانی پارتیزانی

جەمال چاوشین

سەرکردایەتی یەکێتی کۆمەڵ کۆمەڵ پێشمەرگەکانی دەنارد بۆ دەورە و مەشق چەند وەجبەیەك ڕۆیشتن و گەڕانەوە، هەموو ڕویەکەوە ئەم لە مەشقی سەربازیە زۆر باش وکاریگەر بوو.بۆ پێشمەرگە،لەودەورانەدا فێری هەڵگرتنەوەی ئەڵغام. بەکارەێنانی هەموو جۆرە چەکێك، بەرزکردنەوەی ئاستی ووشیاری سەربازی ، بەرز کردنەوەی ئاستی خۆڕاگری لە کاتی تەنگانەدا ، هونەر شەڕکردن ،وە بەهامان شێوەش لە قاسمەڕەش دەورە ومەشقی پارتیزانیان کردەوە، ئەم دەورەیە مامۆستاکانی خۆماڵی بوو واتا مامۆستاکانی پێشمەرگە وکادرە سیاسی و عەسکەریەکانی خۆمان بوون، زۆر باش بوو بۆ فێربونی هومەری خۆشاردنەوە، هونەری ژیان لەناوچە جوڵەکاندا، هونەری شەڕی پارتیزانی و خۆدەربازکردن، فێڵکردن لەدوژمنەکەت. لەم دەورەیەدا کادرە سیاسیەکان دەرسیان دەوتەوە ، توانیان تاڕادەیەکی باش هەستی نەتەوایەتی لەناو پێشمەرگەکاندا بەرز بکەنەوە، نەوشیروان کاك سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی دەورەکەو مەفرە پارتیزانەکانی دەکرد، لەم بەشداریکردن دەورانەدا ئارزومەندانە بوو، بەمنیشیان ووت بەڵام من نەچوم لە بەتالوێنی 7 مامەوە بوینە پارتیزانی بەتالوێن، وە لەساڵی 1988 دەورەی مازندارانیشم کردبوو بەشداری فێری هەڵگرتنەوەی ئەڵغام بووبوم بەباشی، پارتیزانیم دیبوو لەناوچەی ژیانی شارباژێر.لەم دەورەیەی قاسمەڕەشدا هەر ناوچەو مەفرەزەی پارتیزانی شارەزا و خەڵکی ناوچەکەی بۆ دەستنیشان کران ، دەورەکان چەندمانگێکیان دەخایاند پاشان هەرناوچەو مەفرەزی خۆیان بۆدەنارد .

## چونەوەمان بۆ ناوچەی شاربازێڕ و شاری سلێمانی

وەکوو سالآنی پێشوو سەرەتای بەهار بوو نزیکی کۆتای مانگی 4 سالّی 1990 بوو مامۆستا جمال هەندێ ئەرکی شۆڕشی پێسپاردین، کە بەمەفرەزە بچینەوە بۆ شاربازێڕ بۆ هەڵسەنگاندنی ناوچەکە لەڕوی ژیانی مەفرەزە پارتیزانەکانەوە، تابزانین چ گۆڕانکاریەکی تازە ڕویانداوە لە ناوچەکەدا ووتمان کە جوینە شاربازێڕ .. سەرێك لە شاری سلێمانی دەدەین *

بڕیارماندا من وئازاد وەندەرێنەیی و وەستا عبدول وسامالّ بجین، جمال ووتی کاوە ومامۆستا کەوڵۆسی ببەن لەوسەرەوە لەگەڵ خۆتان مەیهێننەوە، کاوە دەجیت بۆ بەغداد بۆ عیلاج، خراپ قاچی توشی نەخۆشی دەوالی بووە تەنها لەبەغداد چارەسەری هەیە،لەگەڵ کاك شۆڕش قسەمان کرد مەبەستی سەفەرەکەمان بۆڕونکردەوە،نزیك لەکۆتای مانگی1990/4 سەرلەئێوارێ بوو لەبلەکێ کەوتینەڕێ لە هیج شوێنێك لامانئەدا زۆر باش ڕۆشتین، شەوی مابوو گەیشتینە نزیك گوندی دۆڵەتوو لە بناری شاخی کەتوو ژێر شاخ و ئەشکەوتێکی لێ بوو لەو ژێر ڕەهۆڵە شاخە لاماندا، نمەنمە باران دەباری خۆمان کردەوە بۆ پشوودان جوینەناو کیسەخەوەکانەوە تابخەوین ژێر تاشە بەردەکە چەندین کونی تێدا بوو ناوەوە لەژێر بەردەکەوە جارجارێ خرتە خرت ئەهات ، دنیا ڕوناکی کرد کاتێ دەعبایەك بازیدا بەسەرماندا دەرچووە دەرەوە ئێمەش ڕاپەڕین پەلاماری تفەنگەکانماندا. سەیرمان کرد دەعباکە ڕێوی بوو دورکەوتەوە لێمان، لە دورەوە وەستابوو سەیری لانەو ئەشکەوتەکەو ئێمەی دەکرد، برادەران ووتم ئێستا ئەو ڕێوییە دەڵێن ئەمانە چۆن بوون بەغەزەب ماڵەکەمیان داگیرکرد، لێرە ماینەوە تا سەعاتێ ڕۆژی مابوو، ئێوارێ ماڵی ڕێویمان نزیکی بەجێ هێشت چوینە ئەشکەوتەکەی ملەی قەیماسە بەدوربین بەوردی سەیری ناوچەکەم دەکرد لەدوامانەوە لەگوندی دۆڵەتوو 4 نەفەر

بەرەو لای ئێمە دەهاتن ئەوان بەئێمەیان نەزانی بۆیان چوینەکەمینەوە دنیا تاریکی کرد کەوتنە کەمینەکەمانەوە میلی تفەنگمان لێهێنانەوە دەنگمدان:. کێن زەلام یەکێك لەنەفەرەکان دەنگی منی ناسی ووتی نەکەن کاك جمال ئاکۆ چاوشینم ئێمەش ئەوانمان ناسیەوە لەیەك ئاشکرا بووین برادەرانی پارتی بوون کاك (فازیلی مەلیح، ئاکۆ چاوشین، دوو نەفەری تر بوون ناوەکانیان بیرنەماون، تۆزێ پێکەوە دانیشتین ئەوانیش و ئێمەش مەبەستی خۆمانمان ئاشکرا کرد، تەگبیرمان کرد پێکەوە بڕۆین، پێکەوە کەوتینەڕێ بۆ سلێمانی لەسەر شاخی گۆیژە دوو وولاخارمان تووش بوو گرتمانن، یەکێکیان منی ناسی، خەڵکی گووندی () بزەنیان بوون ناوی ئازاد بوو فەریکە چوالەیان پێبوو بۆ شاریان دەبرد، بۆ ئەوەی کەشفمان نەکەن برادەران هەموویان ووتیان با بیان کوژین ، بەپەت بیانخنکێنین من نەمهێشت، لای وولاغارەکان ووتمان دەچین تەسلیم دەبین ەوە، تا نزیکی جادە 50 م پێکەوە بووین لەگەڵ برادەرانی پارتی لەوێ خۆمان شاردەوە لێیان ، پێش ئەوان چوینە ناوشار چوینە ماڵی کاك ساڵح برای شەهید فەرەج وەندەرێنەی لە نزیك مزگەوتی علی کامال. دووشەویش چوینە ماڵی خەزوری کاك ساڵح ماڵی کاك (وەستا جمال جلال) هەر دووکیان پێشمەرگە بوون گەڕابوونەوە بۆ ناوشار، زۆر دڵسۆز کورد خەڵکی پەروەر بوون، لە شاری سەقز برادەرێك هەندێ پارەی عێراقی نیوە سوتاوی دابوو بە ئازاد بۆی بگۆڕێتەوە خوشکێکی وەستا جلال کارمەندی بانك بوو پارە نیوە سوتاوەکەی برد لەبانك بۆی گۆڕینەوە بە 25 دیناری تازە، لەوێش ڕۆشتین بۆ ماڵی پورە حەلاو پوری کاك ئازاد لە گەڕەکی تووی مەلیك چەند ڕۆژێکیش لەوێ ماینەوە لەماڵی پورە حەلاو هەرکاتێ لەدەرگا یان لە چەرەسیان دەدا ڕامان دەکرد دەچوینە ژوری دواوە تا دەمانزانی می وانەکە کێیە چەنجارێك ئەم هەستانوو دانیشتنەوەیە دوبارە دەبۆوە هیچیش نەبوو * من سوێندم خوارد

ئەمچارە مدیری ئەمنیش بێت هەڵناسم لەچێی خۆم ناچوڵێم ، کچێکی ١٢ ساڵەیان چوو من تاقی هەبوو بکاتەوە لەچەرەسی دەرگاکەیدا ئێمە بەناچاری ئەمچارەش هەستاین جووینە ژوری دواوە کچەکە هاتە ژورەوە بەمنی ووت هاقارەمان خۆ تۆ ووتت هەڵناسم ئەگەر مدیری ئەمنیش بێت ئەی بۆ ڕاتکرد، ووتم ئەوە تۆبووی خەزەب، بەڵی من بووم ووتی تۆم تاقی کردەوە.

## ڕوداوی برادەرەکانم دوای ئەوەی کەوتنە کەمینەوە سەفەری پێشوو

شەوێك ئازادم بەجی هێشت سەردانی ماڵی کاك (جلال) م کرد لەگەڕەکی هەوارە بەرزە شەو مامەوە چاوم بە کاك ئەسعەدش کەوت بۆیان باسکردم جاری پێشوو دوای ئەوەی ئێمە کەوتینە کەمینەوە لە شاخی گۆیزە * کاك ئەسعەد ووتی دوای ڕۆشتنی ئێوە چاودێری شاخی گۆژەمان دەکرد چاومان لێبوو بوو بەتەقە کێوەکە گرێگرت، ئەوشەوە ماڵمان چۆڵکرد هەر بەیانی کەوتمە سۆراخ و هەواڵ پرسینی ئێوە هەر کەسە بە چۆرێك ئەو تەقانەی شەووی باس دەکرد هەبوو دەیان گووت پێشمەرگە بوون هەموویان گیراون هەبوو دەیگوت هەموویان کوژراوون دەنگووباس زۆر بوو، بەڵام لەسەرچاوەیەکی ڕاستەوە زانیارم دەستکەوت کەتەنها ئەك پێشمەرگە گیراوە کەس نەکوژراوە ، زانیمان تۆ سەلامەتی زۆرمان پێخۆش بوو ، دوای دوو ڕۆژ گەڕاینەوە ماڵەوە ژیانمان ئاسای بووەوە ،

## بەسەرهاتی کاك جلال

کاك جەلال ووتی شەوزانیم کەوتونەتە کەمینەوە زۆر خەمی تۆمان بوو بەیانی وەکوو هەموو ڕۆژەکانی تر چووم بۆ دوکان لە مەنتیقە سەناعیەکە تا گەیشتمە دوکان چەند سەیتەرەیەك هەبوو داوای هەویەیان لەخەڵك دەکرد چەند خەڵکێکم بینی گیرابون، گەیشتمە دوکان، دوکانم کردەوە زۆری پێنەچوو چێب قیادەیەکی سەربازی هات سێ چوار سەربازی تێدا بوو، لە پرسیاریان دراوسێ دوکانەکەم کرد

دوکانی وەستا جلال کامەیە کاتێ زانیم هەواڵی من دەپرسن زۆر ترسام ئەژنۆم شکا وتم ئەم شەوو لە کەمینەکە جمال گیراوە ئەم سەربازانە هاتوون بۆ گرتنی من خەریبوو ڕابکەم نەمتوانی سەربازەکان هاتنە دوکانەك هەمەوە وتیان بۆری قاعیدەی چادری جێبەکەمان شکاوە بەشکم بۆمان لەحیم بکەی باشبوو تۆزێ هاتمەوە سەرخۆ ، خێرا بۆم چاککردن پارەشم لێوەرنەرتن ، سەربازەکان هرکردنی ئەوبۆریەیان کردبوو ناوی منوو دوکانەکەیان دابونێ ناردبویانن بۆ لای من بۆیە هاتبوون / ناوکی منیان خست .

## لە ماڵی مامۆستا کمال چی ڕویدابوو

مامۆستا کمال ئاوای گێرا بووەوە هەر ئەو شەو خەبەرمان زانی جمال و برادەرەکانی کەوتونەتە کەمینەوە بەیانی وەك ڕۆژانی ئاسای چووم بۆ دەوامی مەکتەب هیچ ڕووینەدا هیچ شتێکی نامۆمنەدی بەڵام زۆر قەلەق بووم، شەوی دوای ڕوداوەکە خەوتبووین زۆر درەنگ بوو لەتەقە تەقەی درگا خەبەرمان بووەوە خێرا خێرا بەقایمی دەنگو درگاکە هەمومان دەهات هەستاین، وامزانی دەزگا ئەمنیەکانی بەعسە، ڕاںکەم بەڵام خۆمم خەریبوو کۆنترۆڵکرد چووم لەسەربانەوە سەیر دەکەم مانگایەك سەری کردووە بەتەنەکەی خۆڵەکەدا خەریکی پاشەڕۆ خواردنە لەگەڵ سەرچوڵاندنیدا تەنەکە خۆڵەکە بەر درگاکەی ئێمە دەك ەوێت لەسەربان هماتە خوارەوە گوم مانگاکەم دەرکردوو تەنەکە خۆڵەکەم هێنایە ژورەوە.

## کەشف بوونی وەستا عبدول

گەڕامەوە بۆ ماڵی پورە حەلاو بۆ لای ئازاد یەك ڕژمان مابوو بۆ کاتی گەڕانەوەمان، وەستا عبدول چموچوڵی زۆر کردبوو ماڵان زۆر گەڕابوو خۆی پیشانی خەڵکی خراپدابوو یاساکانی خۆشاردنەوەی پەیرەو نەکردبوو خۆی دەرخستبوو کەشف بووبوو، وەستا عبدول لەرێگەی کاك سالحەوە ئێمەی دۆزیەوە بە پەلە هات وتی

کەشف بووین بەدواماندا ئەمشەو بابڕۆین ووتم دەگەڕێن ئاخر سامالْ بەچیْ دەمێنیْ ووتیان لە شاربازێڕ چاوەڕوانی دەکەین منیش ووتم باشە دوای بانگی ئێواریْ، وەستا عبدول ناوی ئامۆزایەکی ئازاد بوو، بەسەیارەی خۆی بردینی بۆ سەر چادەی 50 بەسەلامەتی گەیشتینە سەر م شاخی یەکەمی گۆیژە بەرزیەوە دانیشتین سەیری ەو شارمان دەکرد تا گەیشتینە ئەویْ دوو مەتارە ئاومان خواردەوە ئاومان پێنەما ووتم وەستا ئەو شارە گەورەیە جێگەی ئەو هەموو خەڵکەی تێدا دەبێتەوە جێگەی ئێمە نەبێت؟ ** ووتی ئاخر ئێمە وەستا زۆر محەمەدی و ئەسلْ زادەین، جرتێکی لێدا ووتی یانی ئێمە لەو هەموو خەڵکە دڵسۆزترین ؟ **، عبدول ووستا ووتی برادەران ئێستا چیخۆشە هەر یەکەمان شتێکمان دەوت من ووتم ئێستا بەستەنیەکەی میدی هەوای سەقز بۆ ئەم تینویتیە زۆر خۆشە، زۆرمان تینوو بوو وەستا عبدول ووتی ئاوم پێیە یەك قومتان نادەمیْ ئێمە بڕوامان نەکرد ئاوی پێبیْ من ووتم تۆ لە ڕێگا ئاوەکەی ئێمەت دەخواردەوە ئاوت لەکویْ بوو، کاتیْ کۆلەپشتەکەی کردەوە یەك مەتارەی گەورە سەهۆلاوی دەرهێنا لەبەر چاومانا نای بەسەریەوە ئینچا بڕوامان کرد، دوای خۆی بەشی ئێمەشیدا ، ووتی ئاوێکی تەڕوو پاراوو بوو

لەشاخی گۆیژە هاتینە خوارەوە چەکەکانمان هەڵگرتەوە، نامەیەکمان لەسەر کۆڵە پشتەکەی سامالْ بۆ بەچیْ هێشت، بۆمان نوسی وەرە بۆ ماڵی ڕیویەکە چاوەڕوانت دەکەین، جوینە دەشتی بەیاغار نزیك گووندی (وەلانە) لەناو دەوەنێکی گەورە ماینەوە لیخەوتین نیوەڕۆ هەستاین لەخەو دنیا ئارام بوو، شفتەو خواردنی باشمان پێبوو بەتەمابووین زۆر بمێنینەوە جەولەیەکی هەموو دێهاتەکانی ناوچەی شاربازێر بکەین،هەموو شفتەکە وهەندیْ نان بەمن بوو ئەوان هەر نانوو ناوساچیان پێبوو،بە برادەرانم ووت بۆ ئەوەی شفتەکە بەشی چەند ڕۆژێك بکات دانە دانە

شفتە بکەن بەپاروو بیخۆن ، نازانم وەستا عبدول چۆن چاوی لێبوو من دوو شفتەم کردبوە پارویەکەوە ووتی ئەرێوەڵا لەقافا گیرای کردی بەهەڵا و پێکەنین لێیکردم بەقوزەڵقورت لەقورگم گیرا خەریبوو بخنکێن ،نەیهێست بەدڵمەوە بنوسێ..

## ئێواریٚ چۆن کەوتینە کەمینەوە

هەتا نزیکی ئێواریٚ لەم دەوەنەداماینەوە چومە سەربەرزاییەك بەدووربین سەیری هەموو ناوچەکەم کرد دنیا کشوماتە هیچ دیار نیە هاتمەوە ووتم بابڕۆین نیوسەعات ڕۆژی مابوو من لەپێشەوە وەستا عبدوڵ، ئازاد لەدواوە بەماسافە دەڕۆشتین من گەیشتمەسەر چەمەکەی خوار گووندی ئاڵەسیاو لەداروشەخسەکەوە لە سەر گردە ڕەشەکانەوە بەتەقە دایانگرتینەوە، زۆر بەخەستی ، هەموو دەوروبەرم بەفیشەك بوو بەتەپوو تۆز ئەوەندە فریاکەوتم خۆمدا بەئەرزا باشبوو بەرنەکەوتم بە سنگە خشکیٚ خۆم گەیاندە بەردەم کۆستوو کەندەڵێنی چەمەکە ، دەستم کرد بەتەقە بەرگریەکی باشم کرد ، ئازاد * وەستا عبدول بۆ د واوە گەڕانەوە ئەوانیش شوێنی خۆیان گرتبوو تەقەیان دەکرد بەڵام دووربون لەمنەوە دابڕابوین لەیەك ، لەبەر تەقەی ئێمە چاوم لێیان بوو کەمینی یەکەمی داروو شەخسەکە هەڵکەندران ڕایان کرد گوێم لەدەنگیان بوو بە عەرەبی و بەکوردی قسەیان دەکرد دەیان گووت پێشیان لیٚ بگرن جوێنیان بەیەکتر دەدا دەیان گووت بۆ تەقەتان لێکردن دەبوایە بەدەست بتان گرتنایە بۆ ئەوەی پێشم لێنەگرن بە کوڕەکور بەچەمەکەدا تۆزیٚ قوڵبوو ئاو دایدڕیبوو ڕامکرد منیان نەبینی تەقە لەسەر برادەران بوو، خۆمگەیاندە لای دەستە کەمینەکە چەپی لەوێوە تەقەیەکی زۆرم لێکردن ووردە ووردە دنیا تاریکی کرد هیچ نەدەبینرا تەقەش نەما.وەك نیشانەی ڕزگار بوون یەك فیشەکی گڕدارم بەئاسماندا تەقان چاوم لێی بوو زۆر دوور یەك فیشەکی گڕدار کرا بەئاسماندا ووتم لەوانەبە ئازاد وەستا عبدوڵ بووبن ، لە ڕەبیەکانی سەرچادەی

قیری دوکانیان هەندێ تەقەش هەبوو ، ئەمچارەش دووبارە تەنیا کەوتمەوە بەڵام ئەمچارە نانو شفتەو خواردنی باشم پێیە تاقموو تفەنگ و فیشەکی باشم پێیە ترسم لەهیچ نەبوو، تەنها خەمی وەستا عبدول * ئازادم هەیە، خەمی سامانڵەمە شارەزاییەکەشی باش نەبوو بەتەنیا بێتەوە بکەوێتە کەمینەوە ڕزگار بونی زەحمەتە، چومە پشتی گووندی گورگەیەر دانیشتم دور بوو لەمنەوە لە چەمی بزەنیان بووبەتەقە نەمزانی چیبوو، من بەسەلامەتی گەیشتمەوە ماڵی ڕێویەکە لە بناری شاخی کەتوو کە ئێرە دوەم شوێنی یەکگرتنەوەمانە ، شەو تابایانی لەماڵی ڕێووی بەوریای خەوتم بەیانی ڕیوێکەم بینیەوە لەوناوەدا بوو ، بەڵام برادەران کەسیان دیار نەبوون کەسیان نەگەڕانەوە لەم شوێنە هەتا عەسر بەتەنهاچاوەڕوانیم کردن .

## چۆن مەفرەزەکەی کاکە (عەبەڕەق) م دۆزیەوە

دوای عەسر بە چەمی دۆڵەتوودا ڕۆشتمە خوارەوە لە پێچێکدا لەسەر ڕێگاکە شتێکی ڕەش دیار بوو بەدوربین زۆر سەیرم کرد نەدەجوڵاوە سەیری دەوروبەرم کرد هیچ دیار نەبوو تفەنگەکەم گرد بەدەستەوە بەوریای چومە سەر شتە ڕەشەکە سەیر دەکەم وەستا جمالە سورە خەوتووە هەڵمساند لەخوو ووتی کاکە عەبەشم لەگەڵە لەوپانایەدا دانیشتوون چوم بۆلایان کاکە عەبەڕەق و وەستا جمال وعوسمان سەڵاح بوون شادمان بووم کەلەم زۆر چۆڵەوانیەدا توشی ئەم برادەرانە بووم، باسکردن چۆن لە بۆم گوندی ئاڵەسیاو کەوتوینەتە کەمینەوە لەیەك دابڕاوین، کاکە عەبە ووتی ئێمەش پێریێ شەو لە سلێمانیەوە گەڕاینە ە، نەخۆشم تۆزی بۆیە لێر ماینەوە،بەپێکەوە دەڕۆین دەچین لەئەشکەوتەکانی زاخیێ (پایتەختی پارتیزانەکان) چاوەڕوانیان دەکەین هەتا نەیەنەوە ناڕۆین شوێنی یەکگرتنەوەی سێیەمان ئەشکەوتەکانی زاخیێ بوو .

## لە سەرچادەی

## گۆماوان کەمین هەبوو

تاریکوو ڕونی ئێواری لە چەمی تەنکەبوار پەڕینەوە من و کاکە عەبە لەپێشەوە دەڕۆشتین برادەران بەمەسافەیەکی کەم لەدوامانەوە بوون نزیك بوینەوە لە چادە قیرەکەی گۆماوان سەیرمان کرد لەپێشمان کەمین هەیە چاومان لێیان بوو خەریکی سەنگەر دروستکردن گوێمان لەدەنگیان بوو دەمان توانی دەستێکی باشیان لێبوەشێنین بەلاّم ڕێگەکەکەشف دەبوو ئەوەمان نەکرد بەشوێنی خۆماندا گەڕاینەوە ڕێگەکەمان گۆڕی بەلارێدا هاتینەوە گووندی چەمیاڵە بەئاسانی گەیشتینەوە پایتەخت ئەشکەوتەکانی زاخێ دوو شەوو دوو ڕۆژ ماینەوە هەتا ئازاد * وەستا عبدول هاتنەوە ..

## هاتنەوەی ئازاد * وەستا عبدول

بۆخەوتن دەچوینە ئەشکەوتەکانی زاخێ بەڕۆژ دەهاتینەسەرچەم و ئاوەکە دەچوینە بن بی و دارەکان هەتا نزیکی ئێوارێ، ئەشکەوتەکانی زاخێ دوو ئەشکەوتی گەورە بوو جێگەی 25 نەفەر دەبوەوە، بەلێژایەکەوە بوو بەردەمەکەی بە سورە چنار، دەوەنی گەورە گیرابوو لەدورەوە دیار نەبوو، کانیەکی بەهاراو لە تەنیشتی بوو، سەرماو بارەش لەپێشەوە دەیگرتەوە تەنها بۆ کاتی باران بارین باشبوو ، ڕۆژی دوەم ئێمە لە چەمەکەی خوار ئەشکەوتەکانەوە لەبن بیەکاندا دانیشتبووین نەفەرێك بانگیکردین دەنگیمان ناسی ئازاد وەستا عبدول بوون، هاتنە خوارەوە بۆلامان زۆر شادمان بووین بەهاتنەوەیان، ئەوانیش گێڕایانەوە کاتێ کەوتینە کەمینەکە ئێمەش زووهاتینە دەست تەقەی باشمان کرد هەتا تاریکی کرد بەرگریمان کرد، دوای بە دۆڵدا جوونەوە گوندی وەندەرێنە لەوێوە

هاتبونەوە بۆ زاخیٚ بەلاَم زۆر دورکەوتبوونەوە زۆر هیلاك بوبون ، پاش ئەو هەموو هیلاکیوو ماندو بونە وەستا عبدول هەواڵی شفتەکەی پرسی ووتی جمال شفتەت پێماوە یان هەمویت خواردووە. ئازاد گێڕایەوە ووتی دوای کەمینەکە و لەیك دابڕاینەکە، ڕۆژی دوای ئێمە تەنها نانمان پیبوو تەنها نانی وشکمان دەخوارد بێتاقەت، زۆر دڵگران بووم بۆ تۆ، نەمزن دەزانی کوژراوی یان دەرچویت، کاتەدا وەستا عبدول لەم پێدەکەنی ووتی هەموو شفتەکە بە جماله خۆمان لای بووین دوو دوو ئەیخستە ناونانەوە دەیخوارد ئێستا ئیمەی لەگەڵ نین وەلاَ چوار چوار یان بەڕوتی هەموو شتەکە دەخوا. ووتی توڕە بووم ئازاد ووتم وەستا عبدول خەمی جمالت نیە بەلاَم خەمی شفتەکەتە خوادەکات جمال سەلامەت دەبێت شفتەکەی عافێت بێت ، ئێوارێیٚ سێەم من و وەستا عبدول ئەشکەوتەکانی زاخێمان بەجێ هێشت گەڕاینەوە مەقەڕەکانی بلەکیٚ دوای دوو ڕۆژ ساماڵیش گەڕایەوە .

شاری ڕۆتەردام

٢٠١٣/٢/١٠



شەهید حسن عزیز وشەهید جمال عزیز

* سەرچاوە : کوردستان نێت

http://www.kurdistannet.biz/2013/index.php?option=com/content&view=article&id=333&Itemid=2.32.10.03.02.07&catid=242:2013.10.07.15.02.52:2013



## علی محمد چوارتایی

# گەڕانەوە بۆ شـــەکراو.

**گەڕانەوە بۆ ئامێزی چیا بۆناو ڕندوە بەفر و ڕۆژە تووش ونەهامەتیەکان .**

**بۆناو گەردەلوولی کزەی ڕەشەبا و هەورە ڕەشەکانی ئاسمانی بەرزی گمۆی مل سپی .**

**گەڕانەوە بۆ هەنکاوە بەستوەکان و دەستە تەزیوەکانی ناو تاشە بەفرەکانی هەزارکانی و**

**بۆ ماچی نێوان پێشمەرگە و دەنکە بەفرەعاشقەشێتەکانی شەکراو ..**

هاوڕێ(حەمەعەلی)یەکێکی ترلەپارتیزانەکانی دوای ئەنفال،لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا بۆی گێڕاوینەتەوە:

ـ لە 1991/2/24لەبارەگای بەتالیۆنی(6)لەچیوەڕۆی کوردستانی ڕۆژهەلات دەبن. لەگەڵ ئەوەی دەزانن کە هەموو ڕێگاو دۆڵەکان مین ڕێژ کراوون ...بەپەلە خۆیان کۆدەکەنەوە..دوای ئەوەی دنیا تاریك دەبێ..نانی ئیوارە دەخۆن و ڕیزدەبەستن و یەك لەدوای یەك شۆڕدەبنەوە بۆگوندی چۆمان،دوایی لەئاوەساردەکەی دەپەڕنەوە بۆسوورەدزێ ...بەفر و سەهۆڵاوی چیاکان..قاچیان سڕو جەستەیان دەتەزێنێ، پەنجەکانیان دەبن بەچلوورە وئازاردەگات بەڕوحیان.

بەوشەوەتاریکە،بەگردێکی بچووکداهەڵدەزنێن،تەنیاخۆیان وئەستێرەکانی ئاسمان.
یەك لەدوای یەك دەڕۆن،لەشاناخسێ دەگەنەماڵەکەی شەهید محمودی شاناخسێ،
کەخانوویەکی نەڕووخادەبێ. کۆلە پشتەکانیان دادەنێن و زۆپاکە گڕدەکەن...
دوای پشوودان وحەوانەوەی جەستە..لێی دەخەون،بۆ ڕۆژی دوایی خۆر لە لووتکەی گمۆوە تیشکە گەرمەکانی بەسەر زەویدا بڵاودەکاتەوە.. لەخەوی شیرین بەئاگا دێنەوە..نانێکی خۆش وبەتامی سپێدەی وڵات دەخۆن و دوایش بەباڵای گمۆی سەرسپیدا هەڵدەزنێن.کزەیەکی سارد لەلووتکەی گمۆوە دەست وسەروچاوو جەستەیان دەتەزێنێ،دوای ماندووبوونێکی زۆر دەگەنە بەرزاییەکانی سەری گمۆ.
دوای پشوویەك شۆڕدەبنەوە بۆدیوی(سەراو)..ئێوارەیەکی درەنگ دەگەنەلای هاوڕێکانیان لە(خدری ئاودەلان) کە بارەگای پارتیزانەکانی 37 شارباژێڕ بوو..
لەوێ بەپارتیزانی دەمێننەوە تا دەستپێکردنی ڕاپەڕین و بەشداری دەکەن لە رزگار کردنی سلێمانی..*

---

* ئەم وێنەیە.بەکامێرای کاك حەمە عەلی گیراوە..

ناسراوەکان :

1 ـ ئەوەی دواوە تفەنکەکەی بەدەستەوەیە جمال برای شەهید عومەرەسوورە .

2 / ئەوەی دواوە چلاك شەشۆی یە..

3 / ئەوەی تر لەتیف مام علی (سەراو) ....

# پارتیزانەكانی تیپی (71) ی بەتالیۆنی (7) ی سلێمانی

له مانگی ٥ / ١٩٩٠ ) تا ٥ / ٣ / ١٩٩١ )

## ناوی پارتیزانەكان و ژمارەی چەكەكانیان :

| | |
|---|---|
| ١ ـ سەید ئەحمەد حمه لاو | ١٧٩١٠٩ |
| ٢. فاروق عزیز قادر | ٢٦٦٤٢ |
| ٣ . گۆران بایز كریم | ٢٧١٧٦٨٥٤ |
| ٤ . عوسمان علی برایم | ٩٩٦٧٨٢ |
| ٥ . محمد علی مستەفا | ٠٦٢٠٦ |
| ٦. عادل محمد مستەفا | ٥٠٩٩ |
| ٧ . تەها معروف قادر | ٢٩٦٥٠ |
| ٨ . خالق علی معروف | ٢١٥٤٧ |
| ٩. مجید قادر عبدولا | ٢٩٠٧٩١٥ |
| ١٠. حسن عزیز عبدالرحمان | ٤١٣٥ |
| ١١. محمد علی امین | ٨٦٧٨ |
| ١٢. رحمان رسول محمد | ٢٢٤١ |
| ١٣. محمد رشید احمد | ٢٥٤٩٦٥ |
| ١٤. میران احمد كریم | ٩٧٩٣٢٢ |
| ١٥ . سەردار سعید حبیب | ٣١١١٨ |
| ١٦. تحسین عبدولا سعید | ٦٦٧٦٥ |
| ١٧. رزگار عبدولا قادر | ٣٥٥٩ |

| | |
|---|---|
| ١٨. رسول همزه احمد | ٦٦٨٨٩٣ |
| ١٩. جمال عزيز رسولّ | ٣٧٧٢٣ |
| ٢٠ . ملازم محمود عمر | ٤١٣٥ |
| ٢١ . عبدالرحمن عبدولاّ امين | ١٩٨٦٥ |
| ٢٢. اسكندر محمد على | ٦٦٤٢ |
| ٢٣. ازاد سعيد عبدولاّ | ٤٩٨٢٠ |
| ٢٤. كاوه على قادر | ٩٧٢٦٨٨ |
| ٢٥. لەتيف على سعيد | ٣٠٢٣٦٥ |
| ٢٦. دكتۆر موحسين | ١٠١٤٥ |
| ٢٧. على سعيد حسن | ٨٥٠٣٨١ |
| ٢٨. نامیق تۆفیق سعيد | ١٢١٢٩ |
| ٢٩. عارف محمد سعيد | ٥٩٠٠ |
| ٣٠. دەروێش عبدولاّ فرج | ٢٥٠١٦ |
| ٣١. انور احمد قادر | ٢٢٩٣١ |
| ٣٢. محمد اسماعيل قادر | ٤٠٢٠٥ |
| ٣٣. كامەران على امين | ١٦٩٨١ |
| ٣٤. خليل غريب سعيد | ٩٧٩٣٢٢ |
| ٣٥. ياسين عبدولاّ سعيد | ٣٤٣٢ |
| ٣٦. عزيز عبدولاّ سعيد | ٦١٠٩٢ |
| ٣٧. محمد حسن قادر | ٥٥٨٧ |
| ٣٨. على محمد على چوارتايى | ٥٠٩٩ |

# چەند لاپەڕیەك
# لە ڕۆژژمێری پارتیزانەکان

## تیپی 21ی کەرکوك وچالاکییەك

پاش نیوەڕۆی 17ی نیسانی 1988،پێشمەرگە قارەمانەکانی تیپی21ی کەرکوك لەناوچەی شوانەوە بەرێ دەکەون بۆ پشتەوەی پشتێنەی ئەمنی شاری کەرکوك و لەنێوان گوندی چیمەنی شەهیدان وشاری گرۆبلێسە لەپاڵ بازگەی کەرکوك و سلێمانی لەکاتژمێر 8،45 دەقیقەی شەودا کاروانێکی سەربازی کەبەرەوبەرەکانی ئەنفالی گەرمیان دەچوون دەخەنەبۆسەی خۆیانەوە،لەگەڵ ناڵەو شریخەی یەکەم (R.P.G)دا ئاگر بارانیان دەکەن..لەئەنجامدا زیاترلە(30) سەرباز دەکوژن.

پێشمەرگەکان بەبێ زیان وبەسەلامەتی بەم دەسکەوتانەوە دەگەڕێنەوە:

1. سێ جیهازی ڕاکاڵ بە(وحده تجهیزالقدره)وە
2. (12)کلاشینکۆف

## ـ لە ڕۆژی 1989/10/31

هێزێکی گەورەی ڕژێم کەبریتی دەبن لە سوپا و جاش ..هێرش دەهێننە سەر کوندە وێرانکراوەکانی بناری چیای (دێدەوان) و دەکەونە کێومالْکردنی هەموو گوندو هەردەکانی ناوچەکە هەر لە گوندی (سارتك)ەوە هەتا گوندەکانی حاجی وسوو و ئەشکەوت سەقا..

نزیکەی 15 پارتیزان لەو دەڤەرە بوون ، بەڵام دوژمن نەیتوانی بیاندۆزێتەوە، بەناچاری کشایەوە.

**- لە رۆژی 1989/1/18**

پارتیزانەکانی گەرمیان هێرشیان کردەسەر سەنگەرەکانی رژێم لە دەرەی نەوتەکەو پەڵکانە دوژمن زیانی نەزانرا،پارتیزانەکان بەسەلامەتی گەڕانەوە شوێنەکانیان.

**- لە رۆژی 1989/1/19**

پارتیزانەکانی گەرمیان هێرشیان کردە سەرسەنگەرەکانی رژێم لە نزیك گوندی کاولکراوی (هەزارکانی)لەئەنجامدا(5) جاش کوژران، پارتیزانەکان بەسەلامەتی گەڕانەوە شوێنەکانیان.

**- لە رۆژی 1989/1/19**

مینێکی پارتیزانەکان لەنێوان گوندی (شەدەڵە) وسەر رێگای(دارئەسحابە)دا بە ئۆتۆمبێلێکی سەربازیدا دەتەقێتەوە. لەئەنجامدا ئەفسەرێك وسەربازێك دەکوژرێن.

**- لە رۆژی 1989/1/19**

دەستەیەك لە پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش لە ناو کەلاوەکانی سورداش بۆسەیەك دەنێنەوە،دوای گەیشتنی سەیارەیەکی سەربازی،دە دەنە بەر دەستڕێژی گولە و چەندسەربازێك دەکوژن،هێزێکی تری رژێم دێت بەهاواریانەوە ، شەڕ تا کاتژمێر 5 ی ئێوارە درێژەی دەبێت..

**- لەشەوی 30ـ1989/1/31**

پارتیزانەکانی دەشتی هەولێر هێرشیان کردەسەر مۆڵگەیەکی رژێم لەنزیك (بەلەبان)و کۆنترۆلیان کرد.

**- لە رۆژی 1989/1/19**

پارتیزانەکان پێشتر مینێکیان لەنێوان گونکانی (شەدەڵە)و(هۆمەرقەوم) دانابووەوە، لەئەنجامدا لەژێر ئۆتۆمبێلێکی سەربازیدا تەقییەوەو بووە هۆی کوژرانی 3 سەرباز.

**- لە رۆژی 1989/1/20**

پارتیزانەکانی گەرمیان لەنزیك گوندی ویرانەی (ژاڵەی رەبات)هێرشیانکردەسەر مۆڵگەیەك و2جاشیان کوشت.

**- لە رۆژی 1989/1/20**

. پارتیزانەکانی گەرمیان لەنزیك(خورماتوو)هێرشیان کردە سەرمۆڵگەیەکی دوژمن.

. لە1/2/ 1989 پێشمەرگە قارەمانەکانی ڕەتڵی سورداش (پارتیزانەکان)

لە شەڕێکی دەستەو یەخەدا لە بەرگەڵوو ڕەبیەی ناو پردانیان گرت.

. لە 1989/2/2 پارتیزانەکانی هولێر لە گوندی

(ڕەزگەو سەرکەند) پەلاماری چەند جاشێکیان داو تا ناو شەقڵاوا ڕاویان نان و

سێ کەلاکیان لێ بەجێ هێشتن .

. لە 24/2/ 1990 شاڵاوی دوژمن و کێومالٚ کردنی ناوچەی سورداش و

گەڕان بەدوای پارتیزانەکانی(ی.ن.ك)ڕستی سورداش.

. لە 25/2/ 1989 هێرشی گەورەی دوژمن بۆ دۆڵی جافایەتی و

گەڕان بەدوای پارتیزانەکانی ڕستی سورداش .

. لە27/2/ 1989 پارتیزانەکانی هەولێرهەڵمەتیان بردە سەر جاشەکانی دارەتوو،

لە پاش شەڕێکی دەستەو یەخە 2جاش کوژران و 5ی تریش برینداربوون.

* لە 19/3/ 1989 تەقینەوەی مینی چێنراوی پارتیزانەکانی سورداش

لەسەر جادەی شەدەڵە . هۆمەرقەوم و کوژرانی(3) کەس.

*لە 20/3/ 1989 پارتیزانەکانی گەرمیان و کوشتنی

(2) جاش لە نزیك ژاڵەی رەبات و هەمان ڕۆژ هێرشیان کردە سەر

ڕەبایەیەکی دوژمن لە دوزخورماتوو

**ـ لە رۆژی 1989/3/4**

هێزێکی رژێم چواردەوری کۆمەڵگای (پیرەمەگرون) یان گرت،کەوتنە پشکنینی بەمەبەستی دۆزینەوە و دەسگیرکردنی پارتیزانەکان و هاوکارەکانیان، بەڵام کەسیان نەدۆزییەوە..

**ـ لە رۆژی 1989/4/12**

هێزەکانی رژێم هێرشێکی بەربڵاویان لە دەقۆڵەوە کردە سەر دۆڵی جافایەتی بەمەبەستی کێومالْکردن و دۆزینەوەی پارتیزانەکان،بەڵام لەئەنجامدا بە نائومێدی کشانەوە..

**ـ لە رۆژی 1989/4/24**

بەگومانی ئەوەی ئەومزگەوت ومەرقدی چاك وپیرانەی کوردستان کەلەئەنفالدا هێشتا نەرووخێندرابون،رەنگە پارتیزانەکان بتوانن خۆیان تێیاندا حەشاربدەن و بحەسێنەوە، هەرهەموویان یا بە شۆفەڵ روخاند، یا بە(TNT) تەقاندەوە..

**ـ لە رۆژی 1989/5/7**

کۆمەڵەجاشێك بەمەبەستی شرەخۆری دەچنە گوندی(خاڵەبەگ) لەکاتی گەڕانەوەدا دەکەونە بۆسەی پارتیزانەکانەوە دوای ئەوەی خۆیان بەدەستەوەنادەن، تەقەیان لێ دەکرێ، لەئەنجامدا دووجاش دەکوژرێن.

**ـ لە رۆژی 1989/5/20**

پارتیزانەکانی رەتڵی سورداش هێرشیان کردەسەرمۆڵگەیەکی دوژمن لەدەربەندی (هەڵەدن).

. لە 1989/7/5 گەڕانەوەی پۆلێ پێشمەرگەی پارتیزان

بۆ باڵەکایەتی وخۆشناوەتی بە فەرماندەیی جەلال حاجی.

## - لە ڕۆژی 1989/7/10

دە هاوولاتی لەوکەسانەی دوای ئەنفالەکان دەسگیرکرابوون، لەمەیدانی تیربارانی (قیادەی جیشی شعبی)نزیك عینکاوەی هەولێر بەبەر چاوی سەدان سەربازی کوردەوە گولەباران کران

. لەئێوارەی1989/8/20.19شەهیدبوونی دکتۆرئازاداحمد حمەصالح ناسراوەبە (دکتور هێمن) و پزیشککار فەرەیدون حەمە امین لە نزیك گوندی داوداوا.

* لە1988/9/13تیپی 21و87)هێرشێکی بەربلاوی دوژمنیان بۆ سنوری(شێخ بزەینی خواروو) تێکشکاند،شەڕەکە (7)سەعاتی خایاند.

## - لە ڕۆژی 1990/4/15

هێزێکی گەورەی ڕژێد کەوتنە کێومالٚکردنی (پشدەرەڕەقە) لەئەنجامدا (3) هاوولاتی شەهیدبوون و چەند هاوولاتیش بەدیلگیران.

## - لە ڕۆژی 1990/5/1

چەند هەلیکۆپتەرێکی سەربەرژێم لە ناوچەی (شارباژێڕ) کەوتنە گەڕان بۆ دۆزینەوەی پارتیزانەکانی(ی.ن.ك)دا لە نزیك کەلاوەکانی گوندی (وێڵەیەر) تەقەیان لەچوار هاوولاتی کرد،لەئەنجامدا یەکێکیان شەهید بوو..

. لە 1990/5/3 تەقینەوەی مینی پارتیزانەکانی سورداش لەژێر ئوتۆمبیلێکی سەربازی لە کۆتەڵی مالومە

# پیرۆزبایی ئەنفالچی یەکان

لە دوای پرۆسەکانی ئەنفال ئەوئەنفالچی یەکوردانەی چاوساغی سوپای تالآنیان کردبوو بۆسەرمیللەت ونشتیمانی خۆیان ،هێندە کەسایەتییان پووخابوو،بڕویان بەهەڵسانەوەی شۆڕش وگەل نەمابوو، هەر بۆیەهەمیشە نۆبە بڕەیان دەکرد لەچاوپێکەتنی دەزگاکانی راگەیاندن و ناردنی پیرۆزبایی بۆسەرانی تاوان...

لە دوای ئەنفالی سێی گەرمیان لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەی(هاوکاری) دا لەگەڵ (تحسین شاویس سعید) موستەشاری فەوجی(172)بەمشێوەیە نووسراوە:

(فەوجەکەمان لەلایەن سەرکردایەتی یەوە 15نیشانەی ئازایەتی پێ بەخشراوە.. شانبەشانی هێزە چەکدارەکان رژێم بەشداری کردووە لەنێوفەیلەقی یەك وهەروەها بەشداری کردووە لەکارەکانی ئەنفالی یەکەم ودووهەم وسێیەمدا،هەروەها داگیرکردنی بەرزاییەکانی(1050)لەکەرتی هەنجیرەو (1710) لەسەگرمەوقەرەداغ لەم دیدارەدا بەشانازییەوە باس لەکۆمەڵێك داستانی دیکە بۆڕاونانی ویرانکاران لەناوچەی قەرەداغ وسەنگاو وتەوێڵە وحاجی ئۆمەران وگردەمەند(ئەوشەرەی کەشەهید سعیدتۆماری تیداشەهید بوو. نووسەر)

لە ساڵانی1983.1982 دەکات وهەروەها (پاکژکردنەوەی کەرتەکانی جەباری وقەرەحەسەن لەکارەکانی ئەنفالی سێیدا..)

هەرلەهەمان رۆژنامەدا لەچاوپێکەوتنێکدا بەشانازی یەوەدەڵێ:

(ئێمەزۆرخۆشحاڵ ودڵ شادین لەگێڕانەوەی خاکی داگیرکراومان بۆ کۆشی دایکی نیشتمان بەم بۆنەیەوە ئەوپەڕی پیرۆزبایی بەرزدەکەمەوە بۆ سەرۆکی فەرماندە صدام حسین وسەربازە دلێرەکانی دووەم قادصیەی صدام).

* رۆژنامەی(هاوکاری) ژمارە 998، 15 /1988/8

# بەشی چوارەم

## ئەلبومی
## پارتیزانەکانی گەرمیان



وێنەی پارتیزان کاک رەشید عەلی




## پارتیزانەکانی گەرمیان

## دڕیان بە تاریکستانی نائومێدی دا.

ڕستی گەرمیانی پێشمەرگە پارتیزانەکانی (ی.ن.ک)کەپاش ئەنفال لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان درێژەیان بەخەباتدا بەشێوەی پارتیزانی.

سەرەتای مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٠ مقداد – مەحمود سەنگاوی – دکتۆر هاوڕێ – ماجد فەیلی – سوهاد خانەقینی – حەمەپارێوڵەیی – شەماڵ(تەڵعەت) – کوردۆ قاسم – حەمەچاوجوان – ئازاد قەڵەوسی – شەهید ئاخە (بەپێوە) – هەژار (بەپێوە



**جەمال مەلاهۆمەری و جەلیل کۆکزی ساڵی 1989**

**نێوان قوروچای و بەلەکەی خواروو**

**سلام زبنانەیی، بهادین داربەروو، حەمە ناخە، هەزار کەرکوکی، سەید بابا، جلال قولیجانی**

**پارتیزانەکانی گەرمییان**





**پارتیزانەکانی گەرمیان**
**کاتی گەڕانەوەیان بۆ گەرمیان**
**گوندی پرێلەی گەورە**

**لای چەپەوە : جلال قولیجانی ـ شەهید سەرحەد دۆلانی ـ شەهید نەجات گەڕەچیا ـ شەهید احمد حاجی ڕەشید ـ شەهید حەمە رەش ـ جەلال شەمەیی عەدالەت ڕەفعەت ـ سلاح کوێخا ـ شەهید علی فقی مستەفایی ـ شەهید مستەفا ـ شەهید سەید بابا**



**لای ڕاستەوە: شەهید عەلی سووری زەماوەنگە ـ شەهید خەلیل بیکەیسی**






جەلال قولیجانی . شەهیدسەیدبابا . شەهیدحەمەئاخە

. شەهیدبەرزان . هەژارکەرکوکی . شەهیدسەیدجەوهەر.



پارتیزانەکانی گەرمیان
علی غائب - قاتەکانی کفری ١٩٨٩/٩/١٧



پارتیزانەکانی گەرمیان
حەسەن ئومەرملی - حەمە چاوجوان - حەمە سۆران -١٩٨٩



هەردوو گۆلان ماوەت-کفری / 1989/9/17
لەراستەوە/ حمە رەشید ئیوللی- شەهاب ئاغاقینی- جمال شێخ حەمیدی- شەهید کامران
«گەرمیان»



پارتیزانەکانی گەرمیان مانگی ١٩٨٨/١٢
دانیشتوو/ مەریوان حاجی حسێن- شەهید کامرانە رەش- شکور قەرەبلاغ
وەستاوەکان/ مەلا رحیم احمد حاجی رەشید- مەلا سعید- حسن هۆمەرەلی



پارتی زانیەكانی گەرمیان 1989
شەهید حمە رەش- شەهید حمە ئاغا -محمود سەنگاوی -كریم





1989 پارتی زانیەکانی گەرمیان
حمە چاوجوان - شهاب خانەقینی و کۆمەڵێک پێشمەرگە



گەرمیان/ 1989
لە چەپەوە/ مەلا سعید- د حمید- هەڵۆ پێنجوێنی- محمد مەسۆیی
{ رەشێ پارتی زانەکانی گەرمیان }



هاوری حزبی دەعوە.حسن شیخ لەتکەری.محموحسە تکاوی.حزبی دەعوە.حزبی دەعوە.کوردوقاسم
نزیك کفری　　۱۳/۹/۱۹۸۹



بارەگای پارتیزانەکانی ڕەتڵی سورداش لەشاخی پیرەمەگرون　　۱۹۸۹



1989 **پاریولە**

حەمە پاریوڵە - سامی ئاسایش - جەبار - شەهید فازڵ -شریف



**سەید جەوهەر لەژێر ئەشکەوتێکدا کۆڵەپشتی چاك دەکات**



کونەکەمتیار-چەمی تلیشان/ 1990
حسن حمید- دکتۆر ئاتیلا- مەلا سعید
«گەرمیان»



شەهید محمود مامە عەزە



حمه ئاخه و محمد چەوری





جمال شیخ حمیدی -ئەوشیروان ئەحمد -شەهیدکامەران
شەهید مەجید دووزی -شەهید رەمەزان کوڵە جۆیی -شەهید علی فەقێ مستفی



کفری/ 1989/9/17
لەراستەوە/ حمە رشید توکنی -حسن حاجی ابراهیم- جمال شێخ حمید -ئەوڕاد کریم فارس-
عثمان مەلا جمیل- شەهید حمە ئاغا- محمود سەنگاوی -دکتۆر هاوری- گورز قاسم-
مامۆستا حسێن- عثمان حاجی محمود- علی غایب
﴿ ڕەتڵی پارتیزانەکانی گەرمیان ﴾



پارتی زانەکانی پاش ئەنفال
عوسمان حاجی محمود ـ شوکرفە روبلاغی



پشتی پارزیولە/ 1989/9/21
د پارزیولە - عثمان حاجی محمود - علی غایب- محمد سوران-
کریم- نوزاد کریم- شەهید مجید- مکرم- شەهید محمد قادر
حسین- حسن حمید- شەهید احمد زەرداوی- محمد رشید توکنی
* گەرمیان *






وێنەیەکی دەگمەنی ( شەهید مەلا ئەحمەد کەلاری)





**مەفرەزەیەك لە پارتیزانەکانی شارەزوور**

**شەهیدمەهدی، شەهید قادر كۆكۆیی،**

**شەهیدعبدولكریم، هادی عەبدولا**




**پارتیزانی دوای ئەنفال شەهید سەید موحەمەد**

فەرماندەپارتیزانەکەی گەرمیان

شەهید سید محمد بەپیلانێکی ناحەزانەو دوژمن کارانە

کێشایە ناوکەلارو رادەستی ئیستخباراتی بەعسیان کرد

چەن رۆژێك پێش راپەرینی 1991 لەسێدارە درا.



شەهید سەید جەوهەر



شەهید سەدیق عبدولکەریم (سەدیقی حەیات)
پێش ڕاپەڕین لە قەرەداغ شەهید بوو



پارتی زانی ناوچەی زەنگنە
١٩٩٠




شێخ کریم شەهید برهان شەهید یاسین شەهید سید جوهەر



وێنەکە: کوردۆ قاسم و شەهید حەمە ڕەش (گەرمیان 1989)

جگەرەو چای شیرین دوو هاوڕێی پارتیزانەکانی سەردەمی پاش ئەنفالەکانن



# گوندی پاریۆڵای گەورە

## کۆمەڵێك لە پارتیزانەکانی گەرمیان

## کاتی گەڕانەوەیان لە ئێرانەوە ..

ئەوانەی ناسراونەتنەوە

شەهید سەرحەددۆڵانی ،شەهید نەجات گەرەچیا ،

شەهید احمد حاجی ڕەشید، شەهید حەمەرەش ،

جەلال شەمەیی ، عەدالەت ڕەفعەت، سڵاح کوێخا ،

شەهید خەبات سوور، شەهیدفازڵ،

شەهیدعلی فەقێ مستەفا، شەهید سەیدبابا



قەرەنی/ 1990
نەوشیروان- مەلا سعید- رەئیس- کاک عوسمان- شەهید دکتۆر ئاتیلا
(گەرمیان)



1990 گەرمیان
حسن حمید-شەهید مجید دوزی-حەماسوران-حمە رشید



چەمی ئۆمەرێل-کفری/ مانگی 10/1988
صباح شێخ حمیدی- حمە رەشید تۆکنی- حسن ئۆمەریلی
* ڕەنگی پارتیزانەکانی گەرمیان*

سامی ئەسایش - لەوێند - عەمتاز حەمە مینا - شەهید تۆراب





پارتیزانەکان لەگوندێکی وێرانە لەکاتی چێشت لێناندا



پارتیزانەکان لە ژێرکەپکەشاخێك.. لەکاتی نان کردندا



محمود سنکاوی و شەهید حمەڕەش و عوسمانی حاجی محمود



جەلال شیخ کریم ،انور دەروپانی،

ئاوت شێخ جناب، جلال شەمەیی



پارتیزانی دوای ئەنفال ...

. شەهید جەمال سوور. شکور قەرەبلاخی

. شەهید ئەحمەدی حاجی رەشید



مانگی2ی ساڵی1991قەرەداخ . کانی رۆشنایی.

جلال شێخ کەریم شەهید سەرحەد دۆڵانی

بە پارتیزانی لە شاخەکانی قەرەداخ



نازم وستا شریف





هەڤاڵ عوسمان حاجی مەحموود    نازم وەستا شەریف



پارتی زانیەکانی گەرمیان 1989
شەهید حمە رەش- شەهید حمە ئاغا -محمود سەنگاوی -کریم



میقداد داربەڕوو ،مەحموودسەنگاوی،

عوسمانی حاجی مەحموود و دووپارتیزان



له‌ باره‌گاكانی (بله‌كێ) وه‌ به‌ره‌و وڵات

15 / 9 / 1990

## ئه‌لبوومی چه‌جد پارتیزانێكی شارباژێر



مسعود شارستێنی . بکرشارستێنی .

خاڵەسەراوی . احمدئاوەژێ . کریم شارستێنی



مستەفاچالاوی . شەهید تاریق گۆگجەیی . رفعت عبدالله . دز محسن

دانیشتووەکە : گۆران سەراوی



شەهید مولازم محمود . خوالێخۆشبوو

اسکندر ماوەتی . سەید احمد ماوەتی



وەستا فاروق . شەهیدفایق ئالەکی . هێمن بچکۆل گردگاشە



سەرگۆڕی شەهید ئازاد مارەرەشی

وەستاوەکان : تەها ماوەتی ـ یاسین شاناخسێ

دانیشتوو : خالق ماوەتی



سەرگۆڕی شەهید علی چوارتایی

یاسین شاناخسێ ـ خاڵەسەراوی



خاڵە سەروی . یاسین شاناخسێ



خاڵەسەراوی . عبدالرحمن شاناخسێ

خاڵە سەراوی جلی سەربازی پۆشیوە بۆ چالاکی پارتیزانی





عادل سەراوی

گۆران بایز( گۆران سەراوی )



خالق ماوەتی . شەهیدکاوە ماوەتی . حسن ماوەتی شەهیدعبدالرحمن ماوەتی

دوای گەڕانەوە لە ڕاوەبەراز / ئامادەکردنی گۆشتی بەراز بۆ قاورمە



ئازاد حاجی سەعید سەراوی



شەهید مجید ماوەتی



شەهید عبدالرحمن شاناخسێ . خالق ماوەتی .

تەها ماوەتی . شەهید جمال عزیز



نامیق نورکی



شەهید عەلی سۆفی شاناخسێ



سەردانی پارتیزانەکانی شاربازێڕ بۆ لای نووسەر

خاڵەسەراوی . نوسەر. گۆران سەراوی .

ئەیوب شوانی . گۆران . ئازادسەراوی

کەرکوک 13 . 1 . 2017

## نووسەرلە چەند دێڕێکدا:

* ابوبکرمحمدحاجی1953/ بیره سپان/ پردێ / کەرکوك

* بەشداری (شۆڕشی ئەیلول)ی کردوه.

* لە (1975) ەوه کادر ی (ی.ن.ك)بووه.

* لەساڵی 1981 بووه بەپێشمەرگەی شۆڕشی نوێ.

* ئەندامی یەکەمین پەرلەمانی کوردستان بووه.

* ئەند امی هەرچوار کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووه .

* ئەندامی ئەنجومەنی ناوەندی (ی.ن.ك) بووه

* ئەندامی (یەکێتی نووسەرانی کورد) ە .

* دەستەی دامەزرێنەرو لێپرسراوی بەشی ئەدەبی (کۆڕی رۆشنبیری لاوانی کورد) بووه لە(نەغەدە).

* ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (کرمانج) بووه .

* لە دامەزرێنەرانی( بنکەی رووناکبیری شەهید) و بەرێوەبەری نوسینی گۆڤاری (شەهید)ە.

* یەکەم سەرنوسەری گۆڤاری (کەرکوك) بووه .

* سکرتێری رۆشنبیری (کۆمەڵەی روناکبیری کەرکوك) بووه .

* ئەندامی ( سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ) ە

*خەڵاتی رێزوپێزانینی یەکیتی بە واژۆی مام جەلال وەرگرتووه کەبەچەك وقەڵەم بەشداری شۆڕشی گەلی کوردستانی کردووه.

*چوارساڵ نوێنەری (هەڤاڵ مام جەلال) بووه لە کەرکوك .

* بەرپرسی لقی کەرکوکی(یەکێتیی پەرلەمانتارانی کوردستان) ە

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نووسەر

| | | |
|---|---|---|
| 1. دا ستانی ئاوارە یی (شعر) | | 1989 |
| 2. هۆرەی چیا (شیعر) | | 1991 |
| 3. سوتەن (دەربارەی ماق مرۆڤ) | | 1992 |
| 4. ئەنفال و شۆڕەبی (شیعر | | 1998 |
| 5. شیوەنێك بۆرەندی خان شیعر) | | 1999 |
| 6. ئەنفالی خاڵخالان | | 2000 |
| 7. ڕاپەڕین ورزگارکردنی کەرکوك | چاپی یەکەم | 2000 |
| 8 . فیدرالی لەنێوان لکاندن وجیابوونەوەدا | | 2001 |
| 9 . انفال خالخالان | چاپی عەرەبی | 2006 |
| Anfal.of.Khalkhalan .10 | چاپی ئینگلیزی | 2006 |
| 11. ئەنفالی ڕەش | | 2007 |
| 12 . دڵسۆزی کەرکوك | | 2007 |
| 13 . دیوانی شاخی | | 2009 |
| 14. ئەنفالی چوار لەدادگای باڵای تاوانەکان.. | | 2010 |
| 15. ڕاپەڕین و رزگاری کەرکوك | چاپی دووەم | 2012 |
| 16 . پارتیزانەکانی دوای ئەنفال | چاپی یەکەم | 2012 |
| 17 . کەشکۆڵی شاخی | چاپی یەکەم | 2012 |
| 18. مانگ و خۆر و حەوتەوانە | چاپی یەکەم | 2017 |
| 19 . جوامێری | چاپی یەکەم | 2019 |
| 20 . گریانی شەو | شیعر | 2020 |

## سەرچاوەکان

- کوردستانی نوێ / ژ /2725 /2002/4/10
- بڵاوکراوە مۆردانە 2005/5/5/ ژ تایبەت /کۆڕی ماتە مینی
- ئەنفالی رەش گۆڕەبەکۆمەڵەکان/ مەلاشاخی
- رەشەبای ژەهرونەنفال/عەبدولاکەریم مەحمود/چاپی یەکەم
- هاورێنامە بۆ مێژووی کوردستان و کورد / هاورێ باخەوان
- چەند د ە ست نووسێکی / عوسمانی حاجی مەحمود
- بیرەوەرییەکانی سەنگاوی/ مەحمود سەنگاوی
- رۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە (998) 15 /1988/8
- بیرەوەری پارتیزانی/ ابووزیدصالح / پارتیزانی سنووری کۆیە
- گۆڤاری رێبەری پشمەرگە
- فەیسبووکی کاك مەحموود سەنگاوی
- پارتیزان کێیە ؟ نووسینی چێ گیڤارا / هیوا ئەمانی
- قەندیل بەغدای هەژاند/شەهید رێباز/ئاوێر /هەولیر 2017
- حەمەرەش گەرمیانییەکی گرگرتوو. ئەمیرە محەمەد . 2018
- پارتیزای مەرگ وژیانەوە / عوسمان سێدەری 2013
- ناوندی توێژینەوەی ئێرنێستۆ چێ گوارا
- ئەنفالی خاڵخاڵان / چاپی دووەم

## سوپاس و پێزانین

زۆرسوپاسی وپێزانینی خۆم بەم بەڕێزانە ڕادەگەیەنم

کە کەم وزۆربە بەڵگەنامە و پێدانی زانیاری پشتیوانییان کردووم:

1. کاک عوسمانی حاجی مەحموود

2. کاک مەحموودسەنگاوی

3. مامۆستا کاکەرەش

4. کاک شێخ کریم

5. کاک ستارسەنگاوی

5. کاک محمد رئوف مجید

7. کاک جەلال مەسۆیی

8 . کاک علی رشید گەرمیان

9 . خاڵەسەراوی و پارتزانەکانی شارباژێڕ

10 . چەند هاوکارێکی پارتیزانەکان

لەبەر زۆرییان ناتوانم ناوی هەموویان بهێنم داکارم بمبوورن.

نووسەر

## The partisans after Anfal

In 1988 ، after the Iraqi government used chemical weapons and in 8 stages،razed 450 villages and deported 182،000 Kurdish women، children and youth to the southern plains of Iraq and murdered them en masse ، Kurdistan's peshmerga and especially the courageous fighters of the PUK abandoned conventional in favour of partisan warfare tactics. This book (the post Anfal partisans، authored by Abubakir Mohamed Haji aka Mala Shakhi) speaks of that phase in the struggle of an occupied ،divided and ravaged country called Kurdistan .

# The partisans after Anfal

حرب العصابات بعد الانفال

ملاشاخی

Mala shakhi



In 1988, after the Iraqi government used chemical weapons and in 8 stages, razed 450 villages and deported 182,000 Kurdish women, children and youth to the southern plains of Iraq and murdered them en masse, Kurdistan's peshmerga and especially the courageous fighters of the PUK abandoned conventional in favour of partisan warfare tactics. This book (the post-Anfal partisans, authored by Abubakir Mohamed Haji aka Mala Shakhi) speaks of that phase in the struggle of an occupied, divided and ravaged country called Kurdistan



1st edition

2020